# خاڵ

گۆڤارێکی هزریی ڕۆشنبیرییە
دوومانگ جارێک دەردەچێت
ژمارە (١٨) ئابی
٢٠١٨


**ئەم ژمارەیە بە سپۆنسەری سەنتەری زەهاوی**
**بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی چاپکراوە**



**خاوەنی ئیمتیاز و سەرنووسەر**
**تۆفیق کەریم**
**٠٧٥١١٤١٢٥٤٣ - ٠٧٧٠٠٦٣٧٦٦٤**
**tofeqkarem@yahoo.com**





**سایتی گۆڤاری خاڵ: www.xalkurd.com**

**تیراژ: ١٥٠٠**
**نرخ: ١٥٠٠ دینار**



# لەم ژمارەیەدا

## دیـموکراسیەت دەردە یا دەرمان





# سەروتار

کە ئەم ژمارەیەی (خاڵ) بڵاودەبێتەوە، سێ ساڵ بەسەر دەرچوونی یەکەم ژمارەیدا تێدەپەڕێت، لە سەرەتا باری خۆمان قورس نەکرد، ستافێکی کەم، بودجەیەکی خاکەرا، بێبارەگا، بێ کەرەسە و کەلوپەل، لە دۆخێکی پڕ لە قەیراندا، دەستمانپێکرد، ئێستاش کە هەنگاو دەخەینە ساڵی چوارهەممانەوە، هیچ لە بابەتەکان زیادیان نەکردوە، ئەگەر کورتیان هەڵنەهێنابێت، بەڵام ئەو کات و ئێستاش باوەڕبوونمان بە کارەکەمان و خۆشەویستی و ڕێزی نێوانمان بەردەوامی پێبەخشیوین، ڕاستە لە کەلوپەل و بارەگا و بابەتە رووکەشیەکاندا هەروەک سەرەتاین، بەڵام ئەمڕۆ (خاڵ) گەورە بووە و باڵای بوەتە چناری سەرکانی سەرکەشە و پەلوپۆی باشی هاویشتووە.

- ستافێکی تۆکمە و کارا کە خۆبەخشانە سێ ساڵە وزەو مەعریفەت دەبەخشن بە (خاڵ)، بە پشتبەستن بە ستافێکی بەئەزموون و ڕۆشنبیری باڵا وەک دەستەی ڕاوێژکار کە دەنگورەنگیان هێزێکی مەعنەوی و بەرجەستە بوو بۆ متمانەپێدانی (خاڵ).

- گۆڤارەکە بوەتە سەکۆیەک بۆ کۆبونەوەی سەدان قەڵەمی بە بڕشت کە بابەت و توێژینەوەکانیان ئەو سەکۆیەی دەوڵەمەند و ڕەنگین کردوە.

- هەرچەند لە ڕووی ئابوورییەوە بە ترسەوە هەنگاومانا، بەڵام تا ئێستاش ئەو کەسایەتی و دەزگا و سەنتەرانەی کۆمەکی مادیانکردین نەیانهێشت گوڵی سەوزی (خاڵ) زەرد بێت.

- بە سەدان خوێنەری گۆڤارەکە بە پەرۆشەوە چاوەڕوانی دەرچوونی ژمارە نوێیەکان دەکەن و دەستخۆشیش لە ژمارەکانی رابردوو دەکەن.

- بە تەنیشت دەرکردنی گۆڤاری خاڵەوە (٢١) کتێبی جۆراوجۆرمان وەک بڵاوکراوەی خاڵ بەچاپگەیاندوە، ئەم کارە خاکەڕاییەش سەروەتێکی مەعریفی

باشە بۆ کتێبخانەی کوردی و رۆشنبیری و خوێنەرانی بەڕێزیش.

ـ هەر لەگەڵ دەرکردنی یەکەم ژمارەشیدا سایت و پەیجی ئەلیکترۆنی (خاڵ) دەستبەرکاربووە و هەزاران خوێنەری هەیە و بەردەوامیش لە زیادبوندان.

ـئەو تەوەرانەش لە دووتوێی ژمارەکانیدا هەڵبژێرراون بەشێوەیەک سەرنجڕاکێشبون، کە لەسەر داخوازی خوێنەرانیان بڕیارماندا پاش پوختکردنیان بە سەربەخۆیی چاپیان بکەینەوە لە دووتویی کتێبدا، کە تا ئێستا دوو تەوەرەیانمان بڵاوکردوەتەوە.

کەواتە مافی خۆمانە شانازی بەو سێ ساڵەی تەمەنمانەوە بکەین، شانازی بە دەرکردنی (١٨) ژمارەی (خاڵ)، بە دەستەی بەڕێوەبردن و راوێژکاری، بە سەدان نووسەر و خوێنەر، بەو کەسایەتی و دەزگایانەی پشتیوانی مادیان بوو لە هەمانکاتیشدا کە شانازییان پێوە دەکەین، ئەرکی سەرشانیشمانە بە گەرمی سوپاستان بکەین و دەستی ماندووبوونیان بگوشین.

بە دڵنیاییەوە بە هەموومانەوە (خاڵ)مان گەیاندووەتە ئێرە، هیوادارین هەر بەو هەناسەشەوە بەرەو ئایندەیەکی گەشتری ببەین، بۆ ئەو مەبەستەش پلان و بەرنامەمان هەیە کە خوا یاربێت بە کردەیی دەیهێنینە دی، (خاڵ) دەوڵەمەندتر و فراوانتر دەکەین، بەڵام بۆ هەر هەنگاوێک دەبێت پێشەکی شوێن پێی خۆمان قایم بکەین.

لەم پرۆژەشماندا منەت بەسەر کەسدا ناکەین و گلەیی و گازندەش دەرنابڕین، بەڵکو بەجێگەیاندنی ئەرکێکی سەرشانمانی دەزانین، پێمانوایە هەموو مەعریفە دۆستێک دەبێت ئەم خەمخۆریەی هەیە.



# ڕامانێک لە
# سێسەد و سێ خاڵی
# خەرمانەی سێ ساڵەی




کۆسرەت ساڵح ئەحمەد
توێژەر و مامۆستا لە زانکۆی سەلاحەددین - هەولێر

لە تەشرینی یەکەمی ٢٠١٥ بە دروشمی «رەسەنایەتی، خۆماڵی، نوێگەری» کاروانی خاڵ دەستپێدەکات، تا ئێستاش بەردەوامە و بەرەو داهاتوو بەدەم خاڵ دانانەوە هەنگاو دەنێت.

ناوەندی رۆشنبیری خاڵ لە پێناو چوار ئامانجی سەرەکی دامەزراوە، بەدەم رێگاوە خەریکی خاڵ دانانە لەسەر پرسە هزرییە هەنوکەیی و گەرمەکان، لە ژێر رۆشنایی پێداویستی و خواستەکانی کۆمەڵگەی کوردستانی. خاوەنی ئەم خاڵانەش بریتین لە کەسانی بژاردە و خاوەن ئاراستەی هزری جیاواز، بەمەش گۆڤاری خاڵ دەکرێت وەک سەکۆیەک بۆ خستنە رووی دیدە هزرییەکان بناسێنرێت، کە تا ئاستێکی باش توانیویەتی نوسەر و خوێنەری جیاواز لە رووی ئاست، بۆچوون، دید و تێڕوانین کۆبکاتەوە.

**گرنگترین ئامانجەکانی ناوەندەکە ئەمانەن:**

(خستنەڕووی تێگەیشتنێکی رەسەنی خۆماڵی هاوچەرخ بۆ ئیسلام، راستکردنەوەی ئەو چەمکە ئیسلامییانەی شێوێنراون و راماڵینی ئەو تۆمەتانەی ئاینی پێ لەکەدار دەکرێت، رەخساندنی دەرفەتی دایەلۆگ و راگۆڕینەوەی بیر و قەڵەمە بوێرەکان لە کایە جیاوازەکاندا، کۆکردنەوەی زۆرترین نووسەر و رۆشنبیری بژاردە، برەودان بە خزمەتکردنی زمان و کەلتوور و کەلەپووری کورد بە دیدێکی رەسەنی سەردەمیانە) (تۆفیق کەریم، خاڵ، ژمارە یەک، لاپەرە: ٤).

بە سەرنجێک لەسەر حەڤدە ژمارەکەی خاڵ پێکانی ئامانج و بەرجەستەکردنی دروشمە پرشنگدارەکە دەردەکەوێت، بۆیە لەم چەند دێڕەی داهاتوو، تیشکێک دەخەینە سەر ئەم خاڵانەی لەماوەی حەڤدە ژمارەی خاڵ نەخشێنراون، لە دوایدا وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە بۆ خوێنەر جێدەهێڵین: ئایا خاڵ لە سێ ساڵی رابردوودا توانیوویەتی پەیامەکەی بگەیەنێت و ئامانجەکانی بەدیبهێنێت، یاخود نا؟.

هەرەمی پێکهاتەی هونەریی دەستەی ئامادەکاران و راوێژکارانی گۆڤارەکە بەم شێوەیەیی خوارەوەیە: (خاوەنی ئیمتیاز و سەرنووسەر: تۆفیق کەریم، بەڕێوەبەری نووسین: ئیدریس سیوەیلی، بەڕێوەبەری هونەریی: رەوشت محەمەد، راوێژکاری یاسایی: بەکر حەمەسدیق. هەروەها تیمی راوێژکارانی خاڵ ئەمانەن: د.موحسین عەبدولحەمید، د.عوسمان عەلی، د.عوسمان هەڵەبجەیی، د.ئیسماعیل بەرزنجی، سەلام ناوخۆش. ژمارەکانی گۆڤاری خاڵ لە چاپخانەی سەردەم بە تیراژی ١٥٠٠ دانە چاپدەکرێن و بە نرخی ١٥٠٠ دینار لە زۆربەی کتێبفرۆشەکان دەستدەکەون).

هەڵبژاردنی وشەی خاڵ وەک ناو بۆ گۆڤارەکە، وەک سەرنووسەر خۆی ئاماژەی بۆ دەکات، بۆ دوو خاڵ دەگەڕێتەوە: یەکەم: (لە خاڵێکیشەوە هەنگاو دەهاوین و دەستدەبەین بۆ گشت چەمک و واتا ئاسایی و قەدەغەکان)، هەروەها شوێنکەوتنی شێخی خاڵ و بەرزراگرتنی ئەو بیرمەندە مەزنەیە، کە لەم بوارەدا (نیو سەدە ئەسپی خۆی تێدا تاودا، جیاواز لەوانی دی، بەڵام هەموو لایەک رێزیان لێدەگرت، ئەو لەلایەک قازی و مەلا و وتاربێژ بوو لە هەمانکاتیشدا لە دامەزرێنەرانی کۆڕی زانیاری کورد بوو، تەفسیری قورئان و فەرهەنگی زمان و پەندی پێشینانی پێکەوە دەنووسی، کە ئەمە پڕاوپڕی ئامانجی ناوەندەکە)ـیـە.

تەوەرەکانی گۆڤاری خاڵ، هەر ژمارەیە و بۆ شیکار و قسەکردن لەسەر تەوەرێک تەرخاندەکرێت، لەسەرەتای دەرچوونیەوە، کە دوو ژمارە لە ساڵی ٢٠١٥ و شەش ژمارە لە ٢٠١٦ و شەش ژمارە لە ٢٠١٧ و سێ ژمارەی لە ٢٠١٨ دەرچووە، لەسەر حەڤدە تەوەر قسەکراوە و بەم ژمارەیەوە تەوەری هەژدەیەم تەواو دەبێت. هەر هەژدە تەوەرەکەی گۆڤاری خاڵ بە ریزبەندی ئەمانەن: (کلیلی کردنەوەی دەستوور مەدەنیبوون و هاوڵاتیبوون، ئایینەکان لە کوردستان: پێکەوەژیان یان پێکدادان؟، کەلەپووری ئیسلامیی خوێندنەوە و هەڵسەنگاندن، مامەڵەکردن لەگەڵ سوننەت لەنێوان سەلەفیەت و عەقڵانیەت، ئیسلام بێ ئایینزا – مەزهەب، ئازادییە گشتییەکان،

دەوڵەتداری ئیسلامیی: مەدەنیبوون یان ئایینیبوون؟، تەکفیر چەکی قۆرخکردنی ئایین، ئیسلام و مێژوو، شوناس و بەخۆماڵیکردنی کولتووری کوردی، جیاکردنەوەی بانگەواز لە سیاسەت، خوێندنەوەی ئایدیۆلۆجییانە بۆ کەلەپوور، ئایندەی کوردستان لەبەردەم ململانێی مەزهەبیدا، مافی چارەی خۆنووسین لەبەر رۆشنایی یاسا نێودەوڵەتییەکان و بنەماکانی ئایینی ئیسلامدا، راجیایی سیاسی، دیاردەی سۆفیگەری لە نێوان دوێنێ و ئەمرۆدا، فەتوا لەنێوان ململانێی سیاسی و ئەرکی شەرعییدا، دیموکراسییەت لە وڵاتانی ئیسلامییدا دەردە یان دەرمان).

ئەگەر بە وردی سەیری نووسەر و خاوەن خاڵەکانی گۆڤارەکە بکەین و بەزمانی داتا قسە بکەین, لە وەڵامدانەوەی پرسیاری سەرەوە تایبەت بە پێکانی ئامانجی گۆڤارەکە نزیکتر دەبینەوە, بە زمانی ژمارە و ئامار لەخوارەوە گۆڤارەکە هەڵبسەنگێنن:

بەشێوەیەکی گشتی بابەتەکانی گۆڤارەکە بۆ چەند پرس دابەش دەبن، پرسی گەنگەشەکردنی تەوەری بابەتەکە، دیمانە و چاوپێکەوتن، هەروەها چەند بابەتێکی گشتی و فرەرەنگ لە هەر ژمارەیەکدا، بەمشێوەیەیی خوارەوە:

بابەتەکانی ژمارەکانی گۆڤاری خاڵ: سەد و نەوەد و سێ بابەت تایبەتن بە تەوەری تایبەتی ژمارەکان، سەد بابەت فرەرەنگن و لەژێر ناونیشانی «بابەتی گشتی» بڵاوکراونەتەوە، هەروەها دە چاوپێکەوتن ئەنجامدراون، بەشێوەیەک تایبەتمەندی تەوەری ژمارەکە رەچاوکراوە لە هەڵبژاردنی ئەو کەسانەی دیمانەیان لەگەڵ ئەنجامدراوە، بەمەش سەرجەم بابەتە بڵاوکاروەکانی گۆڤارەکە لە حەڤدە ژمارەی رابردوو بریتیین لە سێ سەد و سێ بابەت.

سەبارەت بە پرسی خۆماڵیبوون لە نوسیین و گەڕانەوە بۆ ڕەسەنێتی و قسەکردن بە ڕەهەندێکی نەتەوەیی و نیشتیمانی، لەسەر چەند ئاستێک کاری بۆ کراوە، سەرجەم نووسەرەکان کوردن، زۆر بەکەمی بابەت لە زمانە بیانییەکانەوە وەرگێردراوە، سەرجەم ئەو کەسانەی چاوپێکەوتنییان لەگەڵ کراوە کوردن و بژاردەن لە بوارەکەی خۆیان و ئەستێرەی گەشاوەی هزر و مەعریفەن لە کۆمەڵگەی کوردستانی، بۆ نموونە دیمانەکان بەریزبەندی لەگەڵ هەریەکە لەمانەوەی خوارەوە ئەنجام دراون: «مستەفا زەڵمی لە ژمارە یەک، عەلی باپیر ژمارە دوو، محسن عبدولحەمید ژمارە سێ و ژمارە پانزە، ئارام قادر ژمارە حەوت، ئەبوبەکر عەلی ژمارە هەشت، قادر پشدەری ژمارە سیانزە، ئیبراهیم جاف ژمارە سیانزە، تەحسین حەمە غەریب ژمارە شانزە، ئەحمەدی شافیعی ژمارە حەڤدە».

زۆربەی هەرە زۆری نووسەرەکان ئەکادیمستن و پشکی شێری بابەتەکان بەر خاوەن بڕوانامە بەرزەکانی خوێندنی باڵا کەوتون لە هەڵگرانی ماستەر و دکتۆرا، ئەوەی زیاتر گۆڤارەکەی رازاندۆتەوە پرسی پسپۆرییەتییە، کە زۆربەی ئەکادیمیست و نووسەرە خۆماڵییەکان لە بوار و پسپۆری خۆیان بابەتییان نووسیووە، بەمەش بەهای زانستی گۆڤارەکە و بەپێزی بابەتەکانیزیاتر هێناوەتە کایەوە.

ئەوەی گۆڤاڕی خاڵ لە گۆڤارەکانی تر جیادەکاتەوە، فرەرەنگییەتی لە سەر ئاستی نووسەر و بابەت و تەوەر. ئەگەر سەیری لیستی نووسەرەکان بکەین، کە زیاد لە ژمارەیەکی خاڵ بابەتییان هەبووە، بۆمان دەردەکەوێت کە خاڵ جیا لەوەی دوانگەیەکی هزرییە، دوانگەیەکیشە بۆ کۆکردنەوەی بۆچوون و ئاراستە جیاوازەکان، لەسەر ئاستی هزری، سیاسی و مەزهەبی، بۆ نموونە: ئیسلامی و عەلمانی لە نێوان نووسەرەکان دەبینرێن، لەنێو ئیسلامییەکانیش: صۆفی، یەکگرتوو، کۆمەڵ و بزوتنەوە و بێلایەن (بێلایەن = بەو واتاییەی لە هزر و بۆچوون لایەنگیری رەوتێکی هزری یان سیاسییە بەڵام ئەندامی هیچ پارتێک نییە). هەروەها لە رووی پیشەییشەوە نووسەرەکانی خاڵ هەمە رەنگن، بۆ نموونە: مامۆستای ئاینیی، توێژەر، مامۆستای زانکۆ، بیرمەند، سیاسی و رۆژنامەنووس.

سەبارەت بە کەلەپووری ئەستێرە پرشنگدارەکانی ئاسمانی هزر و مەعریفە لە کوردستان کە لە ژیاندا نەماون، گۆڤاری خاڵ هەوڵیداوە چەند خاڵێک لەسەر بەرهەم و لایەنەکانی ژیانیان بنەخشێنێت، تەنانەت ستایشی رۆڵی بەشێک لە نووسەرە زیندووەکانیشی کردووە و لەسەر بەرگی گۆڤارەکە وەک قەڵەم و خامەیەکی بە بڕشت کورتەیەکی سەبارەت بە ژیاننامە و بەرهەم و هەوڵەکانیان خستۆتە روو، کە ئەمەش وەڵامێکی گونجاوە بۆ ئەوانەی کورد بە مردوو پەرست و زیندوو کوژ هەژماردەکەن، چونکەخاڵ لە یەک کات توانیویەتی، بەشێوەیەکی رێژەیی، رێز لە زیندووەکان بنێت و گرنگیش بە کەلەپووری کەڵەکەبووی بیرمەندە کۆچکردووەکانیش بدات.

ئەگەر بە وردی بڕوانین، دەبینین لە ژمارە جۆراوجۆرەکانی خاڵ گرنگی بە کەلەپووری بەشێک لە بیرمەندە گەورەکانی کورد دراوە و لایەنێک لە لایەنەکانی ژیانیان شیکارکراوە، بۆ نموونە: پرۆژە هزرییەکەی شێخ محەممەدی خاڵ لە ژمارە دوو، مەسعود محەممەد لە ژمارە سێ، سەعیدی نورسی و پیرەمێرد لە ژمارە پێنج، مستەفا زەڵمی و مەسعود محەممەد لە ژمارە شەش، ناصری سوبحانی و مەلای گەورەی کۆیە لە ژمارە حەوت، گوڵعەنبەر و میراتی بابانییەکان لە ژمارە هەشت، سەعید نورسی و مستەفا زەڵمی لە ژمارە نۆ، شەرەفخان و ئەمین زەکی بەگ لە ژمارە دە،ئیبن خەلەکان و مەلا رەشید بەگی بابان لە ژمارە یانزە، رەزاخانی کەندۆڵی لە ژمارە دوانزە، سەعیدی نورسی و مەلای گەورەی کۆیە لە ژمارە سیانزە، سەلاحەددینی ئەیوبی و مەولانا خالیدی نەقشبەندی و پیرەمێرد و مەلای گەورە لە ژمارە شانزە.

هەروەها خاڵ تیشکی خستۆتە سەر کەلەپووری هەندێ لە کەسایەتییە ئیسلامییە جیهانییە غەیرە کوردەکان، بۆ نموونە: جەلالەدینی رۆمی لە ژمارە دوو، دیسان جەلالەددین لە ژێر ناونیشانی مەولانا لە ژمارە پێنج، راشید ئەلغەننوشی و ئیبن حەزملە ژمارە شەش، محەممەد ئیقباڵ لە ژمارە دە، تەها جابر عەلوانی و عیمادەدین خەلیل لە ژمارە پانزە، مالیکی کوری نەبی و فەتحی مەلکاوی لە ژمارە حەڤدە.

سەبارەت بە هێنانەدی خەونی «نوێگەری» خاڵ لە رێگەی دەستنیشانکردنی تەوەری ژمارە، لەرێگەی گەنگەشە و راوێژ بە پسپۆران، توانیویەتی کۆمەڵێک پرسی گرنگ بوروژێنێت و قسەیان لەسەر بکات، بۆ نموونە پرسی مەدەنییوون، پێکەوەژیانی ئاینیی، مامەڵەکردن لە گەڵ کەلەپووری ئیسلامی، مامەڵەکردن لە گەڵ فەرمووده، مامەڵەکردن لە گەڵ ئاینزا ئیسلامییەکان، تەکفیر، پرسەکانی تایبەت بە فەتوا، ئایدیۆلۆجیا و دیموکراسییەت. سەرەڕایی ئەوەی چەندین بابەتی جۆراوجۆر لەسەر پرسە ئاڵۆز و کێشەلەسەرەکانی مەعریفە و هزر بڵاوکراونەتەوە.

لەکۆتاییدا، گرنگە ئاماژە بە دوو خاڵی گرنگ بدەین، پێویستە خەمخۆرانی هزر و مەعریفە بەر بگرن لە شکستی ئەو کاروانە هزرییەی دەستی پێکردووە و نەهێڵن بوەستێت، بە پاڵپشتی مەعنەوی و ماددی و بەشداریکردن بە نووسینی بەپێز و خاڵ خستنە سەر بابەتە هزرییە گرنگەکان و پرسە هەنووکەییەکان. هەروەها هەوڵبدرێت لە ساڵی نوێی کاروانی خاڵ وەرچەرخانێکی تری ئەکادیمی لە کاروانەکە رووبدات، بەوەی کە گۆڤارەکە بکرێت بە گۆڤارێکی زانستی موحەکەم و ئەکادیمیستەکان بتوانن لە پرۆسەی باڵابوونی ئەکادیمیش سوودی لێوەربگرن، بەمەش خاڵ هەم سەنگ و قورساییەکەی زیاتر دەبێت، هەمیش دەبێتە دوانگەیەکی ئەکادیمی تۆکمە کە نووسەران زیاتر پەرە بە زانستیبوون و بنەما ئەکادیمییەکانی نووسین و لێکۆڵینەوە بدەن لەو بابەتانەی لە خاڵ بڵاودەکرێنەوە.

لە کۆتاییدا، دوای رامان لە خەرمانی کاروانی خاڵ و خاڵنامەکانی، خوێنەر دەتوانێت خۆی وەڵامی ئەم پرسیارە بداتە: ئایا خاڵ لە سێ ساڵی رابردوودا توانیوویەتی پەیامەکەی بگەیەنێت و ئامانجەکانی بەدیبهێنێت، یاخود نا؟.

# تەوەری داهاتوو

## پێگەی خێزان لە کۆمەڵگای مۆدێرندا
## ئاڵنگاری و پێشگۆیی

لە سایەی پێشکەوتنی تەکنۆلۆجی و بەکاڵاکردنی بەهاکان لە جیهانی مۆدێرندا، بابەتی خێزان و پەروەردە لەو بابەتە گرنگانەیە کەپێویستی بەبایەخ پێدانی زیاتر هەیە و لەئێستادا خێزان ڕووبەڕووی  چەندین ئاڵنگاری نوێ بووەتەوە کە داهاتووی خستووەتە مەترسیەوە، لەم روانگەیە گۆڤاری خاڵ وەک دەرککردنی بەگرنگی و بایەخی ئەم بابەتەو سوودی بۆ کۆمەڵگای کوردی دەیکاتە تەوەری ژمارەی داهاتووی گۆڤاری خاڵ، هێڵە گشتییەکانی تەوەری ئەم بابەتەش بریتین لە:

- گرنگی و پێگەی خێزان لە پەروەردەکردنی تاکی تەندروستدا.
- ڕۆڵی فێمێنیزم لە لاوازکردنی پێگەی خێزاندا.
- کاریگەری جیهانگەرایی و سەرمایەداری و بەهاکانیان لەسەر خێزان.
- هاوڕەگەزبازی و ئیباحیەتی سێکسی و کاریگەرییان لەسەر داهاتووی خێزان.
- لێکەوتەکانی هەوڵدان بۆ نەهێشتنی خێزان چین؟
- گرفتە هاوچەرخەکانی خێزان و هۆکارەکانی هەڵوەشانەوەی لە کۆمەڵگای کوردیدا چین؟
- ڕۆڵی تەکنولۆژیا لەئاراستەی پەروەردەیی خێزان و تەشەسەندنی کێشەکانی خێزاندا؟
- ڕوانین و چارەسەری ئیسلام بۆ گرفتەکانی خێزان و هەڵوەشانەوەی.



# تەوەری ژمارە

## دیموکراسیەت دەردە یا دەرمان

سالآنێکە دیموکراسیەت بوەتە بنێشتە خۆشەی دەمی هەموو لایەك، تەنانەت ئیسلامییەکان کە بە دوژمنی سەرسەختی دیموکراسی وێنادەکران، ئەمڕۆ بەشێکی بەرفراوانیان گرەوی لەسەر دەکەن و لە بەرنامە و پرۆگرامیاندا رەنگی داوەتەوە، هەندێکیشیان بە کردەیی دەوڵەتیان لەسەر دامەزراندوە.

ئەم کالآ رۆژئاواییە کە بۆ سەدەیەك دەچێت لە رۆژهەلآتیشدا سەودا و مامەڵەی پێ دەکرێت، کەچی هێشتا نەبوەتە کالآی ولآتانی رۆژهەلآتی ناوەڕاست، ئەزموون لە دوای ئەزموون شکستی پێدەهێنرێت و ناشیرین دەکرێت، تا ئەو ئەندازەیەی خودی دیموکراسیەت خۆی کەوتوەتە ژێر پرسیارەوە.

نەك تەنها لای ئێمە، بەڵکو لە رۆژئاواشەوە گلەیی و گازندەی لەسەر دەکرێت.

پرسیارێك کە لەم ناوەندەدا سەرهەڵدەدات ئەوەیە ئایا دیموکراسیەت دەردە یان دەرمان؟

لەم تەوەرەدا کۆمەڵێك رۆشنیر و نووسەر هەریەکەیان لە گۆشەنیگای خۆیەوە لەم بابەتە دەدوێت، بەو ئومێدە توانیبێتیان تینویتی خوێنەر بشکێنن.



# دیموکراسی




**جەمال حەمەڕەشید**

له دایکبوی سلێمانی ١٩٧٤. ماجستێر له یاسای نێودەوڵەتی. خوێندکاری دکتۆرا له یاسای نێودەوڵەتی له زانکۆی مەنسورە له میسر. خاوەنی توێژینەوەیەکی زانستی و چەندین وتارە له بواری یاسایی و سیاسیدا .

دیموکراسی وشەیەکی یۆنانی کۆنەو لە دوو برگە پێکهاتووە (Demos) واتە گەل (Kratos) واتە دەسەلات کە بە گشتی دەسەلاتی گەل دەگەیەنێت. دیموکراسیش وەک زۆربەی چەمکەکانی تری بواری زانستە مرۆڤایەتیەکان چەندین پێناسی بۆ کراوەو هەر یەکەشیان لایەنگری خۆی هەیەو لە هەندێک ڕووەوە لەوی تر جیاوازە.(١)

بەلام گرنگ ئەوەیە کە دیموکراسیەتی هاوچەرخ پێناسە یۆنانیە کۆنەکەی کە بە (حوکمی گەل) ناسراوە تێپەڕاندوە، چونکە حوکمی گەل بە ناوەڕۆکە یۆنانیەکەوە دیموکراسیەتی ڕاستەوخۆ دەخوازێت و لە ئێستاشدا داوا کردنی ئەم مۆدێلە لە دیموکراسی وەک داوایەکی یۆتۆپیایی دەردەکەوێت. ئەمەش بێ ئەوەی مانای ئەوە بێت کە دیموکراسیەتی هاوچەرخ بە تەواوی لەو مانایە دابڕاوە. بەڵکو مەبەست لەم سەرنجە ئەوەیە کە لەگەڵ پێشکەوتنی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتیدا، ئەم چەمکەش ناوەڕۆکی گۆڕاوەو شێوەی نوێ ی بە خۆ وەرگرتوە.

دەتوانرێت بوترێت دیموکراسی لانی کەم شێوەیەکە لە شێوەکانی حوکمکردن واتە ڕێگایەکی تایبەتە بۆ گەیشتن بە بڕیارە حکومیەکان (٢)، حکومەتێکی دیموکراسی لەبەر تیشکی ئەو پێناسەی سەرەوەدا، بە لایەنی کەمەوە دەبێت هەڵگری ئەم خەسڵەتانەی خوارەوە بێت:

١- حوکمی زۆرینە: کاتێک گەل جیاوازی لە ناوخۆیدا دروست دەبێت لە سەر ئەوەی پێویستە حکومەت چی بکات و چی نەکات؟ ئەو کاتە پێوەر بۆ یەکلایی کردنەوەی ئەم جیاوازیەو دەرکردنی بڕیاری پێویست لەگەڵ بونی زۆرینەیە واتە زۆرینەی گەل (کە زۆربەی جار زۆرینەی نوێنەرانی گەلە) بڕیاری لەسەر چی بوو کارەکە بەو جۆرە دەبێت و ئەوە دەبێت بە بڕیاری فەرمی پەیڕەو کراو.

(دیموکراسی بریتی یە لە ئامرازێک کە گەل حوکمی خۆی پێ دەکات و وەسیلەیەکە تەعبیری پێ لە ویست و سەروەریێتی خۆی دەداتەوەو لە ڕێ ی ئەمەوە مومارەسەی دەسەلات لە دەوڵەتەکەیدا دەکات) (٣)

٢- وەلامدانەوەی حکومەت بۆ ویستی گەل: حکومەتی دیموکراسی ئەوە دەکات کە گەلەکەی داوای دەکات و دەیخوازێت.

٣- یەکسانی سیاسی: واتە دەبێت دەرفەت بۆ هەموو کەس بۆ بەشداری کردن لە دروستکردنی بڕیاری سیاسیدا یەکسان بێت.

نوسەری ئەمریکی فۆکۆیاما لە پێناسەی دیموکراسیدا دەڵێت(٤): (دیموکراسیەت بریتی یە لە مافی هەموو هاولاتیەک لەوەی بەشی لە ژیانی سیاسیدا هەبێت واتە مافی هەموو هاولاتیەکە لە دەنگدان و بەشداری لە ژیانی سیاسیدا)

هەر لەسەر ئەم بناغەیەش (فۆکۆیاما) ولاتی دیموکراسیش بەم جۆرە پێناسە دەکات: (ئەو ولاتەی کە مافی هەڵبژاردنی حکومەت لە ڕێگەی هەڵبژاردنی دەوری و فرەیی و نهێنی یەوە بۆ هاولاتیانی خۆی دەستەبەر دەکات لەسەر بناغەی یەکسانیێتی لە دەنگداندا).

ئەم پێناسە تا ڕادەیەکی زۆر لە ناوەندە جیهانیەکەدا بوەتە پێناسەیەکی باوی دیموکراسی و زۆرێک لە لێکۆڵەر و نوسەرە سیاسیەکان پێی ڕازین.

(سمير أمين) دەڵێت: ( دیموکراسیەتی سیاسی لەسەر پرەنسیپی هەڵبژاردنی دەزگا جۆراو جۆرەکانی فەرمانڕەوایی لە ڕێگەی هەڵبژاردنی ئازاد و ڕاستەوە دادەمەزرێت).

د. سعد الدين ابراهيم خاوەنی کتێبی (کۆمەڵگا و دەوڵەت لە نیشتمانی عەرەبیدا) دەربارەی دیموکراسی دەڵێت: (دیموکراسیەت هەر لە بنەڕەتەوە واتای بەشداری سیاسی لەسەر بەربلاوترین ئاست دەگەیەنێت بۆ ڕۆڵەکانی گەل و پێکهاتە کۆمەلایەتیەکان).

پێداویستیەکانی دیموکراسیەتیش بریتین لە: فرەیی سیاسی، رێز گرتنی رای بەرامبەر، رازی بون بە پێکەوە ژیان و ململانێ ی ئاشتیانەی دیموکراسی، بونی کەش و هەوایەکی راستەقینە لە متمانەو دان نانی بەرامبەر بە بونی یەکتردا، وە مافی بەردەوام بون لە رادەربرین.

زانای کۆمەڵناسی بەریتانی (توم بوتمور) (١٩٨٠) قسە لەسەر ئەو پەرەسەندنە دەکات کە بەسەر چەمکی دیموکراسیەتدا هاتوەو دەڵێت: (دیموکراسی تەنها هۆکارێکە بۆ هەڵبژاردنی سەرکردە سیاسیەکان).

هەروەها پێناسەی نوسەرێکی تر باس دەکات سەبارەت بە دیموکراسی کە ئەویش (شومبێرە) و دەڵێت: (شێوازی دیموکراسی بریتی یە لەو رێکخستنە دام و دەزگایی یە بۆ گەیشتن بە بریارە سیاسیەکان).

موریس دوڤرجیەش کە نوسەرێکی فەرەنسییە بە شێوەیەک وەسفی دیموکراسی دەکات کە سیستەمێکە لە رێگەیەوە زۆرینەی دانیشتوان هەڵدەستن بە هەڵبژاردنی حکومەت، کەمایەتیش مافی را دەربرینی هەیەو هەموو بیر و باوەڕ و رەوتەکان جێگای رێز گرتنن و هاوڵاتیانیش تێیدا یەکسانن.

ئەم تێروانینە نوێ یە بۆ دیموکراسی کە لە زۆربەی پێناسەکاندا وە دەرکەوت، دیموکراسی دەکات بە میکانیزمێکی بێ لایەن بۆ بەرێوە بردنی ژیانی سیاسی، دکتۆر وەحید عبد المجید لەم روانگەوە دەڵێت:( ئەزمونی دیموکراسی کۆمەڵێک میکانیزمی بەرهەم هێناوە و رۆژ بە رۆژ زیاتر دەچەسپێن و رەگ دا دەکوتن بە جۆرێک کە خەریکە سەربەخۆیی تەواو لە بنچینە فەلسەفی و کۆمەڵایەتیەکەی لە نموونە خۆرئاوایی یەکەی بە دەست دەهێنێت).(٥)

**لە هەموو حاڵەتێکدا چەمکی دیموکراسی دوو روو دەگرێتەوە:**

١- رژێمێکە بۆ حکومەت کردن.

٢- کۆمەڵێک میکانیزم و دام و دەزگایە کە ئەرکی ئەمانەش بە دەست هێنانی دوو پێداویستی سەرەکی یە:

أ- توانای شۆڕ بونەوە بە ناو ویستی زۆرینەی گەلدا و گوزارشت لێدانەوەی، واتە وەڵامدانەوەی پرسیارەکانی کێ نوێنەرایەتی دەکات و چۆن حوکمی دەکات؟ بۆ پیادە کردنی ئەمەش، ئازادی پێکهێنانی پارتە سیاسیەکان و مافی هەڵبژاردن و دەنگدانی ئازاد دەخوازێت.

ب- دەستەبەر کردنی ئەو رێ و شوێنانەی گەرەنتی ئەوە بکات دەنگدەران چیان دەوێت لە نوێنەرەکانیان ئەوان بەو جۆرە بکەن، کاتێکیش لە ئەرکەکانی سەرشانیان کەمتەرخەمیان کرد بتوانرێت بگۆردرێن، ئەمەش لە رێگەی چاودێری گەل بە سەر دەسەڵات و بوونی ئاڵ و گۆری ئاشتیانەی دەسەڵات و هەڵبژاردنی دەوریەوە دێتە دی، کە ئەمەش کرۆکی دیموکراسی پێکدەهێنێت(٦).

واتە ناوەڕۆک و کرۆکی دیموکراسی دوور لە پێچ و پەناو گیروگرفتی زاراوە و پێناسەکان، بریتیە لەو میکانیزم و رێ و شوێن و شێواز و گەرەنتیانەی کە خەڵکی لە رێگەی ئەوانەوە دەتوانن خۆیان فەرمانڕەواکانی خۆیان هەڵبژێرن و رژێم و فەرمانڕەواو مۆدێلێک لە ژیانیان بە سەردا نەسەپێنرێت کە دڵخوازی ئەوان نییەو نایانەوێت، دواتر کۆمەڵگا توانای چاودێری ئەم دەسەڵاتەی هەبێت و فەرمانڕەواکان لە چوارچێوەی دەستورێکی ئازاددا مومارەسەی دەسەڵات بکەن و لە کاتی لادان و سەرپێچی کردنی مەرجەکانی فەرمانڕەوایەتی کردن، بتوانرێت بەرکەنار بخرێن و لەسەر کورسی دەسەڵات بهێنرێنە خوارەوە و کەسانی تری دڵسۆز و شایستە بخرێتە شوێنیان. هەروەها ئەوە دەگەیەنێت کە دەسەڵات موڵکی شەخس و گروپێکی دیاری کراو نییە بەڵکو

گەل خاوەنیەتی ، وە توندو تیژی لە کایەی سیاسەت بکرێتە دەرەوەو ماف و ئازادیە تاکە کەسی و گشتیەکان دەستەبەر بکرێن. ئەمە ئەو دیموکراسیەیە کە بە دوای دەگەڕێین و بانگەشەی بۆ دەکەین. دیموکراسیەت بەو واتایەی چەندین میکانیزم و شێوازە بۆ ڕێکخستنی جوڵانەوەی ژیانی سیاسی و کارلێکردنەکانی لە کۆمەڵگادا. لەگەڵ دەستەبەر کردنی پاراستنی کۆمەڵگای مەدەنی، ئەو میکانیزمانەی کە لە کۆتاییدا دەبنە هۆی ئەوەی دەسەڵاتی سیاسی یاخود دەوڵەت بە شێوەیەکی سروشتی لە کۆمەڵگاوە سەرچاوە بگرێت، وە دەربڕی ڕای زۆرینەی کۆمەڵگا بێت لەگەڵ ڕێز گرتن لە کەمینەو پاراستنی مافیان لە بون و بەردەوامی و کار کردن و ڕا دەربڕین و گوزارشت لە خۆ کردن، ئەمەش هەر لە سەرەتاوە دەخوازێ ئازادی سیاسی بسەلمێنرێت و بۆ هەموو لایەکیش دەستەبەر بکرێت لەگەڵ ڕازی بون بە فرەیی سیاسی و فکری و چالاکی پارتایەتی، وە فەراهەمکردنی هەموو بە مەرج گرتنە دەستوری و سیاسی و یاسایی یە پێویستەکان بۆ پارێزگاریکردن لە مافی جیاواز بون بۆ تاک و کۆمەڵ و گروپەکان، لەگەڵ دانناں بە پرەنسیپی پێکەوە ژیان و کێبرکێی سیاسی ئاشتیانە لە نێوان ئەوان و وازهێنان لە بەکارهێنانی توندوتیژی و ئاڵ و گۆڕی ئاشتیانەی دەسەڵات لە ڕێگەی هەڵبژاردنی ئازادو ڕاستەوخۆ و نهێنیەوە، کە هەموو هاوڵاتیان وەک یەک مافی دەنگدانیان هەبێت بە دوور لە هەڵاواردن لەسەر بناغەی نەتەوایەتی یان ئاین یان مەزهەب و ڕەگەز و پایەی کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئابوری.

لێرەشەوە سەرجەم ڕەوت و هێزەکانی ناو کۆمەڵگە دەتوانن لەگەڵ باوەڕبون بە سەرەتاکانی دیموکراسی برەو بە پرۆگرامە سیاسیەکەیان بدەن و لە ڕێگەی شێواز و میکانیزمە دیموکراسیەکانەوە بانگەشەی بۆ بکات.

## پرنسیپەکانی دیموکراسی:

لە خوارەوە باس لە چەند پرنسیپێک دەکەین کە تا ڕادەیەکی باش دەرخەری ڕۆحی دیموکراسین:

**یەکەم: بوونی دەستوور:**

دەستوور بەرزترین یاسای ناو وڵات و بەردی بناغەی دروست بونی دەوڵەت و ئاراستەدان بە کۆمەڵگای سیاسی یە. لە دەستوردا دام و دەزگا پێکهێنەرەکانی دەوڵەت و دەسەڵات و پەیوەندی نێوانیان و ماف و ئەرکە بنەڕەتیەکانی دەسەڵات و هاوڵاتیان دیاری دەکرێت. دەسەڵاتەکان بەسەر ئۆرگانەکاندا دابەش دەکرێت و شێوەی پیادە کردنی دەسەڵات و سەرچاوەی شەرعیەت و ئامانجە باڵاکانی کۆمەڵگا دەستنیشان دەکرێت. بۆ ئەوەی مەسەلەی فەرمانڕەوایی کردن و مومارەسەی دەسەڵات بۆ زەوق و میزاج و سەلیقەی کەسێک یاخود چەند کەسێک بەجێ نەهێڵرێت و دەسەڵاتەکانیش دیاری بکرێن و کەس نەتوانێت بیانبەزێنێت.

دەستور ئەو بەڵگەنامەیە یە کە ناوەڕۆکی ئەو (گرێبەست)ە یان ئەو پەیمانە کۆمەڵایەتییە دەردەبڕێت کە لە نێوان گەل و فەرمانڕەوایاندا هەیەو چوارچێوە بۆ دەسەڵاتەکان و شێوازەکان و ماف و ئازادیەکان دیاری دەکات.

**دووەم: فرەلایەنی:**

فرەلایەنی بە تایبەتیش فرەلایەنی سیاسی پرەنسیپێکی هەرە گرنگی دیموکراسی یەو نیشانەی بوونی ئازادی خۆڕێکخستن و ئازادی بیروڕا دەربڕین و دەرفەتی بەشداری سیاسی یە. واتە لە سایەی سیستمێکی فرەلایەندا سیاسەت دەبێتە کاری هەموان و لەلایەن کۆمەڵە کەسانێکی دیاری کراوەوە دەستی بەسەردا ناگیرێت. فرەلایەنی واتە بوونی زیاتر لە بژاردەیەک لە بەردەم هاوڵاتیدا لە کاتی هەڵبژاردندا، واتە بونی پێشبرکێی سیاسی و چاودێری دەسەڵات و ئۆپۆزسیۆن و ڕەخنەگرتن لە کەم و کورتیەکانی حکومەت و پێشکەشکردنی

(بەدیل) ی باشتر. فرەلایەنیش کاتێک ڕاستەقینەیە کە دەوڵەت لە بەرامبەر هێزەکانەوە بێ لایەن بێت، دەرفەت لە بەردەم هەمواندا یەکسان بێت، مافی خۆنیشاندان و گوزارشت لە خۆ کردن بۆ هەموان پارێزراو بێت. فرەلایەنی لە ناوەڕۆکدا ڕەتکردنەوەی یەک ڕەنگی و یەک دەنگی و تاکڕەویە. هەر بۆیە بە یەکێک لە هەرە گرنگترین سیماو پایەکانی ڕژێمێکی دیموکراسی دادەنرێت.

**سێیهەم: هەڵبژاردن و سیستەمی نوێنەرایەتی:**

بۆ ئەوەی ئازادییە گشتیەکان و مافە مەدەنی و سیاسیەکان و فرەلایەنی و بەشداری سیاسی مانایان هەبێت، پێویستە ژیانی سیاسی لەسەر بناغەی هەڵبژاردنی ئازادو سیستمی نوێنەرایەتی بینا بکرێت. نوێنەرایەتیەک دەستەبەری بەشداری سیاسی خەڵک بکات، دیموکراسی بەم واتایەو لەم ڕوەیدا مەبەست بونی پەرلەمان و دەسەڵاتی یاسادانان دەگەیەنێت کە لە نوێنەرانی هەڵبژێردراوی گەل پێکهاتبێت، بۆ ئەوەی ئەم ئامانجەش بێتە دی، تەنها ئەوە بەس نیە نوێنەران لە ڕێگەی هەڵبژاردنەوە ببنە ئەندامی پەرلەمان، بەڵکو دەبێت ئەو هەڵبژاردنە لە ڕێگەی بونی گەرەنتیە دەستوری و یاساییەکان پاک و بێگەرد بێت و دەستێوەردانی تێدا نەکرێت و پەرلەمانیش دەسەڵاتی ڕاستەقینەی یاسادانان و چاودێری دەسەڵاتی جێبەجێ کردن و لێپرسینەوەی هەبێت.

**چوارەم: ئاڵ و گۆڕی ئاشتیانەی دەسەڵات:**

ئەمەش ڕەتکردنەوەی توندوتیژی دەگەیەنێت لە گەیشتن بە دەسەڵات و پارێزگاری لێکردنی. ئەم پرنسیپەش بەشێک لە کرۆک و ڕۆحی دیموکراسی پێک دەهێنێت، هەر نمونەیەکی دیموکراسیش نەتوانێت ئاڵ و گۆڕی ئاشتیانەی دەسەڵات لە نێوان بژاردەی پرۆژەی هێزە سیاسیەکانی ناو کۆمەڵگا بهێنێتە دی، هەر لە بناغەوە نمونەیەکی ساختەیە، چونکە دیموکراسی تەنها دەقێکی دەستوری یاخود ئازادی ڕادەربڕین و خۆ ڕێکخستنی سیاسی و پیشەیی نیە، بەڵکو جێگۆڕکێ یە بە دەستەبژێری دەسەڵاتدار و بە دەستەوە گرتنی دەسەڵاتیشە، بە پێی ئەو بڕیارەی گەل لە هەڵبژاردنێکی ئازاددا دەیدات، کە ئەویش گۆڕینی فەرمانڕەواکانەو حوکمدانە بەسەر لێهاتن و دڵسۆزی و ئەدائی ئەواندا.

**پێنجەم: ماف و ئازادیە گشتیەکان:**

سیستمی دیموکراسی واتایەکی بۆ نامێنێتەوە ئەگەر ماف و ئازادیە گشتیەکانی هاولاتیان لە سایەیدا دەستەبەر نەکرابێت، چونکە بەبێ ئەم مافە مەدەنی و سیاسی و ئازادانە پرنسیپەکانی تریش بەرەو لاواز بون و بێ ناوەڕۆک بون دەچن.

ئەم ماف و ئازادییە گشتییانەش دەبێت لە دەستوردا گونجێنرا بن و لە واقعیشدا پیادە بکرێن، لە وێنەی ئەم مافانەش مافی ژیان، مافی ئاسایش، مافی بەشداری لە ژیانی سیاسی، مافی موڵکایەتی و مافی کارکردن، مافی فێربون،.... هتد.

ئازادیە گشتییەکانیش لە وێنەی ئازادی بیروباوەڕ، ئازادی بیروڕا، ئازادی هاتوچۆ و ڕێزگرتنی ماڵ و شوێنی نیشتەجێ بوون، ئازادی مانگرتن و ڕێپێوان و ئازادی پەرستش و ئازادی خۆ ڕێکخستن.

**شەشەم: گەل سەرچاوەی شەرعیبونی دەسەڵاتە:**

ئەگەر لە مێژودا شەرعیەتی سیاسی چەندین سەرچاوەی هەبو بێت، وەک هێز، پێسپاردنی خوایی (التفویض الالهی)، بنەماڵەو بە میراتی بۆ بە جێماو، یان شەرعیەتی شۆڕشگێڕی، ئەوا شەرعیەتی سیاسی لە سایەی سیستمێکی دیموکراسیدا بەوە جیا دەکرێتەوە کە مافی نەتەوە یاخود گەلەو دەبێت لەوانەوە سەرچاوە بگرێت و بەبێ بونی ئەم شەرعیەتە فەرمانڕەواکان مافی مومارەسەکردنی دەسەڵاتی سیاسی و بەڕێوەبردنی کۆمەڵگایان نییە.

دەتوانین بڵێین کە ئەو خاڵانەی لەسەرەوە



# فرەلایەنی بە تایبەتیش فرەلایەنی سیاسی پرەنسیپێکی هەرە گرنگی دیموکراسی یەو نیشانەی بوونی ئازادی خۆڕێکخستن و ئازادی بیروڕا دەربڕین و دەرفەتی بەشداری سیاسی‌یە

ئاماژەمان پێکردن، گرنگترین پرنسیپەکانی دیموکراسین، هەندێ مەسەلەی وەک: لێکجیا کردنەوەی دەسەڵاتەکان و سەربەخۆیی دادگاو بونی ئازادی ڕۆژنامەگەری، هەمویان دەچنە ژێر سایەی ئەم ناونیشانە گشتیانەوەو بە بەشێک لەو میکانیزمانە دادەنرێن کە کۆی سیستەمەکە پێویستی پێیەتی.

## دیموکراسی لە نێوان ڕواڵەت و ناوەڕۆکدا

تەنها بونی ڕواڵەتەکانی دیموکراسی لە وێنەی پرنسیپی سەروەری گەل و نوێنەرایەتی پەرلەمانی و حیزبەکان و هەڵبژاردن وحوکمی زۆرینە، بەس نیە بۆ ئەوەی بە وڵاتێک بوترێت دیموکراسی، بەڵکو دەبێت ڕەنگدانەوەی ڕاستەقینەی ناوەڕۆکی ئەم چەمکەش لەسەر زەوی واقیعدا ببینین.

چونکە ئەو ڕواڵەتانەی لەسەرەوە باسمانکردن تەنانەت لە زۆربەی وڵاتە دیکتاتۆری و نا دیموکراسیەکانی دنیاشدا هەبوون و هەن، بۆ نمونە لە زۆربەی وڵاتانی ناوچەی خۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا پەرلەمان و هەڵبژاردن هەیە، لە هەندێکیشیاندا حیزبەکان بونیان هەیە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا زۆربەی ئەم ڕژێمانە بە ڕژێمی نا دیموکراسی لەقەڵەم دەدرێن.

کاتێک هەڵبژاردن میکانیزمێکی دیموکراسییەو پەرلەمانیش دەزگایەکی ئەم سیستەمەیە، کە دەنگدەر لە هەڵبژاردنی پرۆژەو کاندیدی دڵخوازی خۆی ئازاد بێت و لە ژێر فشاری هیچ زۆر لێکردنێک نەبێت کە کار بکاتە سەر ئیرادەی ئازادی ئەو، دەبێت زیاتر لە پاڵێوراوێک بۆ پۆستی سەرۆکایەتی هەبێت و زیاتر لە بژاردەیەکیش لە هەموو بوارەکاندا لە بەردەمدا بێت، کە ئەوەش بونی فرە لایەنیەکی ڕاستەقینە دەخوازێت.

دەبێت هەڵبژاردن دور بێت لە ساختە کردن و پاک و بێگەرد بێت، نەک سیناریۆیەک بێت بۆ دەستخستنی شەرعیەتێکی ڕواڵەتی جەماوەری، بە مەبەستی پەردەپۆشکردنی واقعێکی نا دیموکراسی. دەبێت پەرلەمان دەسەڵاتی تەواوی هەبێت و بتوانێت چەندین یاسا دەربکات کە ڕۆشنبیری و ئاین و پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی و ئابوری و ئاسایش و خۆشگوزەرانی هاوڵاتی و کۆمەڵگا دەیخوازێت ، هەروەها بتوانێت لە دەسەڵاتی ڕاپەراندن بپێچێتەوە و چاودێری وردی بکات ، لە ناو دەوڵەتیشدا دەسەڵاتەکان لە یەکتری جیا کرابنەوە. وڵات دەستورێکی ڕاستەقینەی هەبێت کە ماف و ئازادیەکانی هاوڵاتی تێدا تۆمار کرابێت، دادگا سەربەخۆ بێت، هاوڵاتی توانای ئەوەی هەبێت لەکاتی هەستکردن بە ستەم و پێشێل کردنی مافی، داوای وەرگرتنی مافەکانی بکات.

دیموکراسی بە بێ بونی فرەلایەنیەکی ڕاستەقینەو بێ لایەنی دەوڵەت لە بەرامبەر هێزە سیاسیەکانداو دەرفەتی یەکسان لەبەردەم هەموان

و ئاڵوگۆڕی ئاشتیانەی دەسەڵات، واتایەکی ئەوتۆی بۆ نامێنێتەوە. لە هەندێ وڵاتدا چەندین حیزب لە ئاراداں بەڵام تەنها ڕۆڵی دیکۆر دەبینن بۆ جوان کردنی ڕوکاری دەرەوەی ڕژێمە نا دیموکراسیەکان، وە حیزبی فەرمانڕەوا هەموو تواناکانی دەوڵەت بۆ خۆی بەکار دەهێنێت، هەر کاتێکیش زانرا کە حیزبێک لەو حیزبانە بوەتە جێگەی مەترسی حیزبی دەسەڵاتدار، ڕژێم یاخود حیزبی دەسەڵات بە پشت بەستن بە تواناکانی دەوڵەت فشاری دەخاتە سەرو هەوڵی لە قاڵبدانی دەدات و هەندێک جاریش فشارەکان دەگەنە ئاستێک، هەڵوەشاندنەوەی حیزب و پێشێلکردنی یاسای لێ دەکەوێتەوە.

بەڵام لێرەدا دەبێت ئاگامان لە دوو مەسەلەی گرنگ بێت، یەکەمیان بریتیە لەوەی کە ئەم کەم و کورتی و بێ ناوەڕۆک کردنە پەیوەندی بە دام و دەزگاو میکانیزمەکانی دیموکراسیەوە نییە، واتای ئەوە نییە کە پەرلەمان و هەڵبژاردن و فرە حیزبی و سەرەتای زۆرینە، کۆمەڵی پرەنسیپی هەڵەن و نا تەواویەکە لەمانەوە سەرچاوە دەگرێت. نەخێر واقع سەلماندویەتی کە هەمو ئەمانە زۆر گرنگن و لە دەستکەوتە باشەکانی بیری سیاسی هاوچەرخن و لە ڕاستیدا تاوانەکە لە ئەستۆی ئەو عەقڵە ژەنگ گرتوە تاکرەوە نا دیموکراسیەدایە، کە دەیەوێت تەنها ناوی دیموکراسی بەکاربهێنێت و بەڵام ناوەڕۆک و ئەنجامەکانی قبوڵ نەبێت. خاڵی دوەمیش ئاگا بونە لەوەی کە چاری کەم و کورتی و ناتەواوی و ڕواڵەتی بوون لە ئەزمونێکی بە ڕواڵەت دیموکراسیدا ئەوە نیە لە بژاردەی هەڵبژاردن و دیموکراسی پاشەکشە بکەین، چونکە ئەمە زیاتر قەیرانەکە قوڵتر دەکاتەوە هەربۆیە دەبێت بە زیاتر سوربون لەسەر خەباتکردن بۆ دیموکراسی و ناچار کردنی دەسەڵات و نوخبەی دەسەڵاتدار بۆ ئەوەی سەرئەنجام مل بە خواستەکانی خەڵک بدەن ونەتوانن لە بڕیاری جەماوەر دەربچن و ئیرادەی ئەو ساختە بکەن، دەبێت بەردەوام بە گژ ئەم پرۆسەی بێ ناوەڕۆک کردنی دیموکراسیەدا بچینەوە.

پێویستە هەموان ئەو ڕاستیە بزانین کە دیموکراسی هەر لە خۆوە و بەشێوەیەکی (ئالی) پیادە ناکرێت و لە هەموو کەش و هەوایەکی ڕۆشنبیریدا باڵا ناکات و ناگەشێتەوە، چونکە دیموکراسی هەر لە بنەڕەتەوە بڕیارێکی کارگێڕی و سەروەری نییە کە لەلایەن تاکێک یاخود حیزبێکەوە یاخود کۆمەڵە تاک و حیزبێکەوە دەربکرێت. وە تەنها بە بەرز کردنەوەی دروشمیش جێبەجێ نابێت، بەڵکو بەرئەنجامی کۆمەڵێک هۆکار و کارتێکەری سیاسی و کۆمەڵایەتی و فیکری و ئابوری کۆمەڵگایە.

لە ڕویەکی ترەوە دیموکراسیەت تەنها بریتی نییە لە دروستکردنی دەزگای پەرلەمان. ئێستا تا ڕادەیەکی زۆر لە نێوان زاناکانی سیاسەتدا یەک دەنگیەک لەسەر ئەوە هەیە کە دیموکراسیەت تەنها گوزارشت نییە لە ڕاستیەکی دامەزراوەیی ڕووت، بەڵکو لەگەڵ ئەوانەدا کۆمەڵێک بەهاو بیر و ئاراستەو هەست و نەستە کە هانی پیادە کردنی دیموکراسیەتی کارا دەدات لەلایەن فەرمانڕەواو هاوڵاتیانەوە.

دیموکراسی گوزارشتە لە حاڵەتێکی ژیاری و ڕۆشنبیری کە کۆمەڵگە پێی دەگات، بیرو ڕاو هەست و نەستەکان ڕۆڵی گەورە دەگێڕن لە دارشتنی کەش و هەوای ژیاریدا، کە ئەمیش لای خۆیەوە وەک هەر هۆکارێکی تر ڕۆڵێکی نێگەتیڤ یاخود پۆزەتیڤ دەگێڕێت بە گوێرەی ئەو ناوەڕۆکەی کە هەڵگریەتی.

بۆچونی کۆمەڵگا سەبارەت بە مرۆڤ و بەهاو شوێنی ئەو لەسەر زەویداو ڕۆڵی لە ژیاندا، بە بەردی بناغەی ئەو کەش و هەوا ژیاریە دادەنرێت کە پێویستە بۆ گەشە کردنی دیموکراسی.

باوەڕبوون بەوەی کە مرۆڤ خاوەن بەهاو کەرامەت و مافە، بە چاو پۆشین لەهەر سیفەتێک کە دواتر دوای دەکەوێت، وەک ڕەگەز و ڕەنگ و نەژاد و ئاین و مەزهەب و گروپ و نیشتمان و ئینتمای سیاسی و ڕێ و جێی کۆمەڵایەتی و ڕۆڵی ئابوری و ماڵ و سامان و ناو و شۆرەت و شتی لەم چەشنە، ئەمە دەرگا بە ڕووی کۆمەڵێک بەهای تردا دەکاتەوە کە پشتی پرۆسەی دیموکراسی دەگرن و کۆمەکی زۆری دەکەن بۆ بەرەو پێش چون و ڕەگ داکوتان.

وەک پرنسیپی بەشداری سیاسی، ئازادی، یەکسانی و بەهای تری لەم جۆرە. ئەمەش زیاتر پەیوەستە بە باوەڕ بون بەوەی کە مرۆڤ خاوەنی دەسەڵاتە بەسەر خۆیەوە و بەدیهێنراوێکی ئازاد و لێپرسراوە، وە خاوەنی مافە لە دیاری کردنی چارەنوسی خۆی وهەڵبژاردنی ڕوگەو ڕێبازی ژیانی.

دوای ئەمانەش چەند بابەتێکی ڕۆشنبیری سیاسی دێتە کایەوە کە بۆ سەرکەوتنی پرۆسە دیموکراسیەکە پێویستە کە دەتوانین لێرەدا هەندێکیان باس بکەین:

## هەست کردن بە توانستی سیاسی:

دەبێت زۆرینەی کۆمەڵگا هەست بەوە بکات کە دەتوانێت کار لە ڕەوتی ژیانی سیاسی بکات، ئەمەش ئایا لە ڕێگەی ئاراستە کردنی ڕەخنەی بیناکەرەوە بێت لە هەر دەزگاو لێپرسراوێک کاتێک هەڵە دەکات بەبێ ترسان لە سزادان، یاخود لە ڕێگەی ڕا دەربرینەوە بێت دەربارەی کێشە جۆراوجۆرەکان کە ڕووبەڕوی کۆمەڵگا دەبنەوە لەگەڵ قەناعەت بوون بەوەی کە ئەم ڕایە نرخی خۆی هەیەو دەشێت گوێ ی لێ بگیرێت.

## ئامادەیی بۆ بەشداری سیاسی:

مومارەسەی دیموکراسیەت دەخوازێت بەلایەنی کەمەوە زۆرینەی هاوڵاتیان بە ئیجابی و هۆشیاریەوە بەشداری لە داڕشتنی سیاسەت و بڕیارو هەڵبژاردنی فەرمانڕەوایان و ئەندامانی دامەزراوە و نوێنەرایەتیەکان لەسەر ئاستە جۆرا و جۆرەکانی کۆمەڵگادا بکەن.

بوونی گیانی دەستپێشخەری:

هەستکردنی زۆرینە بە دەستپێشخەری کارێکی پێویستە، ئیتر ئایا بۆ دژایەتی کردنی ستەم و زۆرداری بێت یاخود بۆ بەشداری کردن لەو هەوڵانەدا بێت کە بۆ پەرەپێدان دەدرێن.

## نەبونی کەسگەرایی:

دیموکراسیەت پێویستی بەو باوەڕە هەیە کە پێی وابێت دەسەڵاتی سیاسی لە دەزگاو دامەزراوەکاندایەو لەگەڵ کەسایەتی فەرمانڕەواکاندا یەکی نەگرتوەو یەک شت نین، فەرمانڕەوا دەبێت وەک مرۆڤێک مامەڵەی لەگەڵ بکرێت کە ئەگەری کەوتنە ناو هەڵەی هەیەو پێویستە ملکەچ بێت بۆ لێپرسینەوە.

## متمانەی سیاسی:

پێویستە متمانەی بەرامبەر لە نێوان سیستمی سیاسی و هاوڵاتی و لە نێوان دامەزراوە سیاسیەکانیشدا بەرامبەر بە یەکتر لە ئارادا بێت، چونکە بەبێ ئەم متمانەیە کۆمەڵگا دەکەوێتە بەردەم تاکگەراییەکی بە لێشاوەوە، کە زۆر زەحمەتە لەگەڵ ئەمەدا کەش و هەوایەکی دروست بۆ کێبڕکێ ی سیاسی پەیدا ببێت کە کرۆکی مومارەسەی سیاسی دیموکراسی پێک دەهێنێت.

فەراهەم بونی ئەم پێدراو و بۆچون و بیرو ڕایانە کە کەش و هەوایەکی گونجاو پێک دەهێنن، ئەوە دەگەیەنێت کە کۆمەڵگا پلەیەکی بەرزی هۆشیاری بەدەستهێناوە و خەریکە ئامادە دەبێت بۆ پیادە کردنی دیموکراسیەت، بەڵام دەبێت لەگەڵ ئەمەشدا ئاگاداری ئەوە بین کە نەبونی ئەم توخمانە بە پلەیەکی بەرز پاساو نین بۆ دواخستنی دیموکراسیەت و تاکڕەوی. بە بیانوی چاوەڕوانی



# سیستمی دیموکراسی واتایەکی بۆ نامێنێتەوە ئەگەر ماف و ئازادیە گشتیەکانی هاوڵاتیان لە سایەیدا دەستەبەر نەکرابێت

کردن تاوەکو کۆمەڵگا دەگاتە پلەی پێویست لە هۆشیاری و پێگەیشتویی، چونکە پێگەیشتنی میللەت بۆ دیموکراسی لە ڕێگەی مومارەسە کردنی دیموکراسی خۆیەوە نەبێت نایەتە دی.

لە ڕاستیشدا لە ناو کۆمەڵگاو وڵاتە موسڵمانەکاندا ئیسلام بەشێکی بنەڕەتی ئەو کەش و هەوا ژیاریەی میللەت پێکدەهێنێت، لەگەڵ ئەوەی کە ئەم کەش و هەوا ژیاریە ئیسلامییە توشی چەندین دەردو داو هاتوە، زۆر داب و نەریت و بۆچونی وەهای تێکەڵاو بوە کە پێچەوانەی ئیسلامە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لە وڵاتانی ئیسلامیدا یەکجار گرنگە ڕەچاوی پەیوەندی پرۆسەی دیموکراسی بە ئیسلامەوە بکرێت، ئەم پەیوەندیەش دەکرێت بە شێوەیەکی کرداری بۆ سەر دوو ئاست وەربگێڕدرێت:

یەکەم: ڕەچاو کردنی پرۆسەی دیموکراسی بۆ پرنسیپ و بەهاو نەریتە ئیسلامییە ڕەسەنەکان و دورکەوتنەوە لە پێکدادان لەگەڵیاندا. دیموکراسیەت جێگرەوە نییە بۆ شوناسی ئیسلامی کۆمەڵگا موسڵمانەکان و وڵاتانی موسڵمان نشین، چونکە ئەگەر لەم فۆرم و بەرگەدا پێشکەش بکرێت، ئەوا بەربەستێکی دەرونی گەورە لەنێوان زۆرینەی کۆمەڵگاو دیموکراسیەتدا دروست دەبێت، هەر بۆیە نابێت وا بزانرێت کە ئەم کۆمەڵگایانە بێ شوناسی ژیاری و بێ مێژو و بێ شارستانیەتن.

دووەم: سوود وەرگرتن لەو بەها ژیاریە ئیسلامیانەی مۆرکی مرۆڤایەتی بەگشتی و هاوبەشیان هەیە بۆ سەرخستنی ڕێڕەوی دیموکراسی لەم وڵاتانەدا. چەمکەکانی (جێنیشینەتی مرۆڤ لە زەویدا و شورا و ئازادی و پێکەوە ژیان و دادپەروەری) و چەندین چەمکی تر. لەو چەمکانەن کە دەتوانن خزمەتێکی زۆر بکەن بە خولقاندنی ئەو کەش و هەوا ژیاریەی دیموکراسیەتی تێدا پیادە دەکرێت.

## دیموکراسی و سەرنجێکی ئیسلامی:

بابەتی شێوەی دەوڵەت و حکومڕانی لە ئیسلامدا لە بەشە گۆڕاوەکەی ئیسلامە نەک نەگۆڕەکان، ئیسلام هەموو ئەو بابەتانەی بەجێهێشتوە بۆ پێشکەوتنی مرۆڤایەتی و بەرژەوەندی کۆمەڵگا لە سەردەمە جیاوازەکانیدا.

ئیسلام لەم ڕووەوە تەنها ئاماژەی بە مەسەلە جەوهەریەکان کردوە، لە ڕوانگەی بیری ئیسلامیەوە گرنگ ئەوەیە دەسەڵات شورایی و دادپەروەرو ڕەنگدانەوەی خواست و ئیرادەی جەماوەری گەل بێت. هەر لە سەردەمی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) و سەرەتای ئیسلامیشەوە، ئیسلام وەک ئاین و موسڵمانانیش وەک پەیڕەوانی ئەم ئاینە لە رووە دنیایەکەی ژیاندا بەسەر دەستکەوتەکانی مرۆڤایەتی و بەرژوەندی کۆمەڵگا و ئەزمونە جۆراجۆرەکانی دەرەوەی خۆیاندا کراوە بون. پێغەمبەر (د.خ) لە جەنگی (خەندەق) دا هونەری جەنگی فارسەکانی بەکارهێنا، پێشەوا عومەریش بۆ ڕێکخستنی کاروباری دەوڵەت و سوپاکەی ئەزمونی ڕۆمانەکانی گواستەوەو سودی لە شارەزایی ئەوان

وەرگرت. لەم بوارەشدا ئەوەی بڕیار بەسەر ئەم جۆرە شتانەدا دەدات (بەرژەوەندیە) واتە ڕەچاو کردنی ئەوەیە کە ئەو ڕێ و شوێن ومامەڵەو سوود لێ وەرگتنە بابەتێکە لە بەرژەوەندی کۆمەڵگادایە یاخود نەخێر؟ لەم ڕووەشەوە فکرو جوڵانەوەی ئیسلامی لە ئاست شێوەو ڕواڵەت و زاراوەدا ناوەستێت و دەڕوانێتە ناوەڕۆکی شتەکان، ناونیشانی ئەم هەڵوێستەش ئەو ڕێسا (اصول) یە گرنگەیە کە دەڵێت: ( العبرة بالمقاصد والمعاني لا بالالفاظ والمباني)، گرنگ مەبەست و ناوەڕۆکە نەک ڕوکاری دەرەوەو ئەو دەستەواژەیەی بەکاردەهێنرێت بۆ گوزارشت لەم ناوەڕۆکە. هەر بۆیە ڕاکردنی هەندێ ڕای ناو ناوەندی ئیسلامی لە زاراوەی دیموکراسی و حوکم دان بەسەر شێوەو زاراوەکەدا بێ ئاوڕدانەوە بۆ ناوەڕۆکەکەی هیچ پاساوێکی شەرعی و عەقڵی و لۆژیکی لە پشتەوە نیەو بەڵگەیە لەسەر نەبونی قوڵایی فکری ئەو بەشە لەو ناوەندە. هەر بۆیە گەورە بیرمەندی ئیسلامی جەزائیری (مالك بن نبی) بە تێگەیشتن لەم ڕۆحەی ئیسلام دەڵێت: (هیچ ئاینێک بە ئەندازەی ئیسلام دڵخۆش نیە بە دیموکراسی، وە هیچ ڕژێمێکی ڕەوشتی و عەقیدەیی و یاسایی بە ئەندازەی ئیسلام ئەو بنەمایە دەستەبەر ناکات کە دیموکراسی لەسەر دەوەستێ و پێدەگات).

لە ڕاستیشدا ئەم بیرمەندە لەم لێکدانەوەیدا تا ڕادەیەکی زۆر لە ڕاستی نزیک بوەتەوە، چونکە چ ڕژێم و بیروباوەڕو ئاینێک هەیە هێندەی ئیسلام دژی ئەوە بێت کە جگە لە خوا هیچ کەس و شتێک لەم بونەوەرەدا بەرگی پیرۆزی بکرێتە بەر؟ چ ئاینێک هێندەی ئیسلام دژی بە پیرۆز کردنی سەرکردەو زانا و ڕەمزەکانە؟ لەلایەکی ترەوە چ ئاین و بیرو باوەڕێک بە ئەندازەی ئیسلام دژی ستەم و زۆرداریە وە لەگەڵ دادپەروەریدایە؟

لەبەرئەوە فکری ئیسلامی لە سێ ڕووەوە پێشوازی لە میکانیزمەکانی دیموکراسی و گەرەنتیەکانی دەکات:

١/ (الحكمة ضالة المؤمن انى وجدها فهو أحق بها) دیموکراسیەتیش حیکمەتە لە بوارێکی یەکجار ناسکدا کە بواری سیاسەت و دەسەڵاتە.

٢/ بونی بەرژەوەندی و ئەو ڕێسا (اصول) یەی ئەم سەرەتایە بەرجەستە دەکات و دەڵێت: (فحیث وجدت المصلحة فثم شرع الله) واتە هەڵوێستی ئیسلامی لەمەڕ بابەتە گۆڕاو و دنیایی و ژیانیەکانەوە لەسەر بناغەی بون و نەبونی بەرژەوەندی دامەزراوە، بە کردەوەیش سەلماوە دیموکراسی بەرژەوەندیەکی مەزنی کۆمەڵگا هاوچەرخەکانی تێدایە.

٣/ لەو ڕوانگەوە کە دیموکراسی بەرهەمی خەباتێکی دورو درێژی گەلانە دژی زۆرداری، پێداویستیەکی بنەڕەتی خەباتە بۆ لە ڕەگ و ڕیشە دەرکێشانی زۆرداری و (استبداد) شێوازێکی ئەزمونکراوی سەرکەوتوە.

هەر بۆیە تا ئەو ڕۆژەی بیری مرۆڤایەتی دەگاتە میکانیزم و شێوازێکی باشتر، ئەوا میکانیزم و شێوازەکانی دیموکراسی باشترین هۆکارن بۆ سنوردار کردنی دەسەڵات و کەم کردنەوەی مەترسیەکانی و ملکەچ کردنی بۆ خواستەکانی گەل و ڕێگرتن لە زۆرداری و ستەم.

## دیموکراسی و عەلمانیەت:

بابەتێکی تری پەیوەست بە دیموکراسیەوە لە جیهانی ئیسلامیدا کە پێویستی بە تێگەیشتن هەیە، تێگەیشتنە لە پەیوەندی نێوان عەلمانیەت و دیموکراسی چونکە ئەم پەیوەندیەش دیسانەوە مشتومڕێکی ناوەتەوەو هەندێک لە کات و دەرفەتەکانی بە فیڕۆ داوە. ئەمڕۆ زۆرێک لە عەلمانیەکانی وڵاتانی ئیسلامی و ئیسلامییە توندڕەوەکانی ئەم جیهانەش هەردوکیان جەخت لەسەر (لازم و ملزوم) بونی ئەم دوو چەمکە بەیەکەوە دەکەنەوەو پێیان وایە کە بە بێ یەکدی نایانکرێت.

واتە هەردوولایان عەلمانیەت بە پێش مەرجی بونی دیموکراسیەت دادەنێن، بەڵام لە ڕاستیدا ئەو پێشەکیەی ئەوان بینای بەرەنجامگیرییەکەی خۆیان لەسەر کردوە، پێشەکیەکی هەڵەیە، چونکە بەرئەنجامەکە لەسەر ئەو بناغەیە دیاری کراوە کە ئەزمونی مێژویی ئەوروپا پێمان دەڵێت، کە لە ئەوروپادا عەلمانیەت بناغەی فەلسەفی و مەعریفی و مەرجی سەرهەڵدانی دیموکراسیەت بوەو ئەمەش یاسایەکی گشتگیری جیهانییە!، واتە چۆن هاوشوێنی و هاوکاری هەیە لەسەرهەڵدانی عەلمانیەت و دیموکراسیدا ئاواش هاوچەمکی (تلازم المفهومین) هەیە؟ هەڵبەت ئیسلامییە توندڕەوەکان گرفتێکی تریان لە یەکسان کردنی واتای دیموکراسی بە عەلمانیەت لە خودی پێناسە گریکیەکەیدایە بۆ دیموکراسی، کە بە حوکمی گەل بۆ گەل پێناسە کراوە.

بەڵام لە ڕاستیدا واقعی جیهانی ئیسلامی لە واقعی مێژویی ئەوروپا جیاوازە، یەکسان کردنی ئیسلام بە کەنیسەی سەدەکانی ناوەڕاست و ئاینی مەسیحی لە بەرگی کەنیسەی پیرۆزدا ، کوفرێکی مەنهەجی و مەعریفی نەبێت هیچی تر نییە. بەڵکو لە دنیای ئیسلامدا ڕەنگە زۆر ماندوو بونمان نەوێت بۆ ئەوەی بیسەلمێنین بابەتەکە تەواو بە پێچەوانەوەیە، واتە عەلمانیەت و دیموکراسیەت_ بە واتا ڕۆژهەڵاتیەکەی عەلمانیەت_ زۆر کەم بەیەکەوە گونجاون چونکە ئیسلام پێکهێنەرێکی بنچینەیی شوناسی گەلانی موسڵمانەو ڕۆڵی زۆرە لە دیاری کردنی پێوەرەکان و ئاراستە پێدانەکانداو گرفتەکان لێرە جیاوازن.

لەناو گەلێکی موسڵمان و وڵاتێکی ئیسلامیدا بۆ ئەوەی ئەزمونێکی دیموکراسی بنیات بنێین، پێویستمان بە عەلمانیەت نییە، چونکە لە ئیسلام و فکری ئیسلامی خۆیدا، بناغە فەلسەفی و مەعریفیەکەی ئەو شێوازە لە عەلمانیەت کە مەرجی سەرکەوتنی دیموکراسیە ئامادەیە، کە ئەویش لە ڕۆشنی هەڵوێستی ئیسلامدا دەردەکەوێت، دەربارەی شەرعیەتی دەسەڵاتی سیاسی کە بە موڵکی نەتەوەی دەزانێت و پیرۆزی دادڕنینە لە دەسەڵات. واتە ئەو ئامانجەی کە عەلمانیەت لە دوای سەدەکانی ناوەڕاستەوە لە ئەوروپا خەباتی بۆ دەکرد کە بریتی یە لە جیا کردنەوەی دەسەڵاتی ئاینی لە دەسەڵاتی سیاسی و داڕنینی پیرۆزی لە دەسەڵات و دەوڵەت و فەرمانڕەوایان و ڕەتکردنەوەی شەرعیەتی ئاسمانی و خوایی بۆ دەسەڵات و گێڕانەوەی بۆ سەر زەمین و جەماوەر، هەموو ئەم ئامانجانەی کە عەلمانیەت لە خۆرئاوادا لە کایەی سیاسەتدا هەوڵی داوە بۆ بەدیهێنانی، ئیسلام هەر لە یەکەم ساتەوە لە ڕوی تیۆریەوە چارەسەری کردون. ئەمیش هەروەک ئاماژەمان پێکرد لە ڕێگەی داڕنینی پیرۆزی لە دەسەڵات و دەوڵەت و فەرمانڕەوایان، یەکەم خەلیفەی موسڵمانانیش لە یەکەم وتاری خۆیدا دوای بە دەستەوە گرتنی جڵەوی دەسەڵات بە جوانی ئەمەی دەربڕی کاتێک فەرموی: (انی ولیت امرکم ولست بخیرکم).

لە دیدی ئیسلامەوە دەسەڵات شەرعیەت لە هەڵبژاردن و جەماوەری خەڵکەوە وەردەگرێت، لەبەرئەوە هەر لەسەرەتاوە لە واقعی جیهانی ئیسلامیدا لە ڕوی سیاسیەوە گرفتێکی لەو جۆرەی ئەوروپامان نەبوە، تا شۆڕشێکی عەلمانیمان پێویست بێت و بێ ئەو شۆڕشەش نەتوانرێت باس لە دیموکراسی بکرێت.

واقعی نوێ و هاوچەرخی جیهانی ئیسلامیش لای خۆیەوە ئەم ڕاستیەمان بۆ دەخاتە ڕوو، چونکە لە دنیای ئیسلامدا بە پێچەوانەی ئەوروپاوە عەلمانیەت بەرئەنجامی شۆڕشێکی ئازادی خوازانە نەبوە، واتە ڕۆژێک لە ڕۆژان ئامانجێک نەبوە لە ناو ناخی کۆمەڵگاو جەماوەرو پێداویستیەکانیەوە هەڵقوڵا بێت و خەباتی بۆ کرا بێت، بەڵام بە پێچەوانەی ئەوەوە دیموکراسی بە بەردەوامی و

لە ئاستی جۆراو جۆردا هەست بە پێویستی و بایەخی زۆری کراوە، ئێستاش بوەتە داواکاریەکی هەمەلایەنەی زۆربەی تەوژمی کۆمەڵگاکان، چونکە گرفتی جیهانی ئیسلام لە کۆن و نوێدا لە کایەی سیاسەتدا گرفتی (استبداد) و تاکڕەوی بوە، نەک بونی دەسەڵاتی دینی.چارەسەری دەردی کوشندەی زۆرداری و تاکڕەویش بە دیموکراتیزە کردنی دەسەڵات و گێڕانەوەی شەرعیەت بۆ جەماوەر دەکرێت، هەر ئەوەشە بوەتە هۆی ئەوەی کە دیموکراسی ببێتە پێداویستیەکی هەنوکەیی یەکجار گرنگی کۆمەڵگا موسڵمان نشینەکان. ئێمە پێمان وایە عەلمانیەت چارەسەری واقعی وڵاتانی ناوچەکە ناکات، چونکە لەگەڵ بونی دەیان دەسەڵاتی عەلمانی بە درێژایی سەدەی بیستەم لە وڵاتانی ئیسلامیدا، ئەم عەلمانیەتە کە هەندێک جار مەشرەب چەپ و توندڕەویش بوە نەک هەر دیموکراسی لێ نەکەوتەوە – کە ئەمەش نەفی حەتمی بونی پەیوەندی نێوانیان دەگەیەنێت- بەڵکو بە پێچەوانەی ئەمەوە ئەم دەسەڵاتانە خراپترین نمونەی تاکڕەوی و (استبداد) یان بەرهەم هێنا کە مێژوی ناوچەکە زۆر کەم نەبێت شتی وای بە خۆوە نەبینیوە. عەلمانیەت لە جیهانی ئیسلامیدا لەبەرئەوەی پرۆژەی نوخبەیەک بوە و ویستویەتی لە ڕێگەی دەوڵەتەوە بیسەپێنێت، زۆر کەم نەبێت لەگەڵ دیموکراسی دا هەڵی نەکردوە. ئێستاش ئەگەر عەلمانیەت بە دارنینی پیرۆزی لە دەسەڵات و گێڕانەوەی شەرعیەتی ئەم دەسەڵاتە بۆ خەڵک و کۆمەڵگەی مەدەنی تێنەگەین و عەلمانیەت یەکسان بێت بە هەوڵدان بۆ ڕەتکردنەوەی ئەو بژاردە شارستانیانەی لەسەر بنچینەی ئیسلام دەخەمەڵێنرێن، یاخود هەوڵدان بێت بۆ پەراوێز خستنی ئیسلام، زۆر زەحمەتە ئەم تێگەیشتن و مۆدێلە لە عەلمانیەت بتوانێت بە بژاردەی دیموکراسی و گەڕانەوە بۆ لای کۆمەڵگا ڕازی بێت. بەڵکو گرفتی شەڕی دەوڵەت لەگەڵ کۆمەڵگا، کە دەیان ساڵە دەسەڵاتە عەلمانیەکان ئەنجامی دەدەن، هەر بەو شێوەیە بەردەوام دەبێت. ئەمەش گرفتێکی واقعیە چونکە هەروەک (د. فؤاد زەکەریا) کە یەکێکە لە عەلمانیە عەرەبیە (میسریەکان)، دەڵێت: (ئەمڕۆ داوای گەڕانەوە بۆ بەهاو پرنسیپە ئیسلامیەکان و پیادە کردنی لە ژیان و کۆمەڵگادا، بوەتە داوایەکی میللی و جەماوەری بەربڵاو)، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە ئەگەر (عەلمانیەت و دیموکراسی) بێ یەک نەیانکرێت و عەلمانیەتیش بە واتای دورخستنەوەی ئیسلام لە کایەی سیاسەت و بواری گشتی تێبگەین، دەبێت بەردەوام بژاردەی دیموکراسی بون دوابخەین، چونکە ئەگەر دیموکراسیەت گوزارشت بێت لە ئیرادەی جەماوەر و ئاراستەی گشتی کۆمەڵگا، وە ڕێز گرتن بێت لە زۆرینە لەگەڵ پاراستنی مافی کەمینە، بە پێداگرتن لەسەر عەلمانیەت مەرجەکانی پێگەیشتنی نایەتە دی، بەم جۆرەش ڕون دەبێتەوە کە (لازم و ملزوم) بونی ئەم دوو چەمکە نەک حەتمی نیە، بەڵکو پێداگرتن لەسەر عەلمانیەت بەو ناوەڕۆکەی باسمان کرد، تا ڕادەیەکی بەرچاو بەربەستە لەبەردەم دیموکراسیەت و گەشە کردنیدا، هەر نەبونی ئەم پەیوەندیە حەتمیەشە کە بوەتە هۆی ئەوەی کە ئەمڕۆ دیموکراسیەت و هەوڵدان بۆ بە دیموکراتیزە کردنی دەسەڵاتی سیاسی لە جیهانی ئیسلامیدا، ببێتە دروشم و داواکاری چەندین حیزب و ڕێکخراوی ئیسلامی.

## پێویست بونی دیموکراسی:

دیموکراسی لە ئەمڕۆدا بابەتێک نیە بۆ مێژو، بەڵکو پێش هەر شتێک پێویستیەکە لە پێویستیەکانی سەردەم تا ئەو ڕادەیەی بوەتە پایەیەکی پێویست بۆ مرۆڤی ئەم سەردەمە.

ئەو مرۆڤەی کە تەنها تاکێک نەماوە لە (رەعیەت) ێکدا، بەڵکو هاوڵاتیەکە کە لە ڕێگەی کۆمەڵێک مافی دیموکراسیەوە ناوەڕۆکی خۆی تەواو دەکات، کە لە



## هیچ ئاینێك بە ئەندازەی ئیسلام دڵخۆش نیە بە دیموکراسی، وە هیچ ڕژێمێکی ڕەوشتی و عەقیدەیی و یاسایی بە ئەندازەی ئیسلام ئەو بنەمایە دەستەبەر ناکات کە دیموکراسی لەسەر دەوەستێ و پێدەگات

پێش هەموویانەوە مافی هەڵبژاردنی فەرمانڕەواکان و چاودێری کردن و بەرکەنار کردنیان دێت.

سەرەڕای مافی ئازادی، ئازادی ڕادەربڕین و کۆبونەوەو دروست کردنی حیزب و سەندیکاو کۆمەڵەکان، مافی فێر بون و کارکردن، مافی یەکسانی لە دەرفەتی وەک یەکی سیاسی و ئابوری.

کەواتە میکانیزمەکانی دیموکراسی و ئیش کردن بەو میکانیزمانە، ئەو چوارچێوە پێویستەیە کە بەبێ ئەو، مرۆڤ ناتوانێت مومارەسەی مافی هاوڵاتی بونی خۆی بکات، وە فەرمانڕەواکانیش ئەو شەرعیەتەیان نابێت کە پاساوی فەرمانڕەوایەتیەکەیان بدەنەوە.

ئەمڕۆ هیچ جێگرەوەیەک لە بواری سیاسیدا بۆ شەرعیەتی دیموکراسی نییە، شەرعیەتی شۆڕشگێڕی کە هەمیشە بە بیانوی لە پێشتر بونی هەندێک ئامانجی تر دیموکراسیەتی دوا دەخست شکستی خواردوە، ئەمڕۆ دیموکراسیەت بوەتە مافێک کە کەس مافی ئەوەی نییە دوای بخات و هەڵیپەسێرێ، یاخود لە ژێر چاودێری خۆیدا دایبنێت. نابێت ئەمڕۆ هیچ ئامانجێکی دەوڵەت، لەسەرو مافەکانی مرۆڤ و هاوڵاتی بونەوە بێت، بەڵکو بە پێچەوانەوە دەبێت هەموو ئامانجەکانی تر لەمانەوە سەرچاوەی گرتبێت و خزمەتی ئەمان بکەن.

شەرعیەتی مێژوییش کە ئەم فەرمانڕەوا یاخود ئەو بانگەشەی بۆ بکات، لەم سەردەمەدا تواناى ئەوەی نییە خۆی پاساوی خۆی بداتەوە، تاکە شتێک کە یارمەتی بدات بۆ پاساو دانەوەی خۆی چونە ژێر شەرعیەتی دیموکراسی و خۆ گونجاندنە لەگەڵ بنەماکانی. ئەمە تاکە دەرفەتێکە بتوانێت لە ئێستادا واتای پێ بدات یاخود دەرفەتێکی لەبەردەمدا بکاتەوە بۆ بەردەوام بون.

دیموکراسی بۆ ئیدارە کردنی کۆمەڵگا هاوچەرخەکان گرنگە، چونکە کۆمەڵگا بریتیە لە چەندین پەیوەندی و بەرژەوەندی جیاوازی نێوان گروپ و توێژە جیاوازەکان کە پڕە لە ململانێ و کێبڕکێ.

دیموکراسیەت شێوازێکی ئاشتیخوازانەی ئیجابیە بۆ ڕێکخستنی عەقڵانیانەی پەیوەندیەکانی ناو کۆمەڵ و ململانێ ی نێوان مونافیسەکان، بۆ ڕێگرتن لەوەی بە شێوەی خوێناوی بتەقنەوە و ببنە مایەی وێرانی و قەیرانی قوڵ لە کۆمەڵگەدا.

دیموکراسیەت لەم دیدەوە بریتی یە لە چوارچێوەیەکی ئاشتیخوازانە بۆ چارەسەر کردنی ململانێکانی ناو کۆمەڵگا و ڕێکخستنی پەیوەندیەکانی، بە قازانجی پێشکەوتنی گەل و بەهرەمەند بونی هاوڵاتی بە مافەکانی. لە ڕاستیشدا یەکێک لە گرنگترین قەیرانەکانی کۆمەڵگاکانی ئێمە، بونی ناکۆکی و ململانێ ی جۆراو جۆرو نەبونی ڕۆشنبیری پێکەوە ژیانی ئاشتیخوازانەو دیالۆگە بۆ چارەسەری ئەو کێشانەو ئاراستەکردنی ئەو ململانێیانە بەشێوەیەکی تەریبی و ڕێکخستنیان لە چوارچێوەیەکی عەقڵانیدا، کە ببنە مایەی زیندوێتی کۆمەڵ نەک دوچار کردنی بە کێشەو لە دەستدانی وزەو تواناکان، جگە لەمە دیموکراسی لە وڵاتانی

ئیسلامی و وڵاتی ئێمەشدا لە چەندین ڕوی ترەوە گرنگە لەوانەش:

١- گەورەترین مەترسی مێژوویی و کۆسپی سەرەڕێی پێشکەوتنی سیاسی و ئابوری و کۆمەلایەتی لەم وڵاتانەدا (استبداد)ە، لەو سۆنگەشەوە کە دیموکراسی بەدیلی (استبداد) و (دیکتاتۆریەت) و (تاکڕەوی) یە، لێرەوە مەسەلەی دیموکراتیزەکردنی دەسەلات مەرجێکی بنەڕەتیە بۆ ڕزگار بوونی ئەم کۆمەڵگایانە لەو بازنە داخراوەی تێیکەوتون و ئەو قەیرانانەی بە دەستیەوە دەناڵێنن.

٢- چونکە بە بێ میکانیزمەکان و ڕۆشنبیری دیموکراسی، (شورا) وەک چەمک و بەهایەکی ڕەسەنی فەرهەنگی ئیسلامی هەروەک ڕابردوو بە هەڵواسراوی و کار پێنەکراوی دەمێنێتەوە. ڕۆڵی خۆی لە چارەسەری کێشەکاندا ناگێرێت.

٣- هیچ ئەزمونێکی ئیسلامی هاوچەرخ لە دەرەوەی (تبنی) کردنی بژاردەی دیموکراسی بەو ناوەڕۆکەی کە باسمان کرد، ناتوانێت نمونەیەکی زیندوو سەرنج ڕاکێش پێشکەش بکات و توانای پێشبڕکێی هەبێت لەسەر ئاستی جیهانیدا و دەرگا لەبەردەم گۆڕانێکی چۆنایەتیدا بکاتەوەو توانای ئەوەی هەبێت وەڵامی پێویست بە خواست و خەونەکانی گەلێکی موسڵمان بداتەوە.

٤- لەبەرئەوەی ئەمڕۆ دیموکراسی داواکاریەکی جیهانیەو یەکێکە لە سیماکانی ژیانی سەردەم و لەم وڵاتانەشدا زۆربەی هێز و تەوژمە سیاسی و فکریەکان بانگەشەی بۆ دەکەن. واتە بژاردەیەکە تا ڕادەیەکی زۆر کۆ دەنگیەکی میللی لەسەرە تەنانەت دەسەلاتە نادیموکراسیەکانیش هەوڵدەدەن لە ڕێگەی دەمامکی دیموکراسیەوە سیمای دزێوی خۆیان بشارنەوە.

٥- لەبەرئەوەی لە ڕوی عەمەلیەوە تاکو ئێستا جێگرەوەیەکی باشتری تر نییە، جێگای میکانیزم و ڕێ و شوێنەکانی دیموکراسی بگرێتەوە، ڕێگا بگرێت لەوەی دەوڵەتی هاوچەرخ ببێتە هەڕەشە بۆ سەر ژیان و مرۆڤ و کۆمەڵگا.

هەر بۆیە دیموکراسی بۆ وڵاتانی ئیسلامی دەوایە بۆ دەردە جۆراو جۆرەکانی.



## پەراوێزەکان:


١. النظم السياسية اسس التنظيم السياسي د. عبد الغني بسيوني.
٢. سياسة الحكم / وستن/ ترجمة الدكتور حسن علي ذنون
٣. التنظيم السياسية/ موريس ديفرجيه/ ترجمة أحمد حسين عباس
٤. التعددية السياسية في الدولة الاسلامية. الشيخ راشد الغنوشي.
٥. مستقبل الديموقراطية في العراق/ د. محمد عبد الجبار
٦. فتاوى معاصرة للدكتور يوسف القرضاوي.

# قەیرانەکانی دیموکراسی لە جیهانی ئیسلامیدا

## (قەیرانی ئاینی پێش دیموکراسی)





**مەسعود عەبدولخالق**

ساڵی ١٩٥٧ لە بناری قەرەچوغ لەدایکبوە. زانکۆی سلێمانی کۆلێژی زانست بەشی ماتماتیکی تەواو کردووە. لە ٢٠٠٦ بڕوانامەی ماجستێری لە بواری فەلسەفەی زانستە سیاسیەکان لەزانکۆی جیهانی بەریتانی تەواو کردووە. خاوەنی چواردە کتێب و چەندین توێژینەوەیە، خاوەن ئیمتیازی دەزگای ستاندەرە.

جیهانی ئیسلامی گوزارش لەو وولاتانە دەکات کە زۆرینەی دانیشتوانی موسولمانن، لەدابەشیەکانی جیهان زۆربەیان سەر بە وولاتانی تازە پێگەیشتوو (دول النامیة)ن، ئیستا دۆخەکە گۆڕاوە بەشیکی زۆریان پەڕینەوە،( لی کوان) کتیبیکی هەیە بەناوی (من العالم الثالث الی الاول-قصة سنغافورة ١٩٦٥-٢٠٠٠) تا سالی١٩٦٨ ئەو سنگافورەیە کۆنە چەکی ئیسرائیلی دەکڕیەوە، بەماوەیەکی کەم هاتنە ڕیزی جهانی یەکەم، ئەوەی هیشتا دواکەوتوە لەهەموو رووەکان وولاتانی عەرەبیە، هەروەک لە ڕاپۆرتی (تنمیەی عربی) و(پرۆژەکانی رۆژهەلاتی ناوەراست و راپۆرتی راند و زۆر لای تر واهاتوون)، کەمتریش لەگەڵ سیستەمی دیموکراسی دەگونجێن، وەک (معمر قزافی) بە نوکتە وەسفی دیموکراسی عەرەبی کرد(لە کۆنگرەی لوتکەی عربی ) ووتی: دیموکراسی لە دوو وشە پێکهاتووە، یەکەمیان یۆنانییە دیمۆس واتە (حوکم) دووەمیان(کراسی)عەرەبیە(کورسی حوکم)، کەواتە دیموکراسی مانای(حکم الکراسی)!! لە کوردستانیش شەڕ لەسەر دەسەلات دەکرێ کەچی هەموو لایەکیش بە خۆ دەڵێن دیموکراسی.

هۆکاری نەگونجانی عەرەب لەگەل دیموکراسی زۆرە، لە چوار تەوەردا کۆ دەبێتەوە: یەکەمیان خودی عەقلیەت وکەلتوری عەرەبی، دووەمیان پەیوەندیدارە بە فقهی ئاینی (نەک ئایین) ، سێیەمیان پەیوەندیدارە بەخودی سیستەمی دیموکراسی، چوارەم بە خودی رۆژئاواو ئیستعمارو بەو دیزاینە سیاسیەی رۆژهەلاتی ناوەراستە کە لەئەنجامی سایکس پیکۆو سیڤەر هاتە کایەوە.

## پاساوی دیموکراسی نەبوون

**ناسنامەی دیموکراسی**: زۆر بەشان وباڵی دیموکراسی هەڵدەدرێت، لەڕاستیدا لایەنی ئەرێنی هەیە ولایەنی نەرێنیشی هەیە، بەلام لەکۆتاییدا لەچاو بارودۆخی ئیستادا (احسن موجودە)، بەلام ناگاتە ئاستی (دەرمانی هەموو دەردانە) کە هەندێ بیریاری گەورەی کورد وایان وەسف کرد، ئەو ئەرێنی ونەرێنییەی لەسەرەتاوە لەگەڵ بووە، هەر خودی خۆی لە دیمۆس مانای (ناس) لەگەڵ گوندنشینیەکان بووە، لەسەدەی (٥ پ، ز) چەمکی دیمۆس گۆڕا بۆ ئەو هەموو خەڵکەی بەکاری حکومەت خەریکن (واتە گوندی وشاری)، لەسەدەی( ٥٠٩پ، ز) گوندییەکان دەستیان بەسەر حوکمی ئەسینا داگرت وناوی دیموکراتی جاریکی تر هاتە کایەوە (چونکە پیشوو تر بەمانای تر دیموکراسی عەجەمی هەبوو – باسی دەکەین) بەمانای حوکمی گوندی ودەشتەکی، لەسەدەی (٥پ، ز) چەمکی دیمۆس گۆڕا بۆ ئەو هەموو خەڵکەی بەکاری حکومەت خەریکن (واتە گوندی وشاری)، دوای نازناوی فەرمانڕەوایی گەلی پێدرا، یان وەک ئەو وەسفەی سەرۆکی ئەمریکی (ابراهام لنکۆلن)یشی پێ دەدرێ (دەسەلاتی گەل لە پێناو گەل)، لەمادەی (٢)ی دەستوری فرنسی ناوی حکومەت بە (حکومەتی گەل ولەپێناو گەل) هاتووە.

سەردەمی واش هەبووە زیاتر دەسەلاتە لاوازەکان پیادەی دیموکراسیان کردووە، بۆیە زۆرجار لە مێژوودا دیموکرسی مانای دەسەلاتی لاوازی داوە، بە پێی چەندین سەرچاوە لە یۆنانی کۆن لە سەدەی (٦- پ- ز) نموونەی بەکارهێنانی هەبووە، بەلام لە (Amodern Dictionary Political Analiysis) دەڵێ لە سەدەی (٤ پ. ز) بووە نەک ٦( پ- ز)، لەو کاتی لە شارۆچکەیەکی بچووک هاوولاتیان کۆدەبوونەوە بۆ بڕیار دروستکردن، بە پێی (جمهوریة أفلاتون) شارێک بریتی بووە لە هەرێمی دەوڵەتێک، بەلام دەبێ ئەوەش بزانین لەو کاتەدا مانای هاوولاتی تەنیا چینەکانی سەروو وماقوڵەکانی دەگرتەوە، چینەکانی هەژارو بەندە و ئافرەت وغەوارە و رەگەزە بێ هێزەکانی نەدەگرتەوە، کەمایەتییەکی دەگرتەوە بە پێی زۆربەی سەرچاوەکان ژمارە ی

دانیشتوانی ئەوسای(ئەسینا) ۳۰۰۰۰ کەس بووە، بە پێی مانای ئۆرستکراتی بۆ هاوولاَتی تەنها ۳۰۰۰ لەو دانیشتوانە دیموکراسی گرتوونیەتەوە کە زانایانی ئەو سەردەمە بە تایبەتی (ئەفلاتون) داوای بۆ کردووە، لە هەندێ سەرچاوەی تر دەڵێت: ژمارەی دانیشتوانی ٤٠ هەزاربووە، ۲٥ هەزاری بەندە بووە، ئەوانەشی نەدەگرتەوە، تا ئەودواییەش ئەو بنەمایە لە لایەن ڕۆژئاوا پەیرەو دەکرا، لە کاتی داگیرکردنی کوردستان لە لایەن بەریتانیاوە لە کاتی ڕاپرسیەکەی سەبارەت بە لکاندنی کوردستان بە ئێراقەوە، ڕاپرسیەکە تەنها ئەوانەی دەگرتەوە کە زیاترلە ۲۰۰۰روپییەیان هەیە و تەنها شمولی۲۰۰ کەسی کرد لە سلێمانی.

**ئەسلی دیموکراسی وپەیوەندی بەئایینەوە:** لەم سەردەمەدا بەخۆڕایی لایەنی سیکولار دیموکراسی کردۆتە موڵکی خۆی، ڕۆژئاواش بەکەلتوری خۆی دەزانێ، لای ئاینپەروەرانیش بەنامۆی سەیریدەکەن، ئەو دۆخە بووەتە پاساوێکی چاک بۆ دیکتاتۆریەت لەجیهانی ئیسلامی و دوورکەوتنەوە لەدیموکراسی، لەکاتێکدا سەربردەی دیموکراسی جۆریکی ترە :

نە ئەوپێناسەیە تەواو ڕاستە کەدەڵێن: لەحوکمی گەلەوە هاتوە، نە زادەی کەلتوری ڕۆژئاواو یۆنانیشە، هەریەکە لە(هیرۆدۆس)، (ئەرستۆ)، (ئەفلاتون).. لە بارەی ئەسلی دیموکراسیان نووسیوە، بەپێی(هیرۆدۆتس- کەلە کتێبە مێژووییەکەی نەقل کراوە) لە(٥٢٢پ، ز) دیموکراسی لە عەجەم وەرگیراوە، لەدوای ئەوەی فارس ناوچەکانی یۆنانی داگیر کردووە، حەوت زانای فارسی سێ جۆر حوکم باس دەکەن بۆ ئەو ناوچانەی ژێر دەستیان ، لەکۆتایی دا لەسەر پیشنیاری (ئۆتانۆس) شێوەی (ئیزۆنومیا) هەڵدەبژێرن بەمانای (یەکسانی لەبەردەم یاسا)، پرسی سەروەری یاساو یەکسانی لەبەردەم یاساو شەریعەت تەنهاو بەتەنها فکری ئایینیە، ئەگینا فکری بەشەری و حوکمەکانی کۆن هەردەم یاسا بۆهەژارو بێکەس جیابووە لەگەڵ دەوڵەمەندو ئەشراف وئەرستۆکراسیەکان، هەربۆیەش دیموکراسی بەحوکمی لاوازەکان پۆلین کراوە، لەمێژوودا دوو ناو وەک باوکی دیموکراسی دێت(کلیسجنیز) لە (٥٠٧ پ، ز) (بروانە: موسوعة البريطانية) بە سەلبی ناوی هاتوە ،ناوی دوەم ئەمبادیقلس بە باوکی دیموکراسی دیاری کراوە (بە ئیجابی)، ئەویش قوتابی (ح.داود) بوە، ئەوەش بە ڕوونی مانای مولکی ئاینی دەدا، بۆیە: لە مێژوودا ئەوانەی دژی بنەمای ئایینی و دیموکراسی و میللەت بوون زۆربەیان مولحیدوستۆیلی بوون، یەکەم زانا کە هەوڵی جیاکردنەوەی ئایین و سیاسەتی داوە سینکا(٤-٦٥م) فەیلەسوفی مولحیدی ڕۆم بووە، بەهەمان شێوە فەیلەسوفی یۆنانی کۆن (هرکلیت) هەم مولحید بووە هەم دژبە بنەمای ئازادی و دیموکراسی بوە، زیاتر لایەنگیری دەسەلاَتی ستەمکار بوون، لەوانەش زینۆن (۳۰۰ پ.ز) بۆ پاپای ئەسینا، مارکۆس ئۆلیتۆس وئیکتیپۆس (٦٠-١٢٠) بە نۆکەری ئیمپراتۆر بە ناوبانگ بوو.. ئەوانە بە (ستۆیلی- ماستاوچی)ناوزەد دەکران، بە هەمان شێوە ئەرستۆ هۆبز و وماکیاڤیلی.. ، ئەرستۆ لە خزمەت داگیرکەرێکی وەک فیلیپی مەقدونی بووە، دوایش بووە فەیلەسوفی ڕەسمی ئیمپراتۆریەت ومامۆستای ئەسکەندەری مەقدۆنی مونەزیری دەوڵەتی بەندایەتی بوو، دژی دیموکراسیش بوو بە پەڕەگری وەسف دەکرد (دیموکراسي پەڕەگر- Democrasy EXTREME) (بروانە: ثرۆفیسۆر زكريا بشير امام – التنوير والحضارة ص٥٣)، سینکای دوەم مامۆستای نیرۆنی زۆردار بوو، میکاڤیلی بۆ بنەماڵەی حوکومداری مدیتچی وئاواش لاپلاس وهۆبز و... ، زانای هۆڵەندی هۆگۆ گرۆتیۆس (١٥٨٣-١٦٤٥)بە دامەزرێنەری یاسای دەولی وسیستەمی عەلمانی هەژمار دەکرێ کەچی لایەنگری کۆیلەداری بووە.

**نەرێنیەکانی دیموکراسی:** ئەگەر دیموکراسی بگەڕێنینەوە سەر ئەسڵە ئایینیەکەی کە بریتیە لە یەکسانی بەرامبەر یاسا زۆر ئەرێنیە، بەلاَم کە بیری مرۆڤ دەیەوێ گەشەی پێبکا ئیجابیانە هەڵبەتە سەلبیاتیشی تێدەکەوێت، دیموکراسیش



## له كاتی داگیرکردنی کوردستان له لایەن بەریتانیاوە له ڕاپرسیەکەی سەبارەت بە لکاندنی کوردستان بە ئێراقەوە، ڕاپرسیەکە تەنها ئەوانەی دەگرتەوە کە زیاترله 2000ڕوپیەیان هەیە و تەنها شمولی200 کەسی کرد لە سلێمانی.

ئەو دەرمانەی هەموو دەردان نییە وەک هەندێ لایەنی کوردستان دیسان لە بەرنامەکانیان وەک مارکسیایەتیەکەیان بەپەلە تۆماریان کردەوە و دەڵێن: دیمکراسی دەرمانی هەموو دەردێکە (بڕوانە ووتاری مام جلال : ڕاپۆرتی سیاسی کۆنگرەی یەکەمی ی ن ک)، ئیتر ئەگەر دیموکراسی پڕ بە بالای خۆی پەیرەو کرا واتە میللەت سەرچاوەی دەسەلاتیش بێت ئەوا ئەو سەلبیە سەرەکیانەی هەیە کە هەریەکەیان دەبنە سەرچاوەی چەندین لقی تری سەلبیات، وا هەندێکیان لێ هەڵدەبژیرین:

١- زۆرجار بووە و هەمیشە میللەت یەک ڕابوون، کەچی هەڵەبوون، کەواتە زۆرایەتی پێوەری ڕاستی و دروستی ودادگەری نییە.

٢- زیاتر لەوەش هەردوو توێژینەوەی ئایینی و زانستی کۆکن کە ڕای گشتی عەوامی خەلک بەشی هەرە زۆری بەهەلەدا چووە، زیاتر ئەو بابەتانە دەگەڕێتەوە بۆ پسپۆڕی، خۆ ئەگەر١٠٠ ئەندازیار ڕایان وابوو نەخۆشێک عەمەلیات نەکرێ و یەک پزیشک ڕای پێچەوانە بوو ڕای پزیشکەکە وەردەگیرێ.

٣- بەو شێوەیە دەنگی زاناو نەزان پسپۆڕو نا پسپۆڕی وەک یەکە لە دیموکراسیدا.

٤- لە زۆربەی دۆخەکان ئەو نوێنەرانەی هەڵیان دەبژێرین ئوتۆماتیکیانە دەبنە نوێنەری بەرژەوەندی خۆیان و دەوڵەمەندان، بۆیە لەو سیستەمە هەژاریەکی زۆر و کەمایەتیەکیش خۆش گوزەران دەبن.

٥- هەرچەندە شێوازی دەوڵەتی نیشتمانی وسیستەمی دیموکراسی تا ڕادەیەکی چاک کێشەی فرە پێکهاتەی چارەسەر کردووە، بەڵام هیشتا هەموو کێشە سەرکییەکانی جیهان و ناوەخۆش، چ تاک چ بە کۆمەڵ بە دیموکراسی چارەسەر نابێت، هەتا کێشەی نەتەوایەتی پێ چارەسەر نابێت کە گوایە تاکە چارەسەریەتی، ئەوەتا لە ولاتانی دیموکراسیش کێشەی نەتەوایەتی بە گەرمی لە ئارادایە وەک: (کشمیر- هند)، (کوردستان- تورکیا)، (فەڵەستین – ئیسرائیل)، (ئیرلەندا- بەریتانیا)، (کۆرسیکا – فرنسا)، (باسک – ئیسپانیا)، (سریلانکا- تامیل)....، (زۆربەی ولاتانی هەردوو ئەمەریکا و- گەلانی ڕەسەنەکەی)، (ئوستراليا- بورجوانیەکان).....، لەو کەموکورتیانەوە سیستەمی دیموکراسی تەوافوقی سەری هەڵدا، ئیتر لەوەوە زیاتر لە ٨٠ ساڵ دروشمی بزوتنەوەی کوردی(دیموکراسی بۆ عێراق وئۆتۆنۆمی بۆکوردستان) هەڵە دەرچوو ..

٦- ڕۆسۆ دەلیت ئەو دیموکراسییە (٪١٠٠) پەیرەونەکراوەو ناشکرێت، ئێستا بە مانای (دەسەلاتی گەل) هەر نەماوە، مەگەر دیموکراسییە گاڵتەجاڕیەکەی لیبیای معمر قەزافی، دیموکراسی ئەسینی بووە یۆتۆپیا.

لەگەڵ زۆر سەلبیاتی تر .. سەرەڕای هەموو ئەمانە باشترین ئەزموونی بەشەریەو ئەو کاتەی بەدیلەکەی دیکتاتۆریەتە.

**لیکدانەوەی ئایینپەروەران بۆ دیموکراسی**

**(خزمەتە بەدیکتاتۆری ودوور کەوتنەوە لەدیموکراسی)**

لە دوا لیکدانەوەی ئەوجۆرە ئیسلامییەی دژی دیموکراسییە، دەبینی لیبراڵ دیموکراسی و دیموکراسی تێکەڵ کردووە، بۆیە هەریەکە بە جۆرێک دیموکراسی بە ڕێبازێکی کۆمەڵایەتی و سیاسی لە قەڵەم داوە و ناوی وەک: (أسلوب الحیاة، دین المعاصر، عقیدة الدیموقراطیة، .....) داوەتە پاڵ، هەموو ئەو ناوو هاوەڵناوانەش هەڵەن.... ئەو وەسفانە دەشێ لیبراڵ دیموکراسی بن، بەڵام دیموکراسی ئەو سیفەتانەی نییە، بە تایبەتی دیموکراسی ئێستا مانا ڕەسەنەکەشی گۆڕاوە وەک لە پێشوو باسکرا، زیاتر مانای (دەست گۆڕی دەسەلات، ئازادی بیرورا، هەقی معارەزەیی، سەروەری یاسا بۆ گشت، ..) هەموو ئەو ئیجابیانە بە جۆرێک لە جۆرەکان لە پەیامە ئاسمانییەکاندا هەیە، ئەو دۆخە بۆ هەردوو جۆری دیموکراسییەکە ڕاستە چ ئەسینیەکە (ڕاستەوخۆیەکە) چ گۆڕاوەکە (ناڕاستەوخۆیەکە)، هەندێ تەوەر هەڵدەبژێرین:

١- دیموکراسی و پەرلەمان، پەرلەمانیش خۆی ناوێکە حوکمەکەی ئەکەوێتە سەر ناوەرۆکەکەی، هەر ئەو پەرلەمانە بوو لە ٣/٣ /١٩٢٤ خیلافەتی ئیسلامی هەڵوەشاندەوەو هەم ئیسلامی قەدەغەکردو هەم کوردیشی قڕ کرد، هەمان ئەو پەرلەمانەش بووە لە ساڵانی ١٩٩٩ بۆ ٢٠٠٠ سێ ویلایەتی نایجیریای لە عەلمانیەوە گۆڕی بۆ شەریعەتی ئیسلامی، هەمان پەرلەمان مۆڵەتی جەنگەکانی جیهانی و سیستەمی ئیمپریالیزمی داوە، کەواتە دیموکراسی و پەرلەمان چاکەو خراپە، ڕەش وسپی هەڵدێنی، شیوعیەت ولیبرالیەتی لێ بەرهەم دێت، سوشیالیستی وئیسلام دەدا، فاشی ودادگەریش دروست دەکا.. خۆشی نە ڕەشەو نە سپی، نەچاک ونە خراب، نەئیسلامییە نەلیبرالیش، بەڵکوو وەسفی دەکەویتە سەر بەکارهینەرەکانی. خەریکە بڵێین ساڵی یەک ڕۆژ دیموکراسییە باقیەکەی تر مەدرەسەی براوەی دیموکراسییە نەک خودی دیموکراسیەکە. ووردتر لەوبارەیەوە (لیون برادەر) لەکتیبی ((political ideology)) وە (جاک لیڤی)ش لەکتیبی (democracy) زوری تریش وەسفی دیمکراسی بەبێ لایەن وبێ ئایدیولوژیا و...دەکەن، بۆیە تارادەیەک ناونانی حزب وحکومەتێک بە (پارتی دیموکراتی) هەڵەیە.

٢- دیموکراسی ئێستا مانای (دەسەڵاتی گەل) نییە، زیاتر مانای دەستگۆڕی دەسەلاتە، لە تەقەلایەکی تاقانەدا بۆ تەواو پەیڕەوکردنی دیموکراسی لە لیبیا ( بە پێی یاسای ژمارە ٧١: حزبایەتی قەدەغەیە) (پەرلەمان) (هەڵبژاردن) بە خیانەت لەقەڵەم دراو لەجیاتی (امانات شعبیة) وەک (تشریع) و (لجان شعبیة)ش (تنفیذ) دانران.. گوایە ئەوە ڕاستەوخۆ (حوکمی گەلە) سەرۆک کۆماری نییە، (معمر قذافی) ڕابەری شۆڕش بوو نەک سەرۆک، کەچی لە کۆتاییدا هەر کەمایەتییەک نوێنەرن و هەر شێوازێکی ترە لە (پەرلەمان+ حکومەت+ مجالس البلدیات) و سەرباری دەردێکی تری کوشندەی نەگۆڕینی سەرۆک کە بەڕای زۆربەی لێکۆڵەرەوەکان داهێنانێکی ترە لە دیکتاتۆریەت.

٣-هەر وڵات و هەر شارستانییەک بە جۆرێک دیموکراسی بۆ خۆی سوڕاندووە هێناویەتە سەر واقعی میللەتەکەی، بۆیە دیموکراسی ئەمەریکا لەگەڵ ڕووسیا جیاوازە، فەرنسا لەگەڵ بریتانیا حودایە ..هەموو لەگەڵ هەموو جیان ..

## دیموکراسی و قەیرانی عەقڵی لە جیهانی ئیسلامی

لەبنەچەدا ئایین بەگشتی واهاتووە کە پیشڕەو بێت، ئیستاش بەڕوونی دیارە جیهانی ئیسلامی کەوتۆتە دوا کاروانی گەشە، بەتایبەتی ووڵاتانی عەرەبی، کاتێ ئەو پرسە درێژە دەکێشێ لە دۆخەوەو دەپەڕێتەوە بۆ دیاردەو ئاسایی بوون، ئەوکاتەش کە عەقڵی موسولمان تەسلیمی ئەو واقیعە دەبێت و

هەست بەوە ناکات کە دواکەوتووە دەبێتە قەیران (یان بە زاراوەی ئایینی دەبێتە جەهلی مرەکەب)، چەندین تویژینەوەو کتیب بەو سەردێرە نوسراوە لەوانە: (بنية العقل العربي –محمد عابد الجابري) ،(ازمة المثقفين العرب- عبدالله عروی) ،(فی نقد الفكر العربی-علی المخلسی) ،(ازمة العقل العربی –محمد الفزاوي) (اغتيال العقل: محنة الثقافة العربية بين السلفية والتبعية –برهان غليون)، (مساهمة فی حل ازمة العقل العربی المسلم- طه ابراهيم) ،(ازمة العقل العربی المعاصر-د. قاسم حسين صالح) (ازمة العقل العربی- د.حامد خليل)، لەهەمووان ترسناکتر لە راپۆرتی سالی ٢٠١٣ (intelligence Quotient) دا دەڵێت: وولاتانی عەرەبی لە (معدل الذكاء) لەپاش هەموو جیهانن، تا رۆ بچینە ناو مەڵبەندی عەرەبی (کە کەنداوە) دەبینین ئەو قەیرانە زیاد دەکات، هەر لەو راپۆرتە وولاتانی کەنداو(قەتەر بەتایبەتی)زۆر لەپاشن،عێراق(بەو لەنگیەوە) لە پێشەوەی وولاتانی عەرەبییە، روون دیارە عێراق بەتەواوی لە ژینگەی عەرەبی نییە، کەچی قەتەر بەتەواوی لەناو ئەو ژینگەیە .. ئەوەی زۆر جێی سەرنجە لەو رێسایە کە دەگوترێ پاشکۆیی ئابووری دەبێتە هۆی پاشکۆی سیاسیش، کەچی جیهانی عەرەبی داهاتێکی زۆری ئابووریشی هەیە لە پرۆژەی (فەرنسی- ئەلمانی) هاوبەش، بە راشکاوانە تر دەڵێن وولاتانی رۆژهەلاتی ناوەراست بە ماڵێکی زۆرو عەقڵێکی کەم کار دەکەن، خۆشیان تەسلیم بوون، ئەوەتا لە سەرەتای سەدەی بیستەم رازی بوون بە سیستەمی ئینتداب و ئەو واقیعە سیاسی ویاساییەی عەرەبی ئێستا بەرهەمی ئینتدابە، رازی بوون بە ئینتداب مانای رازی بوونە بەوەی میللەتی بەریتانیاو فەرنسا مامۆستا بێت وعەرەبیش قوتابی، کە لەبنەمای ملتۆن بە ئاشکرا دەڵیت :(لا تدع بريطانيا تنسی رسالتها فی تعليم الامم كيف تعيش) لەکاتی دروست کردنیان لۆرانس ئەوەی ئاشکرا کردو ووتی بەشێوەیەک وولاتانی عەرەبی دروست دەکەین کە نرخی سەنتەکێیان نەبێت ، ئینجا بەیاساییش کرا، لە پەرەگرافی (٤) ودیباجەی ماددەی (٢٢)ی میساقی کۆمەڵەی نەتەوەکان(عصبة الامم) وەسفیان دەکات و دەڵێت: میللەتی شارستانی میللەتانی دواکەوتە فێری ئۆتۆنۆمی بکا تادەگاتە ئاستی دەوڵەت، جا ئەگەر ئەوە بارودۆخی عەقڵی عەرەبی بێت، دەبێت بارودۆخی عەقڵی ئەو میللەتە موسوڵمانانە چۆن بیت کە لەژێرکاریگەری کەلتوری عەرەبین و وادەزانن دەبێت ئایین لەوان وەرگیرێ، وەک لەکوردستانیش هەندی عەقڵ وا بیردەکاتەوەو لێیان بووەتە قەیرانی ئاوێتە.

لەلایەکی تریشەوە دەبێ ئەوە راست بکەینەوە کە ئایین نابێتە هۆی دواکەوتن وقەیران بۆ هیچ میللەتێک بەلکو فقهی ئایینیە بەناوی ئەوەی (تعمق) لە ئایین باش نییە، عەقڵانیەت لە ئاین لات دەدا، فەلسەفەو فکر تێکت دەدا، داخستنی دەرگای ئیجتهاد بە هۆی(السلف لم يترك للخلف شيئا).. ئەوانە هەموو دورکەوتنەوەیە لە ئەسڵی پەیامی مرۆڤ لەلایەن پەروەردگاری(کەبەرپاکردنی شارستانی) یە، هەندێ فەقیهو ئیمام هۆکارن بۆ دروست بوونی قەیرانی عەقڵی عەرەبی وجیهانی ئیسلامی، ئەگەر چی ئەو مەبەستەشیان نەبووبێت، بەتایبەتی پرسی (فەزلی عەرەب)، گەلێ زۆرن بەڵام زیاتر ئەوانەی خوارەوە توند تر بوون: ئیمامی ( شافعی، احمد، مالك، ابن تيميه، ابوقاسم زمشخری ، حافظ العراقی، إمام الهيثمی، إسحاق بن إبراهيم،عبد الله بن الزبير الحميدی، سعيد بن منصور جاحيز و...زۆری تر)، (ابن قتيبه ) لە کتیبی ( فضل العرب والتنبيه علی علومها)، إمام العراقی (محجة القرب فی فضل العرب) مرعی الكرمی ( مسبوک الذهب فی فضل العرب)، الشيخ بكر أبو زيد ( خصائص جزيرة العرب) ...زۆربەی ئەوانە دەیان ووت: پێویستە قسە بە عەرەبی بکریت بۆ عەقڵ باش ترە، لەوبارەیەوە ئیمام ئیبن تەیمیە دەڵێت: (وإنما الطريق الحسن: اعتياد الخطاب بالعربية، حتى يتلقنها الصغار فی الدور والمكاتب، هەروەها دەڵێت: (فغلب على العرب القوة العقلية النطقية، .. ولهذا كانت العرب أفضل الامم)، زۆر بە توندی دژی (ابن سينا)وەستاوە

بەگەمژەی وەسف کردوە چونکە ووتویەتی خوا هیچ میللەتێکی لە میللەتێکی تر زیرەک تر دروست نەکردووە، دەڵێت: (... كما أن جنس العرب يستحق من المحبة والموالاة ما لا يستحقه سائر اجناس بنى ادم.) ئیمام یوسف الحنبلی لە کتێبی(مسبوك الذهب، فى فضل العرب) بە تەرازوویەکی تر پۆلێنی میللەتان دەکات و دەڵێت: (أن جنس العرب أفضل من جنس العجم، كما إن جنس الرجل أفضل من جنس المرأة من حيث الطائفة والعموم) ، ئەو تەوەرە زیرەکی وعاقڵیەکی بێماندووبوون بە عەرەب دەدا، بۆ ئەوەی بەبیرکردنەوەو داهێنان خەریک نەبن، ئیتر دەبیتە سەرچاوەی دواکەوتن، لەو تەوەرەی داهاتووش بەرگریان دەکوژێ بەوەی گوایە دژایەتیان کوفرە (بغض جنس العرب ومعاداتهم كفر... وأن محبتهم سبب قوة الإيمان) بۆیە خۆشیان بۆ بەرگری ئامادە نەکرد، بزانە چۆن ئەو زنجیرە وەسفە بۆیان دەبێتە قەیران، لەسەر ئەو بنچینە (أبو القاسم محمود الزمخشرى) دەڵێت: چەندە بەختەوەرم خوایە بە عەرەبت دروست کردووم (اللهَ أحمدُ على أن جعلنى من علماء العربية، وجبلنى على الغضب للعرب والعصبية، وأبى لى أن أنفرد عن صميم أنصارهم وأمتاز، وأنضوى إلى لفيف الشعوبية وأنحاز، وعصمنى من مذهبهم الذى لم يُجْدِ عليهم إلا الرشقَ بألسنة اللاعنينَ، والمَشْقَ بأَسِنَّة الطاعنين) ، دوای ئەوانە هەنگاوێکی تر دەنێن، عەقڵی عەرەبی لە خۆبایی دەکەن ودەڵێن ئەو فەزڵ وزیرەکییە لەبەر ئایین وپیغمبەر نییە، هەر خودا بەتایبەت بە عەرەبی داوە: (واعلم أنَّهُ ليسَ فَضلُ العَرَبِ بمجردِ كَوْنِ النبى (ص) مِنْهُمْ كما يُتَوهمُ -وإنْ كانَ هوّ عليه السلام قد زَادَهُمْ فضلاً وشرفاً بلا ريب- بل هُمْ فى أنْفُسِهِمْ أفْضَلُ وَأشرفُ وأكْمَلُ) . دەشڵێن (تفضيل العروبة إنما هو اختيار من الله تعالى)، لەوانەوە (امة عربية واحدة ذات رسالة خالدة)هاتووە، لە (الميثاق العربى لحقوق الإنسان ٢٠٠٤)وەسفی (ئومەی عەرەبی) وادەکات: (انطلاقاً من إيمان الأمة العربية بكرامة الإنسان الذى اعزه الله منذ بدء الخليقة)، خاوەنی کتێبی (العروبة بين الشعوبية الإستعمار) دەڵێت: خواش بۆ پیادەکردنی پەیامەکانی پێویستی بە عەرەب هەبووە، ئەو جۆرە بیرکرنەوە بووەتە سەرچاوەی وەستانی عەقڵی عەرەبی ودواکەوتنی و دروست بوونی قەیرانی عەقڵی و نەگونجان لەگەل ئایین پیش ئەوەی نەگونجێن لەگەڵ دیموکراسی، لەکاتێکا دەقی ئایینی بە روونی دژی هەموو ئەو تەقەلا خواروخێچانە هاتووە: (..ان اكرمكم عند الله أتقاكم)، (لا فضل لعربى على أعجمى ولا أبيض على اسود..).

**زانیاری وداتا بۆقەیرانەکانیان:** تا رادەیەکی زۆر جیهانی ئیسلامی خۆی لەو وەسفانە رزگارکردوەو هەریەکەو بەجۆریک وادیموکراسی پەیرەو دەکات، ئەو راپۆرت وتویژینەوانە زیاتر وا روو لەعەرەبە، لە راپۆرتێکی (بەرێوەبەری نەخشەی سیاسی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکی) لە ژێر ناوی (نحو ديمقراطية شاملة فى العالم الإسلامي ٢٠٠٣) دەڵێت: جگە لە(ئیسرائیل) باقی وولاتی عەرەبی بە دیکتاتۆریەتێکی زۆر تاریک وەسف دەکات، زۆر دوورن لەدیموکراسی، لەراپۆرتی (التنمية الإنسانية العربية)شدا هاتووە: کەمترین ئازادی لە جیهان بۆ وولاتانی عەرەبی دەگەرێتەوە، بەڵکو زۆربەی وولاتانیان لە پۆلی (الدولة الفاشلة) ومیللەتەکەش بە لاوازو سست وبێ ئیرادە پۆلێن کراوە.. هەر لە راپۆرتەکانی (چاکسازی رۆژهەلاتی ناوەراست)دا هاتووە: ١٤ملیۆن بێ ئیش وکار وبرسی هەیە، بە پێی راپۆرتی (التنمية البشرية لعام ٢٠٠٢) دەکاتە٤٠٪، بۆ ساڵی٢٠٢٠ نزیکەی ١٠٠ملیۆن ئامادە دەبێ بۆ کار کەچی دەوڵەت دەتوانێ ٦ملیۆن وەرگرێ، جگە لەنەوت تەنها ١٪ی بازاری جیهانی کەل وپەلی رۆژهەلاتی ناوەراستی تیدایە، تەنانەت قەبارەی ئاڵ و گۆری بازرگانی لە نێوەخۆیان کەمترە لە ٦٪، ٢٦٠ ملیۆن عەرەب بە ئەندازەی ٤٠ ملیۆن ئیسپانی بەرهەمیان نییە، ٣٪ ی ئافرەتان دەتوانن کار بکەن، ونیوەی ئافرەتانیان

نەخوێندەوارە، بە پێی راپۆرتی (التنمية البشرية) سەرجەم ٥١٪ی عەرەب دەیەوێ کۆچ بکا.

لەراپۆرتە نهێنیەکان بەئاشکرا ناوی عەرەب دێت بۆ ئەو قەیرانە، ئەگەرچی وەک رێژێک بۆ عەرەب جاری وا هەیە لەجیاتی عەرەب ناوی رۆژهەڵاتی ناوەراست و سەرووی ئەفریقا دێت، یان بەجیهانی ئیسلامیش ناوزەد دەکەن، لە (تقرير راند- ديسمبر ٢٠٠٤م)لەژێرناونیشانی (العالم الإسلامي بعد ١١ سبتمبر): يشكل العرب حوالي ٢٠٪ من مسلمي العالم، والعالم العربي يتصف بمعدلات أعلى للاضطرابات الاقتصادية والاجتماعية والسياسية من المناطق الاخرى، وبالمقارنة، المسلمون غير العرب يتمتعون بقدر أفضل من الديمقراطية من الناحية السياسية .... اذ إن الفكر الاكثر ابتكاراً وتطوراً حول الإسلام يوجد في مناطق تقع خارج العالم العربي.،، تا لە (Webster Dictionary)دا وای لیهاتووە ووشەی عەرەب مانای هەڵبژاردنی ساختەو دژبەدیموکراسی دەدا، هەربۆیەش ئەو هەموو پرۆژە چاکسازیە جیهانەیەی بۆ دەرچووە، لەوانە: پرۆژەی ئەورووپی بۆ چاکسازی رۆژهەڵاتی ناوەراست (کۆنگرەی برشلۆنە ١٩٩٥)، پرۆژەی( مبادرة الشراكة كۆلن پاول /امريكا ١٢ديسمبر٢٠٠٢)، پرۆژەی ( رۆژهەڵاتی ناوەراستی گەورەی ئەمریکی لە ٢٠٠٤)، پرۆژەی (المبادرة الالمانية)، رۆژهەڵاتی ناوەراستی تازە ٢٠٠٤ز، رۆژهەڵاتی ناوەراستی فراوان ئەلمانیا و فەرەنسا ٢٠٠٤ ز، پرۆژەی ئیسرائیل (شمعون بيرس- الشرق الاوسط الجديد)، لە(مبادرة كولن باول)دا هاتووە: رۆژهەڵاتی ناوەراست خاوەنی رەسەنی زانست وهونەرو شارستانێن کەچی ئێستا میللەتانی ئەو ناوچە هەژارن لە زانستی سیاسی وئازادی وئابوری ،،، حکومەتەکانیشیان بریتین لە دیکتاتۆرو نادیموکراسی، ١٠ ملیۆن منداڵ و نیوەی ئافرەتانیان نەخوێندەوارە، سەرجەم ٦٥ ملیۆن نەخوێندەواری لێیە. تێکرای قەیرانەکان لەکتێبی( حتمية التغير –في الشرق الاوسط) واهاتووە:١-الحروب. ٢- التوتر بين العالم العربي والعالم المتحضر. ٣- مشاكل الداخلية. ٤-عدم وجود الحرية. ٥- حكم قبلي. ٦-الطريق الوحيد للتغير هي إما الإنقلابات أو الإغتيالات. ٧- سياسة فيها يساوي عنف ..)، لە( مشروع اخوان مسلمين للإصلاح) دەڵێت: (سستی لەگەشە- گەندەڵی وزوڵم- پاشکەوتنی زانست وتەکنۆلۆجی) جیهانی عەرەبی کوشتووە.

## رۆڵی رۆژئاوا لە نەبوونی دیموکراسی لە جیهانی ئیسلامی

خودی رۆژئاواو باقی جیهان سودمەندن لەو دۆخە دواکەوتوەی عەرەب و جیهانی ئیسلامی، بۆیە لەدابەشی رۆژهەڵاتی ناوەراست (بە پێی سایکس پیکۆو سیڤەر) وادابەش کران (وەک توینبی ووتەنی) جێی دیموکراسی نەبێتەوە ،دابەشیەکە بۆ مانەوەی کێشە بوو کە لەسیڤەر بەرجەستە کرا بەو شیوەیەی خوارەوە: مادەی ٦٢-٦٤ سەبارەت بە کوردستانە، سوریا و عێراق بەپێی مادەکانی ٩٤ هەتا ٩٧ دروست کران . ئیسرائیل.. بەپێی ماددەی (٩٥). حیجاز بەپێی ماددەکانی (٩٨-٩٩). بەو شێوەیە میسر بەپێی مادەی (١٠١). سودان لە مادەی (١١٣) ، مەغریب و تونس لە ماددەی (١١٨). لیبیا بە ماددەی (١٢١).

ئیستعمار یەکەمجار هەوڵی داوە ئایینیان لاوازبکات و ئایدیۆلۆجیای بەدیل بڵاو بکاتەوە، یان بۆشایی ئایدیۆلۆجیش هەر بەشێک بووە لەو تەقەلایە، لورنس براون دەڵێ گەورەترین دیوار لە پێش داگیرکار وئیستعمار ئایینە، سەرکردەی پورتوگالی لە(١٥١٥ز) بە قەڵاچۆی ئایین وئایدیۆلۆجیا بەرەو جیهانی ئیسلامی هات، کلادستون- سەرۆک وەزیرانی بەریتانیا دەڵێت: ناتوانین جیهانی ئیسلامی داگیربکەین تا (قورئان) یان لەنێو دورنەخەینەوە، بۆیەش لەجیهانی ئیسلامی لە کوێ ئایین لاوازبوو لەوێ یەکەم پێگەی

ئیستعماری لێ دروست بوو، بۆیە سەرسامی نییە یەکەم پێگەی (بەمورتاحی) ئیستیعمار لەجیهانی ئیسلامی حیجاز بووە، کە یەکەم پرۆسەی لێک جیاکردنەوەی ئایین لە دەسەڵاتی ئەنجامدرا، لەنێوان (حمد کوڕی سعود) و (محمد کوڕی عەبدولوەهاب) لەساڵی( ١٧٣٧ز) کە ئایین بۆ یەکەم ودەسەڵاتیش بۆ دووەم ، رۆجی غارودی هەروەهاش مەکسیم رۆدنسن دەڵێن ئیستعمار بۆ جێگیر بوونی خۆی لە وولاتانی داگیرکراو هەوڵی یەکەمی دەرکێشانی ئایین وکەلتوری ڕەسەنی ئەو وولاتە بووە، لەجێیدا ئایدیۆلۆجییەکی نوێ بتاشێ، بۆیە تەبشیری پێشرەوی ئیستعمارە، مەبەستی بنچینە تەبشیری گۆڕینی ئایینی داگیرکراو بووە بۆیە پێشەنگی داگیرکاری بووە، لەوەش زیاتر (جورج کیرک)خاوەنی کتێبی ( موجز تاریخ الشرق الاوسط -A short History Of the Middia East) دەڵێ پرۆژەی ناسیۆنالیزمی عەرەبی (واتە عروبی) لە ( دار المندوب السامی البریطانی) دروست کراوە، وەک بەشێک لە پرۆژەی داگیرکاری، تەنانەت داگیرکەر هەوڵی داوە ئایینیکی بەهێزو بەرگر بگۆڕێ بە ئایینێکی تری سادەو بێ گیان، بۆ ئەو باش بووە ئایینی ئیسلام کە پڕ بەرگریەو دژی داگیرکارییە نەمێنێ، بۆیە ئایینی ئیسلامی ڕاستەقینە هەرگیز ناشێت ونابێتە کەرەستەی هیچ داگیرکەرێک، هەر ئەوە نییە نابێتە ئامرازی داگیرکەربەڵکو دەبێتە ئامرازی دژی داگیرکەر، ئەگەر بووە ئامرازی داگیرکاری یان بووە ئامرازی بەرگری نەکردن ئەوە بەسوردراوی بەکارهاتووە وەک زۆر جار وابەکارهاتووە،

لەوەوە بەروونی بۆمان دەردەکەوێ کە رۆژئاواو پرۆسەی ئیستعماری هاندەری دیموکراسی نەبووە.

هەر لەو ڕەوتەوە عەلمانیەتی جیهانی ئیسلامی بەتوندڕەوی هاتۆتە مەیدان، وەک عەلمانی رۆژئاوا نییە، عەلمانی جیهانی ئیسلامی پێویستی بە تێکدانی بناغە کۆمەڵایەتی وبەشێکی گرنگی کەلتوورو نەریت وفەرهەنگ هەیە تا جێی بپێتەوە وبحەسێتەوە، عادەتەن ئەو هەنگاوانەش بە وێرانکردنی ژێرخانی کۆمەڵگا لە ئەخلاق و بەها و ئاکارەکان دەست پێ دەکا، بێ ئەوەی بتوانێ دروستی بکاتەوە، بەو پێیە وای لێ دێت دەسەڵاتی سیاسی و بیری گەندەڵی تەنها بتوانێ لە کۆمەڵگەیەکی گەندەڵا بژی، وەک ئێستا لە زۆربەی ئەزموونەکانی عەلمانی جیهانی ئیسلام دەبینین بە کوردستانیشەوە، لەوەوە جەختێکی زۆر دەکرێ گوایە دیموکراسی لەجیهانی ئیسلامی و عەرەبی بە بەرپاکردنی عەلمانیەت و لێک جیاکردنەوەی ئایین وسیاسەت دێتەدی، بەو شێوەیە بە یەکجاری دیموکراسی نامۆ دەکات وەک نامۆ بوونی عەلمانیەت.

ئەنجام : دواکەوتن ونەبوونی دیموکراسی لەجیهانی ئیسلامی هۆکاری خۆی هەیە، هەمان ئەو هۆکارانەو هۆکاری سەرباری تر وای کردووە ئێستا (قەیرانی نەبوونی دیموکراسی )زیاتر لە وولاتانی عەرەبی قەتیس بمێنێت، هۆکارەکانیش زاتی ومەوزوعین، ناوەکی ودەرەکین، کە لەسەروو باسکرا، ئەوبارودۆخە چارەسەر نابێت تاچاکسازیەکی بنەرەتی لە:

١- فقهی ئایینی نەکرێت.

٢- چاکسازی لەرۆژهەڵاتی ناوەراست نەکرێت بە تەرازووی خۆماڵی —واتە هەڵوەشاندنەوەی سایکس پیکۆ.

٣- بۆ هەموو میللەتان مافی چارەنوس بدرێت.

٤- ئینجا گەشەو دیموکراسی ودادگەری.



## رێبین هەردی

# دیموکراسی کۆمەڵێک ناوەڕۆکە کە هیچیان لە کوردستاندا بوونی نییە

لەم گفتوگۆیەدا، رێبین هەردی نووسەر و رۆشنبیر باس لە دیموکراسی و گرنگییەکەی دەکات، رای خۆی دەربارەی دیموکراسی لە هەرێمی کوردستان و رۆلی هێزە ئیسلامییەکانی کوردستان لە بەرەوپێشبردنی دیموکراسی دەخاتەڕوو، ئەو پێی وایە "ئیسلامییەکانی کوردستان پێشەنگن بۆ زۆرێك لە هیزە ئایینییە سیاسییەکانی ناوچەکە"، لە بارەی گرنگی دەستاودەستکردنی دەسەلاتیش لە هەرێمی کوردستان دەڵێت "بۆ رێگرتن لە تێکەڵبوونی تەماعی شەخسیی و بنەماڵەیی بە ئەرکی دەسەلات، پێویست بە دەستاودەستکردنی دەسەلات دەکات

گفتوگۆ: ئیدریس سیوەیلی

**خاڵ: دەوترێت ڕۆژئاوا نایەوێت هەمان مۆدێلی دیموکراسییەکەی خۆی ببەخشێتە ڕۆژهەڵات، بەڵکو ئەوان دیموکراسیەتێکیان بۆ ڕۆژهەڵات دەوێت کە پارێزگاری لە بەرژەوەندیەکانیان بکات، ڕای بەڕێزتان لەوبارەوە چییە؟**

ڕێبین هەردی: دیموکراسی ئەزموونێکی سیاسییە بۆ ڕێکخستنی پەیوەندی نێوان هێزە سیاسیەکان لەلایەک و پەیوەندی بواری سیاسی بە کۆمەڵگاوە لەلایەکی دیەوە، نە شتێکە بتوانرێت وەربگیرێت و نە هاوردە بکرێت، ڕێگرەکانی دیموکراسی هەمیشە لەناو جوگرافیای سیاسیی و کۆمەڵایەتیی کۆمەڵگا خۆیدا بوونی هەیە، نەک لە دەرەوەی، ئەشێت دەرەوە دەوری لە خاوکردن یان خێراکردنی ئەم ئەزموونەدا هەبێت، بەس ناتوانێت ڕێگری لێبکات گەر کۆمەڵگایەک بڕیاری دا ئەم ئەزموونە تاقی بکاتەوە، بکەر و ڕێگرە ڕاستەقینەکانی دیموکراسی ئەو گەمەکەرە سیاسیانەن کە لە جوگرافیایەکی سیاسیی دیاریکراودا کار دەکەن.

**خاڵ: دیموکراسی وەکو مۆدێلێکی ڕۆژئاوایی، دەتوانێت چی بە ئێمەی ڕۆژهەڵاتی ببەخشێت؟**

ڕێبین هەردی: دیموکراسی دەتوانێت زۆر شت بە ئێمە ببخەشێ کە لەم چەند خاڵەدا کورتی دەکەمەوە:

١- لە پێش هەمویانەوە تێگەیشتن لەو ڕاستیەی هەموو کۆمەڵگایەک بۆچونی جیاواز و ڕوانینی جیاوازی تێدایە و ڕێگەی بەلاداخستنی ئەم بۆچونە جیاوازانەش، شەڕ و پێکدادان و دوژمنایەتی نییە، بەڵکو ڕێکەوتنە لەسەر جۆرێک پێکەوەژیان کە بە چەند ڕێسایەک ڕێک دەخرێن کە پێیان دەگوترێت ڕێساکانی دیموکراسی، ئەو ڕاستیەی کە بە هۆی ئاڵۆزی ژیان و گەورەبوونی کۆمەڵگاوە، ئەستەمە و بگرە مەحاڵە کۆمەڵگایەکت هەبێت یەک بۆچوون و یەک ڕوانینی بۆ شتەکان هەبێت، یەک ڕێگە و یەک پێشنیاری بۆ شێوازی بەڕێوەبردنی کۆمەڵگا هەبێت، یەک ئامانج و خەونی بۆ ئێستا و داهاتووی وڵات هەبێت، تاکە ڕێگە ئاشتیانەش بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئەم جیاوازیە، دیموکراسی و ڕێساکانێتی.

٢- بەرپرسکردنی بواری سیاسەتە لەبەردەم کۆمەڵگادا، سیاسەت هونەرێکە بۆ ڕێکخستنی ژیانی کۆمەڵگا و لەبەرئەوەش دەبێت ئەم بوارە لەبەردەم کۆمەڵگادا بەرپرسیار و قابیلی لێ پرسینەوە بێت، بواری سیاسی لەبەرئەوەی دەسەڵاتێکی زۆر بە هەموو ئەو کەسانە دەبەخشێت کە کاری تیا دەکەن، لەبەرئەوە دەبێت لەژێر چاودێری و لێپرسینەوەی خەڵکدا بێت، بۆ ئەوەی لەهەموو تەماع و چاوچنۆکی و زیادەڕەویەک بپارێزرێت.

٣- دەسەلات لەبەرئەوەی تەماع وروژێنەرە، هەمیشە مەترسی ئەوەی هەیە هەر کاتێک کەوتە دەست یەکێک هەوڵبدات بە بیانووی جیاواز بۆ هەمیشە لای خۆی و بنەماڵەکەی بیهێڵێتەوە، بۆ ڕێگرتن لە تێکەڵبوونی تەماعی شەخسیی و بنەماڵەی بە ئەرکی دەسەڵات، پێویست بە دەستاودەستکردنی دەسەڵات دەکات، ڕێگری کە حوکمرانی هەمیشەیی یان تا مردن، تاکە ڕێگەیە بۆ نەکەوتنە ناو ڕژێمێکی دیکتاتۆری و ستەمکارەوە. بۆ هەموو ئەم شتانە پێویستمان بە دیموکراسی هەیە

**خاڵ: دۆخی عێراق و هەرێمی کوردستان بە دیاریکراوی چەند لەبارن بۆ بەرهەمهێنان و گەشەپێدانی دیموکراسی؟**

ڕێبین هەردی: بڕوایەکی تەواوم بەوە هەیە دۆخی لەبار و نالەبار بۆ دیموکراسی نییە، بەڵکو هێزی دژ بە دیموکراسی و ڕێگر لە دروستبوونی هەیە، ئەوانەی دیموکراسی دەبەستنەوە بە پێشکەوتنی کۆمەڵگا و لەسەر نموونەی ڕۆژئاوایی و شێوازی ژیانی ڕۆژئاواییان کردووە بە بنەمای دیموکراسی، دەبێت چۆن وەڵامی ئەوە بەنەوە کە دیموکراسی لە وڵاتێکی وەک هندستاندا هەیە کە بە هەموو پێوەرێک بەو کۆمەڵگایانە دەژمێرێت کە تەواو ڕۆژهەڵاتیە دوورە لە شێوازی ژیانی ڕۆژئاواوە، ئەوانەی دین بە ڕێگر لە دیموکراسی دەزانن و بە تایبەتی دینی ئیسلام وەک ڕێگرێک

لە دیموکراسی پەشان دەدەن، دەبێت چۆن وەڵامی ئەوەبەنەوە لە ئەندۆنیسیا و تورکیادا دوو ئەزموونی دیموکراسی هەیە.

دیموکراسی دەکرێت لە هەموو کۆمەڵگایەکدا پەیڕەو بکرێت، گەر ناکرێت لەبەر ئەوە نییە دۆخی لەبار بۆ بوونی نییە، بەڵکو لەبەرئەوەیە هێزی دژ بە دوموکراسی و بە ناوەرۆک ستەمکار هەیە کە لەبەرژەوەندی نییە دیموکراسی بوونی هەبێت. لە هەر جێگەیەک فرەیی و بۆچوونی سیاسی جیاواز هەبێت، هێز و حیزبی سیاسی جیاواز هەبێت، هەر لەو شوێنەدا دیموکراسی وەک پێشنیارێک دێت بۆ ئەوەی پێکەوەژیانی ئەو هێزە سیاسییانە رێکبخات و جیاوازیەکانی نێوانیان بە جۆرێک یاساڕێژ بکات کە رێگر بێت لە شەڕ و پێکدادان و دوژمنایەتی، ئەوانەی بە بیانوی جیاواز باس لەوە دەکەن دۆخی لەبار بۆ دیموکراسی نییە، لەراستیدا دەیانەوێت ئەوە بسەلمێنن کە ستەمکاری و دیکتاتۆری لەم کۆمەڵگایانەدا شتێکی سروشتییە. دیارە ئەمە بە مانای ئەوە نییە کە مەرج و زەمینەی تایبەت بە دیموکراسی نییە، بەڵکو مەبەستمە بڵێم گەر ئەو مەرج و زەمینانە ئامادە نین، لەبەرئەوەیە هێزی دژ بە دیموکراسی هەیە کە رێگرە لە دروستبوونیان.

**خاڵ: دەوترێت لە کوردستان دیموکراسی هێندەی بۆتە موزایەدەی هەندێک لایەنی دیاریکراو، هێندە نەبوەتە سیستم و ئەخلاقێکی پیادەکراو، سەرنجی ئێوە لەوبارەوە چییە؟**

ڕێبین هەردی: لە کوردستاندا فرەیی سیاسی هەیە کە لە رێگەی یاساوە رێگە پێدراوە، هەڵبژاردنی دەوری هەیە، پەرلەمانێک هەیە کە بە پێی دەنگهێنانی هێزەکان لە هەڵبژاردندا کورسیەکانی دیاری دەکرێت. راگەیاندنێکی ئازاد هەیە گەرچی بەردەوام لەژێر هەڕەشەدایە. هەموو ئەم شتە شکڵیانە دەڵێن دیموکراسی هەیە. بەڵام دیموکراسی تەنیا کۆمەڵێک شکڵ نییە، بەڵکو لەهەمانکاتدا کۆمەڵێک ناوەڕۆکە کە هیچیان لە کوردستاندا بوونی نییە. ئێمە پەرلەمانمان هەیە کە نوێنەرایەتی هێزی جیاواز دەکات، بەڵام هەر کاتێک ئەم پەرلەمانە چالاک بووە یان فەرامۆش کراوە یان داخراوە. ئێمە یاسامان هەیە کە تەنیا بەسەر خەڵکی بێدەسەڵاتدا جێبەجێ دەکرێت، بەس کە دێتە سەر دەسەڵاتداران هیچ کاریگەریەکی نییە. بیرۆکەی سەروەری یاسا کە یەکێکە لە خەسڵەتەکانی دیموکراسی بۆ ئەوە هاتووە ئەوە بسەپێنێت کە دەسەڵاتدار و بێدەسەڵات لەبەردەم یاسادا یەکسانن و بوونی پێگەی دەسەڵاتی کەسێک، هیچ لەوە ناگۆڕێت گەر پێشێلی یاسای کرد، وەک هەر هاوڵاتیەکی تر بکەوێتە بەر پرسی یاسا و دادگا. لە کورستاندا بەهیچ شێوەیەک ئەم خەسڵتە بوونی نییە.

یەکێکی دی لە کێشە سەرەکیەکانی تر کە رووبەڕووی ئەزمونی دیموکراسی دەبێتەوە و تایبەتیشە بە دۆخی هەرێمی کوردستان، ئەو دەسەڵاتە زۆر و گەورە و بێ چاودێریەیە کە حیزب بەسەر هەموو دەزگاکانەوە هەیەتی، دەسەڵاتی سەرەکی لە کوردستاندا لای حیزب و مەکتەبی سیاسییە کە لە دەرەوەی هەموو چاودێری و لێپرسینەوەیەکەیە. لە کوردستاندا هەڵبژاردنی دەوری دەکرێت، بهڵام تا ئێستا دەستاودەستکردنی دەسەڵات نییە. هێزە باڵادەستەکان بەوەی زوربەی دەزگاکانی حکومەتیان لەبەردەستە توانایەکی گەوەرەیان بۆ ساختەکاری لە هەڵبژاردنەکاندا هەیە و زوربەی جارەکان دەنگی راستەقینەی خەلک نادۆزینەوە، هەموو ئەمانە وایکردووە ئەوەی لە کوردستاندا پێی دەگوترێت دیموکراسی لەژێر پرسیاری گەورەدا بێت.

**خاڵ: لە کوردستان چۆن دەتوانرێت گەشە بە دیموکراسی بدرێت یاخود چۆن هەرێمی کوردستان بەرەو دیموکراسی ببرێت؟**

ڕێبین هەردی: رێگەیەک نابینم جگە لە درێژەدان بە کولتوری ناڕازیبوون و بەردەوام بوون لەسەر رەخنە و تەسلیم نەبوون بەو دۆخە سیاسییە باڵادەستەی حیزبە سەرەکیەکانی کوردستان بە هەموو شێوەیەک هەوڵ بۆ بەردەوامی دەدەن،

سووربوون لەسەر ڕێگەی مەدەنی و پەنانەبردن بۆ توندوتیژی و بەکارهێنانی هەموو ئەو ڕێگە مەدەنیانەی ڕێگە پێدراون بۆ دروستکردنی فشاری بەردەوام، زیاترکردنی رووبەری ناڕازیبوون و دژایەتی کولتوری نائومێدی کە دوژمنی سەرەکی هەموو ئەگەرێکی گۆڕانکارییە. پێموایە خاڵی سەرەکی برەودانە بە کولتوری تەحەمولکردن و بەردەوام بوون لەسەر نارازی بوون،

**خاڵ: ئیسلامییەکانی کوردستان لەکوێی پرۆسەی دیموکراسیدان؟ ئایا دەتوانن چ رۆڵێک ببینن لەوبارەوە؟**

ڕێبین هەردی: ڕەنگە زیادەڕۆیی نەبێت گەر بڵێیم ئەزموونی کوردستان لە پەیوەندیدا بە هێزە ئیسلامییەکانەوە دەتوانێت پێشەنگ بێت بۆ هەموو ناوچەکە، رەنگە ئەم ئەزمونە تاکە ئەزمونێکی سیاسیی بێت لە ناوچەکەدا کە ئیسلامییەکان لەناویدا کاردەکەن. رەنگە هەرێم تاکە ناوچەیەک بێت تا هەنوکە دوور بێت لەو توندوتیژی و دابڕانەی لەنێوانی ئیسلامییەکان و هێزەکانی دیدا لە ناچەکە هەیە، ئەو دەورەی ئەم هێزانەش بۆ بەرگری لە بنەماکانی دیموکراسی گرتویانەتەبەر، لە هەڵوێستی زۆرێک لەو هێزانە کاریگەرتروبووە بەناو خۆیان بە دیموکراسی دەزانن. ئیسلامییەکان لە بەرگریکردن لە پەرلەمانێکی کاریگەر و چالاک، لە دژایەتیکردنی ساختەکاری لە هەڵبژاردندا، لە سوربونیان لەسەر ئەنجامدانی هەڵبژاردنی دەوری و لەکاتی خۆیدا، هێزێکی کاریگەر بوون و هەن، هێزە ئیسلامییەکانی کوردستان لە راستیدا پێشەنگن بۆ زۆرێک لە هیزە ئایینییە سیاسییەکانی ناوچەکە، لە قەبوڵکردنی پێکەوەژیان و هەڵبژاردنی ڕێگەی مەدەنیانە بۆ گۆرانکاری و دۆزینەوەی جۆرێک لە پەیوەندی لەگەڵ هێزە نادینیەکاندا کە دورە لە جەنگ و کوشتار و رادەیەک لە قەبوڵکردن و ڕێزگرتن لە یەکدی تیایە، ئیسلامییەکان هێزێکی کاریگەر بوون لە سەپاندنی کولتوریی فرەیی و رای جیاواز کە یەکێکە لە پایە سەرەکیەکانی هەموو سیستەمێکی دیموکراسی.

**ڕێگرەکانی دیموکراسی هەمیشە لەناو جوگرافیای سیاسیی و کۆمەڵایەتیی کۆمەڵگا خۆیدا بوونی هەیە**

**بۆ ڕێگرتن لە تێکەڵبوونی تەماعی شەخسیی و بنەماڵەیی بە ئەرکی دەسەڵات، پێویست بە دەستاودەستکردنی دەسەڵات دەکات**

**ئیسلامییەکانی کوردستان لە راستیدا پێشەنگن بۆ زۆرێک لە هیزە ئایینییە سیاسییەکانی ناوچەکە**

## زەمینەی دیموكراسی

# دیموكراسی وەك گەمەیەكی هێز






**فازڵ قەرەداغی**

لەدایكبووی ١٩٦٢، بەكالۆریۆس لە ئەندازیاری شارستانیی
(١٥) كتێب و چەند نامیلكەی چاپكراوی هەیە لە بوارەكانی
مێژووی دێرینی كوردستان، فیكر، رەخنە و ئەدەب.
دەیان وتار و لێكۆڵینەوەی بڵاوكراوەی هەیە.




**شتێکی زانراوە کە هەر سیستەمێکی سیاسی پێویستی بە زەمینەیەکی لەبارە بۆ ئەوەی بەو شێوەیە کار بکات کە بۆی دانراوە، ئەمەش وا دەکات هێنانی سیستەمێکی سیاسی لە کۆمەڵگەیەکی ترەوە دەرئەنجامی نەخوازراوی لێ بێتەوە. لەم باسەش لەو زەمینەیە دەکۆڵینەوە کە دیموکراسیی هێنایە بوون‌و کە پێویستە هەبێت بۆ ئەوەی دیموکراسی کار بکات.**

* * * *

دیموکراسی لەناو وڵاتانی ڕۆژئاوا کارایە بەڵام لە ئاستی جیهانی زۆربەی کات پەکی دەکەوێت. بۆ نموونە ئەنجوومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتی زۆر لە دیموکراسییەوە دوورە چونکە پێنج ئەندامی هەمیشەیی هەن‌و ئەندامێتیی هەمیشەیی لەگەڵ دیموکراسی ناکۆکە، مافی ڤیتۆش کەئەو پێنج دەوڵەتە هەیانە ناکۆکییەکی ترە لەگەڵ دیموکراسی.

بەپاڵ ئەمەش‌و هەر لە ئاستی جیهانی هەندێک جار دیموکراسی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست‌و ناوچەی تر لەبار دەبرێت ئەویش یان بەبەرچاوی ڕۆژئاواوەو یان تەنانەت بە پیلانی ئەو.

لێکدانەوەی باو ئەمە دەیگەڕێنێتەوە بۆ بەرژەوەندیی ڕۆژئاوا. ئەو ڕۆژئاوایە نیزامە نادیموکراتییەکەی ئەنجوومەتی ئاسایشی بۆ بەرژەوەندیی خۆی هێشتۆتەوە، لە مەسەلەی دیموکراسی لە وڵاتانی تریش ڕەچاوی ئەو بەرژەوەندییە دەکات زیاتر لە دیموکراسی. ئەمە لێکدانەوەیەکی دروستە بەڵام ڕووکەشییە. لەوە قووڵتر ئەوەیە دیموکراسی گەمەی هێزە بۆیە لە شوێنێک کارایەو لە شوێنێکی تر تەنها بەناوە یان هەر نییە.

دیموکراسی بەڕوواڵەت سیستەمێکی مرۆڤدۆستە، بەڵام مرۆڤدۆستی دوایەمین شتە کە دیموکراسی بیخاتە گەڕ. ئەوەی کۆنترۆڵی دیموکراسی دەکات هاوسەنگیی هێزەکانە. لە کۆمەڵگەیەک هێزەکان هاوسەنگیان نەبێت سیستەمە ڕاستەقینەکە تاکڕەوییە یان فەرمانڕەوایی کەمایەتییەو لە حاڵەتی یەکجار کەم فەرمانڕەوایی زۆرینەیە ئەویش کاتێک سەرکردەیەک یان هێزێک زۆرترین جەماوەری لەدەوری خۆی کۆکردبێتەوە.

هاوسەنگیی هێزەکان لە تیۆری جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان دیارە (یاسادانان-ڕاپەڕاندن-دادوەری) بەڵام ئەو هاوسەنگییە لەوە قووڵترەو دەگەڕێتەوە بۆ پێکهاتەو بونیادی کۆمەڵایەتیی‌و ئابووریی کۆمەڵگە.

هاوسەنگیی هێز وەک بناغەی دیموکراسی لەکۆنەوە هەبووە. لە دیموکراسییەکەی یۆنانی کۆن، بەتایبەتی لە ئەسینا کە زۆرتر بە دیموکراسییەوە ناسرابوو، هاوسەنگی لەنێوان چینەکان هەبوو. ململانە لەنێوان ئەو چینانە هەبوو بۆ دەستکەوتنی زۆرترین دەسەڵات بەڵام کۆتاییەکەی هاوسەنگییەک دروست بوو کە دیموکراسیی بۆ هەموو ئەسینا دەستەبەر کرد.

لە ڕۆما کە سیستەمەکە کۆماری بوو و ناوی دیموکراتیی لێ نەنرابوو ململانەی زۆر لەنێوان چینی ئەرستوکرات‌و چینی عەوام هەبوو. چینی دووەم دەیویست مافەکانی دەستبکەوێت، ئەنجامەکەش سیستەمێکی کۆماری بوو کە توخمێکی دیموکراتیی تیابوو. کاتێکیش کە هاوسەنگییەکە تێکچوو و عەوامەکان شوێنی سەرکردە بەتەماعەکان کەوتن (وەک ماریوس و دواتر قەیسەر ئەگەرچی ئەوان ئەرستوکرات بوون) سیستەمی کۆماری تەنها بەناو مایەوەو لە قەیسەر بەدواوە (کە ئەمیان سەرکەوتوو بوو لەکاتێک ماریوس شکستی هێنابوو) نیزامەکە بووە ئیمپراتۆری.



# دیموکراسی گەمەی هێزە
# بۆیە لە شوێنێك كارایەو لە شوێنێکی تر
# تەنها بەناوە یان هەر نییە.

وەک دەبینین لاسەنگیی هێزەکان نیزامێکی جیاوازی هێنایە کایەوە. لە نموونەی ڕۆمای قەیسەری ئەگەرچی جولیوس قەیسەر لەسەر شانی عەوام دەسەڵاتی گرتە دەست لەکاتێک مونافسەکەی کە نوێنەری ئەرستۆکراتەکان بوو دۆڕا بەڵام توخمی دیموکراتی دوورتر کەوتەوەو لەجیاتی ئەوە دەسەڵاتی فەرمانڕەوای تاک زەقتر بوو. عەوامەکان چیتر ئەو هێزە نەبوون کە بتوانن توخمە دیموکراتییەکە بپارێزن.

لە ئەورووپای سەدە ناوەڕاستەکان بەهێزیی چینی ئەرستوکراتەکان (دەرەبەگەکان) ڕێگر بوو لەبەردەم پادشایان بۆ ئەوەی ببنە پادشای ڕەهای هەرچەندە پادشا هەبوون ئەو هەوڵەیان دابوو. ئەرستوکراتەکان بەم شێوەیە هێزێک بوون هاوسەنگیی نێوان هێزەکانیان ڕاگرتبوو. ئەگەرچیش سیستەمەکە لە دیموکراسییەوە دوور بوو بەڵام کەم تا زۆر لە تاکڕەویشەوە دوور بوو. ڕەنگە ئەم زەمینە کۆمەڵایەتیو ئابوورییە بوو بێت کە ئەو وەسفە ڕوونبکاتەوە کە عەمر کوڕی ئەلعاص بۆ ڕۆمەکان کردبووی. لەو فەرموودەیەی لە صەحیحی موسلم هەیەو پاش ئەوەی هاوەڵێک ئەو فەرموودەیە دەگێڕێتەوە کە ڕۆژی ڕووداني قیامەت ڕۆمەکان زۆترین خەڵکن بە ژمارە عەمر کوڕی ئەلعاص، کە تێکەڵاوییەکی هەبوو لەگەڵ ڕۆمەکان (واتە بیزەنتییەکان) پێنج تایبەتیی ئەو ڕۆمانە دەڵێت کە یەکێکیان تایبەتمەندییەکی جوانە ئەویش کە لە گەلانی تر زیاتر هەیانە ئەویش کە ملکەچی بۆ ستەمکاریی پادشایان ناکەن، یاخود ڕێگە نادەن بە ستەمکاریی پادشایان.(١) هەڵبەت ئەوەی بۆ بیزەنتییەکان ڕاست بوو بۆ باقیی ڕۆژئاوا ڕاست بوو چونکە نیزامی دەرەبەگی لەوێ بەربڵاو بوو.

تەکانێکی تری هاوسەنگیی هێزەکان لە ئەورووپای سەردەمە نوێکان ڕوویدا کاتێک جەماوەر داوای بەشی خۆیانیان لە فەرمانڕەوایی کرد. لە بەریتانیا بورجوازەکان بەشی خۆیانیان دەستکەوتبوو و ئەرستوکراتەکان وەکو تاکە فەرمانڕەوا نەمانەوە، بەڵام دواتر جەماوەر سەلماندیان کە ئەوانیش دەتوانن گەمەی هێز بکەنو لەوەوە مافی دەنگدانو خۆپاڵاوتنیان دەسکەوت. لەو کاتەشەوە هاوسەنگیی هێزەکان دروست بوو.

هەروەکو یۆنانو ڕۆمای کۆنیش، دیموکراسیی نوێ بناغەیەکی سەربازیی هەبوو. لە یۆنانو ڕۆمای کۆن جەنگ لەدژی دەوروبەر حاڵەتێکی هەمیشەیی بوو، جەنگاوەرەکانیش هاووڵاتییەکان بوون بۆیە توانییان جەمسەرێکی هێز پێکبهێنن. لە ڕۆژئاوای سەدە ناوەڕاستەکان سیستەمی دەرەبەگی پشتی بە سوپایەکی سنووورداری هەمیشەیی بوو، لە زۆر شوێنی تریش یەکەی سەربازیی بەرکرێگیراو هەبوون وەک یەکە سویسرییەکان. بەڵام دواتر بەهۆی سەربازیی زۆرەملێوە جەماوەر بوونە هێزێک کە توانای هەیە داوای مافەکانی بکات کە

له مافی دەنگدان له هەڵبژاردنەکانو دواتر مافی خۆپاڵاوتن خۆی بینییەوه، بۆیه قسەیەک هەیه دەڵێت: یەک تفەنگ واته یەک دەنگ.

زۆر دواتریش که ڕاگەیاندن بڵاوبووەوه رۆژنامەنووسی بووه هێزێکی گۆرەپانەکە، لەمەوشەوه به رۆژنامەنووسییان وتبوو دەسەڵاتی چوارەم. بەڵام بێگومان رۆژنامەنووسی پیشەیه نەک چین یان توێژێکی کۆمەڵایەتی بۆیه شتێک نەبوو بەناوی مافی رۆژنامەنووس بۆ دەنگدانو خۆپاڵاوتن. بەهۆی ئەمەشەوه رۆژنامەنووسی بەشێوەیەکی جیاواز چووه ناو گەمەی هێزەکانی سیستەمه دیموکراتییەکه ئەویش کاریگەرییه لەسەر شەقام هەروەها فشارخستنه سەر کەسایەتییه سیاسییەکان تا دەگاته ڕادەی کارکردنه سەر عەقڵیەتو دروستکردنی ((کۆهۆشیاری)).

هەبوونی ئەو هێزانەو ئەو هاوسەنگییەی لەنێوانیان ئەو زەمینەیه بوو که دیموکراسیی دروستکردو خستییه گەڕەوه. بێگومان ئەگەر جەماوەر لەناو ئەو گەمەیه نەبوایه سیستەمەکه دەبووه شتێکی تر.

بەڵام وەنەبێت هاوسەنگییەکه واتای یەکسانیی هێزەکان بێت. هێزی یەکەمی جەماوەر دەنگەکەیەتی که سیاسییەکان مەبەستییانه لەدەستی نەدەن، بەڵام سیاسییەکانیش کەرەستەی تری هێزیان هەیه که بریتییه له بەگەڕخستنی ئەو دەسەڵاتەی هەیانه بۆ جێبەجێکردنی بەرنامەکەیان.

لەبەر ئەوەش که دیموکراسی، یان دەسەڵات بەگشتیو بەدەر له شێوەی سیستەمەکە، گەمەی هێزە، ئەو ململانەیه بۆ بەدەستکەوتنی هێز به لایەنه تەقلیدییەکان نەوەستاوەتەوه بەڵکو یاریکەری تر هاتبوونه پێشەوه. یەک لەوانه رۆژنامەنووسی که باسم کرد. هێزێکی تر بریتییه له کۆمەڵەکانی فشار یان کۆمەڵەکانی بەرژەوەندی (لۆبییەکان) که ئەمانه موقعێکی ڕەسمییان نییه لەناو سیستەمەکه بەڵام هەنو کاریگەرییان زۆره. له ئەمەریکاو هەندێک وڵات کۆمەڵەکانی فشار تۆمارکراون که چ شتێکنو ئامانج ودارایان چییه. له ئەمەریکا تۆمارکردنه ئیجبارییه بەڵام ئەو کۆمەڵانه خۆیان لەوه دەدزنەوه. (٢)

ئەوەی خوێنەر کوردو رۆژهەڵاتی بەگشتی لەناو کۆمەڵەکانی فشار دەیناسێت لۆبیی جوولەکەیه، بەڵام ژمارەی کۆمەڵەکانی فشار یەکجار زۆرنو زۆرێکیش لەوانه کاریگەریی زۆریان هەیه. تەنها وەکو نموونەیەکیش لۆبیی بەرهەهێنەرانی برنجه که ئەو لۆبییه بوو نەیهێشت کۆنگرس ئیدانەی کیمیاییەکەی هەڵەبجه بکات چونکه عیراق برێکی زۆری برنجی ئەمەریکیی هاوردە دەکرد،(٣) تەنانەت دوکتۆرەکان بۆ خۆیان لۆبییەکی بەهێزن. هەرچەنده لۆبییەکان له ئەمەریکا زۆرن بەڵام له هەموو رۆژئاوا هەن. له فەرەنسا ئەگەرچی هەن بەڵام لەبەر ئەوەی حکومەتی مەرکەزیو باوکانەی بۆ ماوەتەوه کارەکانی ئەو کۆمەڵانه به بەچاوی نارەزاییو وەک تارادەیەک پیس تەماشا دەکرێت.٤)

ئەوەی جێگەی مەبەسته لێره ئەوەیه کۆمەڵەکانی فشار نموونەیەکی گەمەی هێزه که له هەموو دەسەڵاتێک هەیه، بەڵام له سیستەمی دیموکراتی زیاترن. ئەو کۆمەڵانه دەتوانن کاری باش یان خراپ بکەنه سەر کاری حکومەت، لەلایەک دەتوانن سنوور دابنێن بۆ هەر کۆمەڵێک بەڵام لەلایەکی تر بەهۆی پەرشوبڵاوکردنی دەسەڵاتی سیاسی کاری حکومەت پەک بخەن. (٥) بەواتایەکی تر دەتوانن زەمینەی دیموکراسی بەهێز بکەن، دەشتوانن لەقی بکەن. بەم شێوەیه دیموکراسی پێویستی به زەمینەیە، بەڵام زەمینەی دیموکراسی

بیروباوەڕی مرۆڤدۆستانە نییە بەڵکو گەمەی هێزە. هەر کاتێکیش هێزەکان بتوانن هاوسەنگییەک بپارێزن کە لە بەرژەوەندیی هاوولاتیی بێت ئەو کاتە پێویستە چاوەڕێی دیموکراسیی بین.

لەمەشەوە تێدەگەین بۆچی لە کوردستان نە دیموکراسی هەیەو نە بۆی هەیە دابمەزرێت. دوو حزبی دەسەلاتدار هاوسەنگیی نێوان خۆیان ڕاگرتووە، بەلام ئەو گەمەی هێزەی دەیکەن بریتییە لە شەراکەتە لە دەستگرتن بەسەر ولاتەکە. تاکە هێزێکیش جەماوەر هەیەتی دەنگەکەیەتی کە ئەویش هێزێکی زۆر لاوازە چونکە لەلایەک دەنگەکەی بە تەزویر دەدزرێتو لەلایەکی تر بەهۆی ئەوەی دوو حزبەکە دەستیان گرتووە بەسەر داهاتی ولات کەسانێکی زۆری حزبەکەیان سوودمەند کردووەو بەم سوودگەیاندنە دەنگی ئەندامەکانیان کڕیوە. لەبەر ئەوە تا داهات لەبەردەستی دوو حزبەکە بێت جەماوەر دەبێتە دوو بەش، بەشێکی سوودمەندو لەگەڵ دوو حزبەکەو بەشێکی نەیارو ناڕازی. بەم پەرتبوونەش جەماوەر ناتوانێت ببێتە هێزێکی وا بەشداریی گەمەی هێزەکان بکاتو هاوسەنگیی ئەو هێزانە بپارێزێت. تا ئەو کاتەش باسکردنی هەبوونی دیموکراسی لە کوردستانو ولاتە هاوشێوەکانی قسەیەکە تەنها ڕووکەشی شتەکانی بینیوە (هەبوونی پەرلەمان، هەڵبژاردن..).

جارێکی ترو بەکورتی: دیموکراسی وەک هەموو سیستەمێکی فەرمانڕەوایی تر پێویستی بە زەمینەیە. بەشی سەرەکیی ئەو زەمینەیەش بریتییە لە گەمەیەکی دروستی هێزەکان. جیاوازییەکەشی لەگەڵ سیستەمەکانی تر ئەوەیە بەپێچەوانەی فەرمانڕەوایی تاکە سەرکردە یان تاکە حزب فرەییو هاوسەنگیی هێزەکانی هەیە. جیاوازییەکەشی لەگەڵ سیستەمەکانی تر کە هاوسەنگیی هێزەکانیان هەیە ئەوەیە هاوسەنگییەکە کەم تا زۆر لە بەرژەوەندیی هاوولاتییە.



## پەراوێزەکان:

١. صحيح مسلم، كتاب الفتن وأشراط الساعة، باب تقوم الساعة والروم أكثر الناس.
٢. ل. ليفي و ج. روش، منهج السياسة الامريكية الداخلية، ت. الدكتور محمد ناعم سعيد، 1966، ل117.
3. Quil Lawrence, Invisible Nation: How the Kurds› Quest for Statehood Is Shaping Iraq and the Middle East, New York, 2008, p.41.
4. Michael Roskin et al, Polotical Science, an Introduction, 6th edition, 1997, p.189.
5. Ibid, p.200.

# پاساوەکانی ڕەتکردنەوەی دیموکراتیەت بەناوی شەرعیەت و ئیسلامەتیەوە





**کامەران بابان زادە**

لەدایکبووی ١٩٦٩ کۆیە، ماستەر لە مێژووی هاوچەرخ، ماستەر لە مێژووی ئیسلام. شەش بەرهەمی چاپکراوی نووسین و وەرگێڕانی هەیە. دەیان وتارو لێکۆڵینەوەی بڵاوکردوەتەوە.

بابەتەکانی تایبەت بە کۆمەڵگای مەدەنی لە (دابەشکردنی دەسەڵات)و (سەربەخۆیی دادگا)و (ئازادی رۆژنامەگەری) و (مافەکانی مرۆڤ)و (ئازادی لە تەشکیلکردنی پارتی سیاسی)و (بوونو ئازادی بۆ کاری رێکخراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی)... هتد لە پێداویستیو دەرهاویشتەکانی دیموکراتیەتن. بەڵام لە هەمووان گرنگتر (هەڵبژاردنو ئالۆگۆڕی ئاشتیانەی دەسەڵات)ە، کە پێکەوە دیموکراتیەت بەرهەمدار دەکەن. دەسەڵاتو کۆمەڵگا پێکەوە دیموکراسیەت بەرجەستە دەکەن، ئەگینا بنەماو مکیکانیزمەکانی دەقی بێدەسەڵاتن، پێکەوەش ناشیرینی دەکەن. ئەمە بۆ کۆمەڵگاو دەسەڵاتە ئەوروپیەکانو رۆژهەڵاتیەکانو ئیسلامیەکانو غەیری ئەوانیش راستە.

لەیەکەم چرکەساتی سەربەخۆیی ئەمریکا جۆرج واشنتۆن رێزی لە ئیرادەی میللەتەکەی گرت، نەریتی هەڵبژاردنو ئالوگۆڕی دەسەڵاتی بۆ دوای خۆی بەجهێشت. دەسەڵاتو نوخبەی ئەمریکی و میللەتی ئەمریکی ریزیان لە دیموکراتیەت گرتو بەرهەمو ئەنجامە باشەکانیان چنیوەتەوە.

کۆمەڵگای ئیسلامیو دەسەڵاتدارانی زاڵ بەسەر کۆمەڵگای ئیسلامیدا رەفزی دیموکراتی دەکەن، بۆیە باجی ئیستبدادو حوکمی سیوکراتی دەدەن. لێرەوە بەراشکاوی دەڵێم بۆ کۆمەڵگای ئیسلامیو مەسیحیو عەلمانیو ...هتد.. دیموکراتیەت بەو مانایەی هاوشانی ئەو چەمکانەی لەسەرەوە باسمان کرد پوخت بکەینەوە لە (لە مکانیزمێکە بۆ ئالوکۆڕی ئاشتیانەی دەسەڵات لە رێگەی بەدیارخستنی ئیرادەی راستەقینەی تاکەکان کە لە سندووقەکانی دەنگدان خۆی دەبینێتەوە لەگەڵ ناتەواویەکانی) ئەوە بەدیلی دیموکراتیەت هەر دیموکراتیەتە، لێرەدا شورا بۆ سیستمی ئیسلامیو دیموکراتیەت بۆ سیستمی کۆمەڵگای مەدەنی جیاوازی ئەوتوویان نییە. داکۆکیکارانی شەڕی ئیسلامو دیموکراتیەت لە هەر لایەکەوە بێت ناحاڵی بوونە لە هەردووکیان.

## دیموکراتیەت یان ئیسلام؟

هەڵە باوەکەی ناو کەلتووری فیکری ئیسلامی ئێمەیە، ئیسلامت دەوێ یان دیموکراتیەت؟ یان ئەگەر دیموکراتیەت وەکو دین وەربگرین ئەوە هاوبەشی دانانە بۆ خوا.

گرفت لەوەدایە ئەوانە نە لە دیموکراسی تێگەیشتوونو نە لە تیوری ئیسلامی بۆ حوکمڕانی حاڵی بوون، دیموکراتیەت تەنیا ئامرازێکە بۆ دیاریکردنی فەرمانڕەوایەتی لەرێگەی ئیرادەی مرۆڤەکانەوە. نە بەرنامەو رووئیایەی دروستە بۆ ژیان وەکو ئیسلامو خەونو خەیاڵی روئیایە بۆ کەونو کائینات وەکو مارکسیەت, ئێمە لەئیسلامدا بنەمایەکی گرنگمان هەیە ئەویش (شورا)یەو لەوێشەوە لەناو کەلتووری فقهیو مومارەسەیی هەندێ چەمکی دیکەمان هەیە وەکو ئەهلی حەلو عەقدو خەلیفەو بەیعەتو ئەهلی ئیختیار.... هتد. لەبەرانبەردا لە کەلتووری دیموکراتیەت پەرلەمانو دابەشکردنی دەسەڵاتەکانو مەدەنیەتو هەندێ چەمکی دیکەمان هەیە. ئەمانە دەکرێ وەکو چەمکی بەراوردکاری قسەی لەسەر بکرێ, بەناوی دیدی کەلتووری ئیسلامی بۆ حوکمڕانیو دیدی رۆژاواییەکان بۆ حوکمڕانی نەک ئیسلامو دیموکراتیەت. لە ئەوروپا ترسناکترین جۆری ئیستبداد هەبووەو دیموکراتیەتیش هەبووە، لە مێژووی ئیسلامی دا بەهەمان شێوە خەلیفەو دەسەڵاتدارمان هەیە لەسەر بنەمای شورا دانراوەو هەشمانە موستەبید بووە. لێرەوە ئێمە کە قسە لە دیموکراتیەت دەکەین واتە قسە لە مکیانیزمێک دەکەین بۆ حوکمڕانی کە خوێندنەوەی جیاواز هەڵدەگرێ بەڵام لە جەوهەردا پێچەوانەی سیوکراتیو ئیستیبداو رژێمی پشتاوپشتو ئیحتیکارە، لە بەرانبەردا کە قسە لە شورا دەکەین رێک پێچەوانەی ئیستیبدادو رژێمی پشتاوپشتو ئیحتیکارە. لە جەوهەردا دیموکراسیەت جوانە بەڵام دوایی ئیستغلاکراوەو دیکتاتۆریەتی لێکەوتۆتەوە.



## دیموکراتیەت لەگەڵ سەراپای ئیسلام بەراورد ناکرێ هەتا مرۆڤەکان بخاتە نێوان دوو بژاردەوە ئیسلام یان دیموکراتیەت. تەنیا ئەو بەشەی ئیسلام کە (شورایە بۆ دانانی ولایەت) لەگەڵ دیموکراتیەت بەراورد دەکرێ.

یان بۆتە دروشمبازی بێ بەرجەستەکردن لە واقیع، یان هەندێ لە کەسەکان یان حیزبەکان پێیدا سەرکەوتوون‌و دوایی نەهاتوونەتە خوارێ... ئێ خۆ ئەمە بۆ هەندێ لە دەسەڵاتی خەلیفەکانیش راستە بەناوی دادگەری ئیسلامیەوە هاتوون‌و دوایی گۆڕیویانە بۆ پشتاوپشت. کەواتە هەڵەی باو لێرەیە:

**یەکەم**/ دیموکراتیەت لەگەڵ سەراپای ئیسلام بەراورد ناکرێ هەتا مرۆڤەکان بخاتە نێوان دوو بژاردەوە ئیسلام یان دیموکراتیەت. تەنیا ئەو بەشەی ئیسلام کە (شورایە بۆ دانانی ولایەت) لەگەڵ دیموکراتیەت بەراورد دەکرێ.

**دووەم**/ ئەگەر لە نێوان نەزەری‌و کردەییدا دیموکراتیەت جیاوازی هەبێت‌و ببێتە پاساو بۆ رەتکردنەوە، ئەوە بۆ ئیسلام‌و چەمکەکانی حوکمڕانیش راستە.

### دیموکراتیەت حوکمی گەلە و ئیسلام حوکمی پەروەردگار؟

لە ئیسلامدا مافی بەرپرسیاریەتی بۆ مرۆڤەکانە، لە(ساقیفەی بەنی سەعد) یەکەم ئەزموونی بەرپرسیاریەتی بۆ جێگرەوەی پێغەمبەری خوا لە بەرپرسیاریەتی شەرعیەتی لە ئامادەبووانی موهاجیرین‌و ئەنسار وەرگرت، ئەم پرسە بە وەحی یەکلایی نەکرابۆوە، لە دیموکراتیەت‌و هەڵبژاردنی هاوچەرخیش هەروایە، مرۆڤەکان لەرێگەی هەڵبژاردنەوە بەرپرسیاریەتی هەڵدەبژێرن، وشەی (حوکمی خوا) بۆ تەشریعە نەک بەرپرسیاریەتی مرۆڤەکان، تەشریعیش دووبارە لە مەسەلەی حوکمڕانی کاری مرۆڤەکانە لە سایەی بنەما نەگۆڕاوەکان.

ئەوەی ئیشکالیەتە لێرەدا ئیسلام لەرێگەی (شورا) دادگەرانە مامەڵەی کردووە، بەوەی مرۆڤەکان یەکسان نین لەبەرانبەر وەرگرتنی راو بۆچوون لەسەر پرسی دانانی فەرمانڕەوایەتی، ئەوەش ئەسڵ‌و ئەساسی نییە. ئەوە تێکەڵ کردنی وەرگرتنی بۆچوونە لەمەڕ پرسە پسپۆڕیەکان لەلایەن ئەمیری مسوڵمانانەوە، نەک پرسی دانانی بەرپرسیاریەتی، لەو بارەیەشەوە نمونە زۆرن. ئێرە جێگەی درێژەدان بەو باسە نییە.

### ناشیرین کردنی دیموکراسیەت لەخزمەتی دیکتاتۆریەتە.

تەزویرو کاریگەری خراپ لەسەر دەنگدەرو بەکارهێنانی ترس‌و پارەبەخشینەوەو....هتد لە عەیبەکانی دیموکراسیەتن بەڵام بەمە نابێتە حەرام‌و وازی لێناهێنرێ بە بێ بەدیلێکی باشتر.

دیموکراسیەت بەمانای ئاڵوگۆڕی ئاشتیانەی دەسەڵات، بەمانای گەڕانەوەی حوکمڕانی بۆ خەڵک، ئەگەر ئەم پرسە خاوەن دروشمەکانی ئەو بوارە ناشیرنیان کردبێ، یان نمونەی جوانی دیموکراسیمان نەبێ لە جیهانی ئیسلامی، ئەی بەدیلی دیموکراسیەت چییە؟ بێ ئومێدکردنی

تاکی مسوڵمان لەو بارەیەوە دوا جار دەچێتە خزمەتی کێ؟ ئەگەر ئەم میکانیزمە ڕەتکرایەوە دەبێ چی بکرێ بۆ گۆڕانکاری؟ لەوانەیە بگوترێ شەڕکردن بۆ گۆڕینی حوکمڕانیەتی خراپە، ڕێک ئەمە ڕاستە، بەڵام دوای لەناوبردنی حکومڕانیەتی خراپ، دەبێ حوکمڕانی شۆڕشگێڕو سەرکردەی میللی کە لەڕێگەی شۆڕشی جەماوەریو شەڕەوە دیکتاتۆریەتی ڕووخاندووە. چی بکات بە دڵنیایی دەبێ قبوڵی ئاڵوگۆڕی ئاشتیانە بکات، ئەگەر نا گۆڕینی دیکتاتۆرە بە دیکتاتۆر، لەو بارەیەوە نمونەمان زۆرن. جەزائیریەکان شۆڕشیان کرد بۆ لەناوبردنی دیکتاتۆریەت بەڵام جەنەڕاڵە سەربازیەکان چوونە دەسەڵاتو زیاتر لە ٥٠ ساڵە لە دەسەڵات نایەنە خوارێ. میسرییەکان لە ساڵی ١٩٥٢ شۆڕشیان کرد بۆ لەناوبردنی دیکتاتۆریەت کەچی هەتا ئێستا سەرکردەکانی شۆڕش دیکتاتۆریانە حوکم دەکەن، کەواتە دوا جار بەدیلی دیکتاتۆریەت دیکتاتۆریەت نیە, بەڵکو حوکمڕانیەتێکی مەدەنیو ئاڵوگۆڕی ئاشتیانەی دەسەڵاتە حالەتە شەرعیو ڕەوایەکەی مرۆڤەکانە.

ڕوویەکی دیکەی ئەو مەسەلەیە ڕۆڵی ڕژێمە دیکتاتۆرەکانە بۆ ناشیرینکردنی دیموکراسیەت، بۆ مانەوەی خۆیان لە دەسەڵات، هەتا پەنا بۆ شەرعاندن دەبەن، بەوەی دیموکراسیەت لاسایی کردنەوەی کوفرەو نەریتی ئەورپییەکانە. زادەی کەلتووری عەلمانیەتەو چەندان پاساوی تر، بەمەش کورسی حوکمڕانیەتی خۆیان دەپارێزن، وڵاتانی کەنداو نمونەی ئەو جۆرە حوکمڕانیەیە.

## پاساو بۆ قوڵکردنەوەی ئیستبداد

بە هەڵە بەکارهێنانی مەسەلەی (وەلی ئەمر)، ئامۆژکاری مسوڵمان لەسەر سەبرو ئارامی لەبەرانبەر زوڵمی سوڵتان، گوێڕایەڵی مادام کوفری ئاشکرای نییە، کۆدەنگی مسوڵمانان لەدەوری سوڵتان مادام لەبەرانبەر دونیای دەرەوەی خۆی خاوەن عیزەتە، گرنگ تەوحیدی کەلیمەیە بە زەبری هێز بێت یان حیکمەتو لێکتێگەیشتن، سەرشۆڕکردنو بێدەنگیو قبوڵکردنی ئیستیبداد زیانی کەمترە لە شوڕشو هەڵگەڕانەوە، ئەوەی بە زەبری شمشێر هاتە دەسەڵات لێ قبوڵ بکەن چونکە هەڵگەڕانەوە فیتنەیەو ئاژاوەی بە دوادادێت، ...هتد. ئەمانەو چەندان پاساوی تر، فیقهی ئیسلامی بۆ حوکمڕانی لەکەدار کردووە. زۆر ورد هەندێ لە سەرچاوە فقهیەکانی قوڵیان کردۆتەوەو لە ئێستادا لەلایەن هەندێ ڕەوتی ئیسلامییەوە خراوەتە خزمەتی ئیستیبداد. کارکردن بۆ دەربازبوون لەم پاساوانە لە پێناو گەڕانەوەی شکۆی تاکی مسوڵمانو پاراستنی ئیرادەی ئازادانەی ئەرکێکی شەرعییە. گومان خستنە سەر دیموکراسیەتو لەبەرانبەردا قوڵکردنەوەی ئەو پاساوانە کارەساتی گەورەی فیکری لە بیروهۆشی یەکەیەکەی تاکەکانی کۆمەڵگای کوردستان بەجێدێڵێ.

## پرسیاری جەوهەری

یەکەم/ دیاریکردنی ماوەی مانەوە لە دەسەڵات کەلتووری ڕۆژاواییە یان ئیسلامی؟ جارێ ئەم جەدەلە هەموو بە قازانجی ئیستیبدادە، خەلیفەکانی عەباسی تا مردن لە حوکم ماونەتەوە، بەڵام سەرچاوە شەرعیەکان سازشیان نەکردەوە لەسەر ئەو بنەمایەی خەلیفە ئەگەر (سەلامەتی حەواس) و (سەلامەتی لاشە)و (گورجوگۆڵیەک کە بتوانی دادگەرانە ئاگاداری ئومەت بێت) لەدەست دا شەرعیەتی مانەوەش لە فەرمانڕەوایەتی لە دەست دەدا. ئەمە سەرەتایەکە هێنانە خوارێی دەسەڵات پێش مردن.

دووەم/ ئایا ئیسلام لەگەڵ ئاڵوگۆڕی ئاشتیانەی دەسەڵاتە یان نا؟ خەلیفەکان تا مردن لە دەسەڵات ماونەتەوە. خەلیفەکانی ڕاشیدی بۆ حوکمی ڕەشیدیان بووە، چونکە بە شورا هاتوون، زانایان لە هەموو حالەتە ئاساییەکان دانیان بە



# داكۆكیكارانی شەڕی ئیسلام و دیموكراتیەت لە هەر لایەكەوە بێت ناحاڵیبوونە لە هەردووكیان.

خەلافەتی دوور لە شورا دا نەناوە. مەرجی قبوڵی خەلافەت (شورایە)، لەگەڵ دانانی بە فەرمانڕەوا لە چوارچێوەی مەرجەكان مەرجی هێنانەخواریش دیاری دەكرێ.

سێیەم/ باشە مادام دانانی بەرپرسیارەتی بە شورایە، واتە ئیسلام لەگەڵ ئاڵوگۆڕی ئاشتیانەی دەسەڵاتە، باشە میكانیزم بۆ ئەو ئاڵوگۆڕە چۆنە؟ ئەگەر خەلیفەكانی راشیدی وەربگرین هەریەك بە جۆرێ خراوەتە بەردەم پرس‌وڕا، باشە دەبێ بۆ ئەم سەردەمە پرس‌وڕا چۆن بكرێ بۆ دانانی بەرپرسیاریەتی. بە دڵنیایی لەگەڵ گەشەی دانیشتوان‌و پەرەسەندنی ژیارو ژیان دەبێ بگەڕێین بە دوای پلانێك كەس پەراویز نەخرێ.. ئەمە چۆن؟ لێرەوە پێویستیمان بە تەوافوقی نێوان (شورا)و (دیموكراسیەت) هەیە.

## (شورا)ی ئیسلامی و (دیموكراسیەت)ی رۆژاوا لە جەوهەردا یەك مەبەست دەپێكن.

تێگەیشتن لە مەبەستی شوراو میكانیزمی شورا بۆ دانانی بەرپرسیاریەتی ئیسلامدا، چەمكێكی یەكجار گرنگە، كلیلی كردنەوەی گرێ كوێرەی ئیستیبدادە، بەڵام تێنەگەشتن لە مەقاسیدی ئەم چەمكەو ئەو بوارانەی ژیانی پێغەمبەر دروودی خوای گەورەی لێ بێت لە مومارەسەكردندا گرفتی گەورەی بۆ دروست كردووین.

شورا بۆ دانانی حوكمڕانی ئیلیزامیەت‌و نا ئیلزامیەتی تێدا نییە، ئەوەی پێی دەڵێن (مولزەم)و (مولیزم).. شورا بۆ دانانی ولایەت‌و بەرپرسیاریەتی لە ئیسلامدا پابەندی (مولزەم)ەو تەواو، واتە كاتێكی پرس‌و دەنگدان دەكرێ بۆ دانانی بەرپرسیاریەتی ئەوە پابەندیە بە ئەنجامەكەی، ئەوەی دیكە لە مومارەسەی شورا ئەو دابەش كارییەی تێدایە، واتە كاتێك ئەمیر دوای دانانی بە ئەمیر بۆ مەسەلەیەكی كۆمەلایەتی یان پسپۆڕی لە بوارێك لە بوارەكان شورا دەكات دەتوانی پابەند بێت بە بۆچوونی بەرانبەر یان پابەند نەبێت، بەڵام شورای دانانی بەرپرسیاریەتی (تعین الولایة) پابەندیەو ئارەزوومەندانە نییە.

لە (بەیعەی عەقەبەی دووەم)و لە (دانانی هەر چوار خەلیفەكەی راشیدی)و لە (پرسی ئەهلی حەل‌و عەقدو ئەركی لە دانانی خەلیفە) لە كتێبە فقیەكانداو هەموو ئەو بابەتانەی تایبەتە بە شورا لە پێناو دانانی حوكمڕاندا ئەسڵ بریتیە لە:

**یەكەم: پابەندی بە ئەنجامی زۆرینە, ملكەچبوونی كەمینە.**

**دووەم: ئیسلام دوورە لە شەرعیەتدان بە ئیستبدادو حوكمی پشتاوپشت.**

**سێیەم: پرسی حوكمڕانی پرسێكی ئومەتەو سیوكراتی نییە، بە هیچ پاساوێك ئەو مافە لە مرۆڤەكان وەرناگیرێتەوە.**

هەر چوار خەلیفەی راشیدی لەسەر ئەم بنەمایانە دانراون:

**١. بە شورا شەرعیەتیان وەرگرتووە.. (بە میكانیزمی جیاواز)**

**٢. بە هەڕەشەو ئیستیبداد نەهاتوون بۆ سەر كورسی خەلافەت.**

**٣. دوای خۆیان کەسیان دیاری نەکردووە لە خزمو نزیکەکانیان.**

ئەم خاڵانە بۆ دیموکراسیەتیش هەر وایە، ئەگەر شورای ئیسلامی بۆ دانانی بەرپرسیاریەتی لە خەلیفەکانی راشیدیەوە بەردەوام بوایە، لەرووی نەزەریو کردەییەوە کاری پێبکرایە، قۆناغەکانی خەلافەتی ئیسلامی لەسەر شوراو بە شورا بەڕێوە بچوبایە، لەگەڵ گەشەی ئاستی فیکریو سیاسیو سیوسولۆژی کۆمەڵگا شورا لە پرسی حوکمڕانی هەبوایە، ئێستا زۆر لە پرسیەکانی وەکو پرسی بەشداری ژن لە هەڵبژاردنو بەشداری فاسقو ئەهلی بیدعەو جیاوازی ئاقڵ و کەم ئەقڵ لەدەنگدان کە هەندێک کردوویانەتە پاساوی بێشەرعی بوونی دیموکراسیەتی هاوچەرخ چارەسەر کرابوو، چونکە مادام لە جەوهەردا دەسەلات لە مرۆڤەوە بۆ مرۆڤەو بە وەحی جیگێر نابێ، دەرچەی شەرعی بۆ کۆی گرێکانی دیکەی ئەو بوارە ئاسانە.

## قەیرانی هوشیاری دەوڵەتداری لە لای مسوڵمانو رەوتی ئیسلامی

سەرچاوەکانی خوێندنەوەی زۆربەمان پێداگریە بۆ هوشیاری تاکی مسوڵمان لە ئاستی تاک بۆ خێزانو دراوسیو هەتا گەڕەکو خزمو کەس یان بە تەعبیرێکی دیکە سەرچاوەکانی هوشیاری ئێمە بۆ کۆمەڵگا لە رەهەندی موعیزەو ئامۆژگاری تەجاوو ناکات بۆ دامەزراوەیی دەوڵەتدارییو بەڕێوەبردن، لەسەرچاوە ئیسلامییەکانی پێشوو ئەگەر خەلافەتی ئیسلامی و شێوازی حوکمڕانیش لە سکەی خۆی لایدا بێ، کۆمەڵێک سەرچاوەی گرنگمان هەیە بۆ حوکمڕانیو قسەی جدیمان دەست دەکەوێ لەسەر چەمکەکانی بەرێوەبردنی کۆمەڵگا لە چوارچێوەی دەوڵەتداری لە کتێبەکانی (ئیمامی الحرمین -جوینی) لە کتێبی (الغیاث الامم)و (ابن القیم) لە کتێبی (الطرق الحکمیة)و (الاعلام الموقعین)و (ابن التیمیة) لە کتێبی (السیاسة الشرعیة في اصلاح الراعي و الرعیة)و (الماوردی)و (ابو یعلی) لە کتێبی (احکام السلطانیة) و (ابو یوسفی قازی) لە کتێبی (الخراج)..چەندانی تر، کە زۆر بە وردی قسەیان لەسەر چۆنیەتی جێگیرکردنی فەرمانڕایەتیو پایەکانی دەوڵەتدارییو دەرامەتو بوارەکانی کردووە. میکیانیزمی وردیان بۆ داناوە, بەڵام دەبێ ئەو راستیە بزانین ئەوە فیقهی حوکمڕانییە بۆ سەردەمی ئەوان، بەڵام ئەو بوارە لەگەڵ گۆڕانکاریەکان گەشەی پێ نەدرا. لە جیهانی ئیسلامی لە سەدەکانی حەوتی زاینی بۆ سێزدەی زاینی بە دیوی مومارەسەو بە دیوی نەزەرەی ئەو پرسە زۆر ساردو سڕ بووە، دوای سەدەی سێزدەی زاینی کپ بۆوە، لە ئەوروپا بە پێچەوانەوە لەو رۆژگارە کپو لە سەدەی ١٨و ١٩ گەرمو گوڕ بوو، گەشەی شێوازی حوکمڕانیو قوڵکردنەوەی چەمکەکانی ئەو بوارە لەو دوو سەدەیەی جیهانی ئیسلامی تێیدا خەوتوون گەشەی کرد.

ئێستا ئێمە بە باڵای قۆناغی زێڕینی مێژوویی خۆمان دا هەڵدەڵێینو نەمانتوانیوە بۆ شایی سەدەی ١٣ بۆ ئێستا پڕ بکەینەوە، ئەوان بە درنگەوە هاتنو ئێستا بەردەوامن.

لەو نێوەندەش بەهۆی قوڵکردنەی ناکۆکی ئایدۆلۆژی نەمانتوانیوە هەردوو چەمکی دیموکراسی لای ئەوانو شورای لای خۆمان بخەینە چوارچێوەی بەراوردکاریەوەو بۆ جیهانی ئیسلامی مکانیزمێکی تازەی لێ بەرهەم بهێنین، هەم ئیسلامیانە بێتو هەم سەردەمیانە. لەبەرانبەردا حوکمڕانی جیهانی ئیسلامی زۆر بە خراپی بەڕێوە دەچێتو خەرێکی شەڕی چەمکەکانە بە ئاوازو خوێندنەوەی بەرتەسکو زۆر رووکەشانە. رەتکردنەوە بە بێ بەدیل، ئەوەی قبوڵمان نیە لەدەرگاوە پشکنینی بۆ بکەینو بێتە ژوورەوە لێ سوودمەند بین، لە پەنجەرەوە بە بێ پشکنینی ئێمە هاتۆتە ژوورەوەو پەشێوی خستۆتە ناومانەوە. رۆژانەی مەدحو سەنای چارەسەری ئیسلامیانەی خۆماڵیانەی خۆمان دەکەینو دەستەوەستانین لە ئاست بەرجەستەکردنی بۆ واقیع.



## سەرچاوەکانی ئەم باسە:

١- زنجیرەیەک موحازەرە لەسەر ئیسلامو حوکمڕانی لە خۆم ئامادەکردووە.

٢- سەرچاوە ئیسلامیەکانی دیرینەکانی وەکو: غیان الامم في التیاث الطلم- الجویني, السیاسة الشرعیة في اصلاح الراعيء الرعیة, الطرق الحکیمة, و الاعلام الموقعین ي ابن القیم, زۆر تر

٣- ئەو سەرچاوانەی نووسەرە ئیسلامیەکان تازە نووسیویانە وەکو: وەکو (القیم السیاسة في الاسلام- اسماعیل عبدالفتاح, , السیاسة و المجتمع في عصر الراشدي- ابراهیم حرکات, التعددیة الحزبیة السیاسیة في ظل الدولة الإسلامیة، وأنظمة الحکم المعاصرة, الخلافة احکامها- حاکم المطیري, اشکالة السیاسیة بین الدیمقراطیة و الاسلام- باسل عبدالمحسین, جیاوازی لە نێوان ئیسلامو دیموکراتیەت- ریبین عومەر, العلمانیة و اللیبرالیة و الدمقراطیة و دولة المدنیة الحدیثة في میزان الاسلام- محمد عبدالعزیز ابو النجا, تحریر الانسان و تجرید الطغیان-حاکم المطیر,, تفکیک الاستداد- محمد العبدالکریم, الخلافات السیاسیة بین الصحابة- محمد المختار الشنقیتي, الحاکیمة في الاسلام – علي عبدالرزراق, سێ بەرگی کتیبەکەی م/عەلی باپیر بەناو دەوڵەتداری لە ئیسلامدا, کتیبەکانی د.احمد الریسوني تایبەت بە المقاصد و زۆری تر.

٤-ئەو سەرچاوانەی نوسەرە عەلمانیەکان نوسیویانە لەسەر دیموکراتیەت: (المشارکة السیاسیة و الدمقراطیة..- د.سامیة خضر صالح, مفهوم الانتخابات و الدیمقراطیة, دیموکراتیەو توخمە پێکهێنەرەکانی, کۆمەڵێک نوسەر, دیموکراسیو ئیسلامی سیاسی- فوئاد سدیق, دونیای راستەقینەی دیموکراسی- س بی میبیکرسۆن, هەموو بەرگەکانی موسوعة السیاسیة و چەندانی تر.

# دیـموکراسی

## نە بەدیلی ئیسلامە و نە تەواوکاریشـــیەتی (لەکۆمەڵگەی موسوڵماندا)





**جەلال ئەحمەد**

لەدایکبووی ساڵی ١٩٦٥ لە هەڵەبجە، بکالۆریۆس لە یاسا، سەرنووسەری گۆڤاری رابەر بووە، چەندین وتارو بابەتی لەرۆژنامەو گۆڤارەکاندا بڵاوبووەتەوە.

ئەم بابەتە قسە و باسی زۆری لەسەرکراوەو ڕاجیایی زۆریشی لەسەر هەیە، بۆیە هەرکەس هەرچی بڵێت لەم بارەیەوە لەچوارچێوەی ڕاوبۆچوون تێناپەڕێت و بابەتێک کە خۆی لەخۆیدا فرەڕەهەند وفرە چەشن و فرە مۆدێل بێت، بەدڵنیاییەوە ڕاکانیش لەسەری جیاواز دەبن، جگەلەوەش ئەوانەی قسەی لەسەردەکەن جیاوازن لەنێوان ئیسلامی وعەلمانی ولیبراڵ و سەرمایەدار و سۆشیالیست و نەتەوە پەرست و نێونەتەوەیی (ئینتەرناشناڵ)، چەپ و ڕاسترەو، دووبارە هەریەک لەمانەش توندڕەو و میانڕەو و شلڕەویان هەیە، بۆنموونە بەناوی ئیسلامەوە ئەمپەڕو ئەوپەڕەکەی هەر خوایان یەکەو ڕایەکانیان - ئاسمان و ڕیسمانن- بگرە لای هەندێک لە خوایەکەشدا یەک ڕانین ئەمیان ئەویتریان بەکافرو زندیق و لەدین دەرچوو دەزانێت و لەم دنیا کوشتنی بە واجب دەزانێت بۆ قیامەتیش بە ئەهلی جەهەننەمی دەزانێ، بەهەمان شێوەش عەلمانی و ناسیۆنالیست و ئەوانی تریش .

بۆیە لەوەها حاڵەتێکدا باسکردن لە هەر شتێک دەبێتە جێگای ڕاجیایی، بۆیە من چاوەڕێ نیم کۆدەنگی لەسەر دیموکراسیەت دروست ببێت، بەڵام بەپێویستی دەزانم دید و بۆچوونی خۆم لەسەر دیموکراسی بنووسم، ئەو کات بەرامبەر ئازادە چەندە لای پەسەندە و چەندە دژی دەوەستێتەوە، لەوکاتەشدا باشتر وایە منیش و ئەویش ڕای یەکتر قبوڵ بکەین بۆئەوەی بتوانین پێکەوە بژین، دواجاریش ڕای من و ڕای ئەویش هەر ڕایەو قسەی یەکلاکەرەوە نییە.

سەرەتا با لەپێناسەوە و دواتریش لەبنەماو خەسڵەتەکانی دیموکراسییەوە دەستپێبکەین، دواتر سەرنج و تێبینیەکان و لە کۆتاییشدا دەرئەنجام بخەینەڕوو.

لە پێناسەی کورت و پوختی دیموکراسیدا دەوترێ: (الديمقراطية نظام سياسي واجتماعي، حيث الشعب هو مصدر السيادة و السلطة، فهو يحكم نفسه عن طريق ممثلين عنه، وهي تعني في الأصل حكم الشعب لنفسه - موقع ابن خلدون، اسس النظام السياسي الديمقراطي،٢٠١١/٢/١٣).

بەو پێیە، دیموکراسی سیستمێکی سیاسی کۆمەڵایەتییە کە گەل خۆی تیایدا سەرچاوەی ڕەوایەتیدانە بە دەسەڵات، واتە خۆی دەسەڵاتدارە بەسەر خۆیەوە، لەڕێگەی ڕەوایەتیدان بە دەسەڵاتێک کە نوێنەرایەتی هاوڵاتیانی ئەو گەلە دەکات و خۆی هەڵیبژاردووە، واتە فەرمانڕەوایەتی هەرگەلێک مافی خودی هاوڵاتیانی ئەو گەلەیە.

بەکورتی ئەم سیستمە لە حوکمرانی بۆ ڕەتکردنەوەی سیستمی پاشایەتی پشتاوپشتی بنەماڵەکان ودەسەڵاتی کەنیسە هاتووە، کەبەناوی خواوە فەرمانڕەوایەتیانکردووە و دەسەڵاتیان بۆ خۆیان قۆرخکردووە و بوون و مانەوەیان لە دەسەڵاتدا لە سەروی ویست و حەزو ئیرادەی هاوڵاتیانەوە بووە و خەڵک مافی گۆڕینیانی نەبووە.

لەکاتێکدا ئیسلام نەڕێگەی بە گواستنەوەی پشتاوپشتی دەسەڵاتداوەو نە هیچ کەسێکیش (جگە لە پێغەمبەران) بەنوێنەری خواو (معصوم) و پارێزراو لە ڕەخنە دەزانێت.

پێغەمبەری خوایش (صلى الله عليه وسلم) پاش کۆچی دوایی خۆی نەکەسی دەستنیشانکرد بۆ جێنشینی خۆی و نەهیچ میکانیزمێکیشی دیاریکرد بۆ دەستنیشانکردنی ئەو جێنشینە، وەک ئاماژەیەک بۆ دەستکراوەیی موسوڵمانان لەو بارەیەوە، تەنانەت پێگە و نازناوی (خليفه)ش دوای کۆچی دوایی ئەبوبەکر جێگەی قسە لەسەرکردن بوو، بۆیە عمری کوڕی خطاب ووتی ئەبوبەکر جێنشینی پێغەمبەربوو(صلى الله عليه وسلم)، بۆیە مافی خۆی بوو پێی بوترێ (خليفه)، بەڵام من جێنشینی ئەبوبەکرم نەک پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، بۆیە نازناوی(أمير المؤمنين)ی لێنرا.

جگە لەوەش لە سەردەمی فراوانبوونی دەوڵەت و دەسەڵاتی ئیسلامیشدا هەموو ئەو هەرێم و ناوچانەی دەکەوتنە سنوور و ژێردەسەڵاتی ئیسلامیەوە، بژاردەی یەکەم مانەوەی دەسەڵاتدارانی پێشوو بووە لەدەسەڵاتدا، یان کەسێکیتر هەر لە خۆیان کەشیاوی ئەوکارەبێت.

واتە ئیسلام هیچ ڕێگر نییە لە دەستنیشانکردنی دەسەڵاتداران لە ناو خودی هاولاتیاندا بەبێ هەڵاوێردن و لە لایەن خودی هاولاتیانیشەوە، بە هەر شێوازێکیش کە خۆیان بە گونجاوو دادپەروەرانەی بزانن.

لە سیستمی دیموکراسیدا هاولاتیان خۆیان دەسەڵاتدارانی خۆیان دادەنێن، لەڕێگەی هەڵبژاردنەوە و لەچوارچێوەی گرێبەستێکی کۆمەلایەتیدا و بۆ کاتێکی دیاریکراو، بۆ نموونە ئەگەر زۆرینەی هاولاتیان پابەندی ئاینی ئیسلام بوون و ڕێزیان لە بنەماکانی دەگرت، ئەوا متمانە دەدەنە کەسانێک کە سنووری بنەماکانی ئایین نەبەزێنن و دەسەڵات بە حەزی ئەوان دەبێت، ئەگەریش بە پێچەوانەوە بوو واتە ئەوان کەمینە بوون، یان بوون بە کەمینە، ئەو کات کەمینەکە بەپێی سیستمی دیموکراسی ( وەک پیکهاتەیەکی ئەوە کۆمەڵگەیە) ڕێزلێگیراو دەبن و مافەکانیان پارێزراو دەبێت و تەنها دەتوانن دەست بە ئاینەکەیانەوە بگرن و واز لە دەسەڵات بهێنن بۆ زۆرینەکە، لە ڕاستیدا موسوڵمانان لە کاتێکدا کە زۆرینە و دەسەڵاتداربن دروشمەکەیان (....فَمَن شَاءَ فَلْيُؤْمِن وَمَن شَاءَ فَلْيَكْفُرْ...الكهف /٢٩) دەبێت، ئیتر بە کەمینەیی بەنیازن بڵێن چی؟!.

سەبارەت بە گرنگترین خەسڵەت و بنەما گشتی و دیارەکانی دیموکراسیش، هەڵوێستەیەک لەسەر هەریەکەیان بە جیا دەکەین تابزانین چەندە لەگەڵ بنەما نەگۆڕ و جێگیرەکان و ڕۆح و فەلسەفەی شەریعەتی ئیسلامیدا دێتەوە یان دژو پێچەوانەیە.

## گرنگترین خەسڵەت و بنەما گشتی و دیارەکانی دیموکراسی

**١/شەرعیەتی سیستمی سیاسی، واتە دەسەلات و حوکمڕانی بە ڕەزامەندی هاولاتیان بێت و لە لایەن خەڵکەوە هەڵبژێردرابێت.**

واتە پێویستە دەسەلاتدار ڕەوایەتی لەلایەن خەڵکەوە بەدەستهێنابێت و جێگەی قبووڵ و ڕەزامەندی هاولاتیان بێت، نەک ستەمکارو خۆسەپێن بێت وبەزۆر و زۆرداری وڵات بەڕێوە ببات.

لە ڕاستیدا جوانترین و گەشاوەترین نموونەی کرداری ئەم بنەمایە لە سەرەتای دەسەلاتی ئیسلامی و لە لایەن یەکەم دەسەلاتداری ئیسلامی پاش پێغەمبەری خوا، کە ئەبوبەکری صدیق بوو، گوزارشتی لێکراو کرایە بنەما، کاتێک لە وتاری دەستبەکار بوونیدا بە خەڵکەکەی ووت:

ئەی خەڵکینە من کراومەتە دەسەلاتدار و کاربەدەستی ئێوە هەرچەند من باشترینی ئێوە نیم، گوێڕایەڵم بن تائەو کاتەی فەرمانی خواتان بە دروستی بەسەردا جێبەجێدەکەم، هەرکاتیش لامدا ئەوا ڕاستم بکەنەوە...

داهێنانی ئەنجوومەنێکیش بەناوی (ئەهلی حەل و عەقد) واتە ئەنجوومەنێک کە دەسەڵاتی بەستن و هەڵوەشاندنەوەی گرێبەستی ڕەوایەتیدانی بەدەسەڵاتی کەسی یەکەم هەیە لە ڕێگەی دەنگدانەوە، ئەویش نموونەیەکی ترە لەو بارەیەوە، چونکە ئەو ئەنجوومەنەش بە جۆرێک لە جۆرەکان کە بۆ ئەو سەردەمە لەتوانادابووە هەڵبژێردراوی خەڵک بوون و نوێنەرایەتی خەڵکیان کردووە و ئەوان ڕەوایەتیان داوە بەو دەسەلاتە (ئەم جۆرە لە هەڵبژاردنی ناڕاستەوخۆی سەرۆک تا ئێستاش لە هەندێ وڵاتی دیموکراسی وەک ئەمریکا بەڕێوە دەچێت، واتە خەڵک نوێنەرانی خۆیان بۆ ئەنجوومەنێک هەڵدەبژێرن کە ئەو ئەنجوومەنە کاریان تەنها هەڵبژاردنی سەرۆکە).

**٢/ گرتنەبەری میکانیزمی (هەڵبژاردن) بۆ دەستنیشانکردنی نوێنەرانی خەڵک لە لایەن خودی هاوڵاتیانەوە.**

لەڕاستیدا ئەگەر بەدیلی هەڵبژاردن بۆ دەستنیشانکردنی دەسەڵاتداران و نوێنەران، دەسەڵاتی بنەماڵەیی و پشتاو پشت بێت یان خۆکردن بە نوێنەری خوا و ئیدیعای شەرعیەتی ئاسمانی بێت (جگە لە پێغەمبەران) ئەوا ئیسلام نەرێگەی پێداوەو نە پەسەندیشی دەکات.

لە ڕوویەکی تریشەوە هەڵبژاردن واتە ڕای زۆرینە، ئەگەر پێچەوانەکەی وەربگرین دەکاتە خۆسەپاندنی کەمینە، کە ئەوەش دادپەروەری تێدا نییە. لەگەڵ سادەیی وسەرەتابوونی ژیان لەو سەردەمەدا، نموونەی سادەی پەیڕەوکردنی هەڵبژاردنی نوێنەر و (نقیب) داهێنانێکی ئیسلامی بووە و ئەگەر لێی بگەڕانایە ئێستا سیستمی هەڵبژاردن لە لووتکەی هەرەبەرزی پێشکەوتندا دەبوو.

٣/ **هەبوونی دەوڵەتی یاسا**، کە ڕێز لە هاوڵاتیان بگرێت و مافەکانیان بۆ دابین بکات و سنووردانان بۆ تاکڕەوی و یاساشکێنی دەسەڵاتداران لە ڕێگەی دامەزراوەکانی تایبەت بە پارێزگاری لە مافی گشتی و هاوڵاتیان.. سەروەریی یاسا، ئەگەر لەسەر زەویدا جێبەجێکردنێکی هەبووبێت ئەوە لە شەریعەتی ئیسلامدا بووە ، لە ئیسلامدا کەسەکان بە حەقدا دەناسرێنەوە نەک بە پێچەوانەوە، واتە ڕاست ئەو کەسەیە کە لەسەر حەق بڕوات و پەیڕەوی لەو حەقە بکات ، نەک کەسێک بەحەق بزانرێت بێ گوێدانە ئەوەی هەرچی بکات.

نموونەی هەرە بەرزی یاسا سەروەریش ئەوەیە کە پێغەمبەری ئیسلام فەرموویەتی هۆکاری لەناوچوونی ئوممەتە پێشینەکان ئەوەبووە کە ئەگەرخەڵکی لاواز تاوانی بکردایە یاسایان بەسەردا جێبەجێدەکرد بەڵام ئەگەر خانەدان بوایە چاوپۆشی لێدەکراو وازی لێدەهێنرا.

دەسەڵاتدار بە حوکمی پێگەکەی، پێویستە لە سەری نموونەی هەرەبەرزی پابەندبوون بێت بەو بەرنامەو یاساو شەریعەتەی کە بەنیازە بەسەر خەڵکیدا جێبەجێی بکات نەک بە پێچەوانەوە، ئیسلام زۆر بە جدی و زۆر بەتوندی پێداگیری لەسەر ئەم بنەمایە دەکات هەرلە مامەڵەیەکی ئاساییدا، چی بگات بە دەسەلات و دەسەڵاتداران (أَتَأْمُرُونَ النَّاسَ بِالْبِرِّ وَتَنسَوْنَ أَنفُسَكُمْ وَأَنتُمْ تَتْلُونَ الْكِتَابَ أَفَلَا تَعْقِلُونَ) البقرة/٤٤ .

ئەبوبەکری صدیق بە خەڵکی ڕاگەیاند کە (ئەی خەڵکینە بەهێزترینتان لای من لاوازترینە تا مافی خەڵکی لێدەسەنمەوە، لاوازترینیشتان لای من بەهێزترینە تا مافەکەی بۆ وەردەگرمەوە).

عمری کوڕی خطاب کاتێک بیستی کوڕی والی میصر سوکایەتی بە کەسێکی قبطی کردووە و ئازاریداوە، زۆر تووڕە بوو و سزای کوڕی والی داو سەرزەنشتی باوکیشیکرد، چونکە پێیوابوو کە کوڕەکەی لە پەنای دەسەڵاتەکەی ئەودا ئەو ستەمەی کردووە،بۆیە بە تووڕەییەوە ڕوو بە والی ووتی: (متى استعبدتم الناس وقد ولدتهم امهاتهم احرارا).

**٤/ سەربەخۆیی و جیکاردنەوەی هەرسێ دەسەڵاتەکانی یاسادانان**، جێبەجێکردن، دادوەری.

بۆ بابەتی سەربەخۆیی دادگاکان وتێکەڵنەکردنی دەسەڵاتەکان، تەنها نموونەی ڕاوەستانی علی کوڕی ئەبوطالب لە بەردەم قازیدا، لە کاتێکدا ئەو خەلیفەی موسوڵمانان بوو، بەهۆی سکاڵای هاوڵاتیەکی جوولەکە و بە شایەت وەرنەگرتنی حەسەنی کوڕی وحوکمکردنی قازی لە بەرژەوەندی کابرای جوولەکە بەسە بۆ بەڵگە لەسەر ئەم بابەتە.

تەنانەت عەلی کوڕی ئەبو طالب ڕازی نەبووە کە قازی بە( امیرالمؤمنین) ناوی ببات لەکاتی دادگاییکردنەکەدا، وتوویەتی ئێستا ئێمە لە بەردەم دادگادا وەک یەکین.

**٥/ دەستەبەرکردنی ماف و ئازادییەکان، ئازادی ڕادەربڕین، بیروباوەڕ، کۆبوونەوە، ڕۆژنامەگەری،.هتد.**

لە ئیسلامدا مرۆڤ ڕێزلێگیراوە وەک مرۆڤ

بەدەر لە بیروو بۆچوون و کارو کردەوەکانی، لە دنیاشدا ڕێگە پێدراوە بۆ هەڵوێست وەرگرتن لە ئایین بە هەردوو باری ئەرێنی و نەرێنی (....فَمَن شَاءَ فَلْيُؤْمِن وَمَن شَاءَ فَلْيَكْفُرْ...) الكهف /٢٩. و پاداشت و سزای ئەو هەڵوێستەشی بۆ هەڵگیراوە بۆ ڕۆژی دوایی و پاش زیندووبوونەوە، هەروەها ئازادیشە بۆ هەڵبژاردنی ڕێگەی چاکەکاری یان خراپەو تاوانکاری(لە گەڵ ئەوەی ڕێگە پێدراو نیە بۆ زیانگەیاندن و ئازاردانی خەڵک و سزای بۆ دانراوە، وەک هەر بەرنامەو سیستمێکی تری دونیا )، لە ئیسلامدا بە زۆرکردن لە خەڵک بۆ باوەڕهێنان و موسوڵمانبوون ئەو کەسە دەبێتە (منافق) نەک موسوڵمان، چونکە مەرجی موسوڵمانبوون قەناعەت و ڕەزامەندی و ڕاستگۆییە (وَلَوْ شَاءَ رَبُّكَ لَآمَنَ مَن فِي الْأَرْضِ كُلُّهُمْ جَمِيعًا أَفَأَنتَ تُكْرِهُ النَّاسَ حَتَّى يَكُونُوا مُؤْمِنِينَ) يونس/٩٩ ، خەڵک ئازادن کە باوەڕئەهێنن یان نا، بەڵام ئازاد نین سوکایەتی بە ئایینی خەڵک بکەن ئەگەر کەمینەش بن، چی بگات بە ئایینی زۆرینەی خەڵک.

خەڵکی دەشتەکی ڕەخنەی توندی لە پێغەمبەر گرتووە (صلى الله عليه وسلم) و ئازادیش بووە، قورئانیش دەفەرموێت ئێوە جنێو مەدەن بە خواکانی ئەوان با ئەوانیش جنێو نەدەن بە خواکانی ئێوە بەنەفامی، لە هەموو حاڵەتێکیشدا ڕای جیاواز شتێکەو جنێو و سوکایەتی بابەتێکی ترە و ڕێگەپێنەدراوە. ئەوەش دەوترێ سەبارەت بە ڕێگە نەدان بە پەشیمان بوونەوە لە ئیسلام و کوشتنی ئەو کەسەی لە ئیسلام پاشگەز دەبێتەوە، قسەی زۆری لەسەرەوپێچەوانەیە لەگەڵ ڕۆحی ئیسلام و بنەمای(....فَمَن شَاءَ فَلْيُؤْمِن وَمَن شَاءَ فَلْيَكْفُرْ...)الكهف /٢٩ و (لَعَلَّكَ بَاخِعٌ نَّفْسَكَ أَلَّا يَكُونُوا مُؤْمِنِينَ) الشعراء/٣.

بۆیە دەوترێ مەبەست پێی( المرتد المحارب) ە واتە ئەو موسوڵمانەی پاشگەز دەبێتەوە ولە بەرەی دژ بە موسوڵمانانندا دەجەنگێت، واتە هەرکات موسوڵمانێک پاشگەزبوویە و لەبەرەی دژایەتیکردنی ئیسلامدا وەک جەنگاوەرێک دژایەتی دەکرد ئەوکات موسوڵمان بوونەکەی پێشووی نابێتە پارێزبەندی بۆی. ئیسلام چەندین بنەما و ڕێنمایی بۆ گفتوگۆ و ڕاگۆڕینەوە داناوە، ئەوەش ئاماژەیە بە ڕێگەپێدانی هەبوونی نەیار و ڕای جیاواز، تاوەکو ئەو حیوارەی لە گەڵدا بکرێت،

( قُلْ هَاتُوا بُرْهَانَكُمْ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ) البقرة/١١١ ، (قُلْ هَٰذِهِ سَبِيلِي أَدْعُو إِلَى اللَّهِ عَلَى بَصِيرَةٍ أَنَا وَمَنِ اتَّبَعَنِي )يوسف/١٠٨ ، (إِنَّا أَوْ إِيَّاكُمْ لَعَلَى هُدًى أَوْ فِي ضَلَالٍ مُّبِينٍ) سبأ/٢٤ ، (وَجَادِلْهُم بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ) النحل/١٢٥.

**٦/ ڕێزگرتن لە مافی پێکهاتە جیاوازەکانی ناو کۆمەڵگە لە( ئاین، نەتەوە، ڕەگەز.....هتد ).**

هەڵوێستی ئیسلام لەم بارەیەوە زۆر ڕوون و ئاشکرایە و یەکەم دەستووری نووسراوی مەدینە لە نێوان پێکهاتە جیاوازەکانی دانیشتوانی مەدینەدابوو، کە تێیدا پێکەوەژیان بەرجەستە بوو وە هاوڵاتیبوون کرایە بنەما و ماف و ئەرکەکان دەستنیشان کران و (لهم ما لنا و عليهم ماعلينا) نووسرایەوە و کاری پێکرا. بۆ مرۆڤەکان بەگشتی(الناس سواسية كأسنان المشط) و بۆ نەتەوە جیاوازەکان (لافضل لعربي على أعجمي الا بالتقوى) بەرنامە و درووشمی مامەڵەکردن بوو. بۆ ژنان (ولهن مثل الذي عليهن بالمعروف) ڕاگەیەنرا. بۆیە لەمبارەیەوە هەرچی دابهێنرێت ناگات بەوەی ئیسلام هێناویەتی.

**٧/چەسپاندنی بنەمای دەستووریبوون** واتە هەبوونی دەستوور و ڕێزلێگرتنی و گەڕانەوە بۆدادگا لەکاتی ڕاجیایی لە سەری، بەو پێیەی هەریەک لە دەسەڵات و هاوڵاتیانیش پابەندی بەندەکانی دەستووربن و لەکاتی ناکۆکی لەسەر جێبەجێکردنی برگەکانی دەستوور هەموان بگەڕێنەوە بۆ لای دادگا بۆ یەکلایی کردنەوەی.

**ئەم بابەتە یەکێکە لە بنەما گرنگ و هەستیار و جەوهەریەکان، لەبەر چەند هۆیەک:**

یەکەم/ هەبوونی دەستوور بەمەرج گیراوە،



**له ئیسلامدا کەسەکان بە حەقدا دەناسرێنەوە نەك بە پێچەوانەوە، ڕاست ئەو کەسەیە پەیڕەوی لە حەقە بکات، نەك کەسێك بەحەق بزانرێت بێگوێدانە ئەوەی هەرچی بکات.**

واتە پێویستە وڵات دەستووری هەبێت.

دووەم/ مەرجە ڕەشنووسی دەستوور پاش ئامادەکردنی بخرێتە بەردەست هاووڵاتیان بۆ پەسەندکردنی لە ڕێگەی ڕاپرسییەوە، واتە مادەکانی دەستوور تەعبیر لە ڕاو بۆچوونی زۆرینەی خەڵک دەکات و زۆرینە بە ئاسانی دەتوانن مافەکانی خۆیان زامن بکەن و لە دەستووردا جێگیری بکەن.

سێیەم/ گۆڕانکاری و هەموارکردنەوەی برگەکانی دەستوور مەرج و ڕێوشوێنی سەختی بۆ دانراوە (لەزۆربەی وڵاتاندا)، بەو پێیە پەرلەمان زۆر دەستکراوە نییە لە دەستکاریکردنی برگەکانی دەستوور.

چوارەم/ دەستوور زامنی لە گرێژنە دەرنەچوونی دەسەڵاتی یاسا دانانە، چونکە (المشروعیة) (واتە دژوپێچەوانە نەبوونی هەر یاسایەک لەگەڵ یاساکانی سەرووی خۆیدا) مەرجی ڕێگە پێدانی دەرچوونی هەر یاسایەکە، واتە هەر یاسایەک کە لە پەرلەمان دەردەچێت پێویستە دژو پێچەوانە نەبێت لەگەڵ هیچ برگەیەکی دەستووردا چونکە دەستوور لە یاسا باڵاترە.

بۆیە دەستووریبوون لە سیستمی دیموکراسیدا، هۆکارێکە بۆ گونجانی ئەو سیستمە بۆ کۆمەڵگە و کەلتوورە جیاوازەکان و دەبێتە کالایەک بۆ باڵاجیاوازەکان، چونکە لەکۆتاییدا زۆرینەی خەڵک جۆری بیرکردنەوەو بەرنامەی ژیانی خۆیان لە دەستووردا دەچەسپێنن و پەرلەمانیش ناچاردەکەن بۆ پابەندبوون بەو دەستوورەوە.

**٨/ زامنکردنی مافی نەیاربوون و بەرهەڵستکاری (حق المعارضة)، واتە ڕێگەدان بە هەبوونی ئۆپۆزیسیۆن.**

مافێکی پارێزراوی خەڵکە، هەرکاتێک بینیان دەسەڵات بەرەو لادان و ستەم دەڕوات هەوڵی چاککردن و تەنانەت گۆڕینیشی بدەن و بۆ ئەو مەبەستەش خۆیان ڕێکبخەن، ئیسلام هەر لە سەرەتاوە (ئەهلی حەل وعەقد)ی داهێناوە واتە ئەنجومەنێک مافی بەستن و هەڵوەشاندنەوەی ئەو گرێبەستەی هەیە کە لە نێوان دەسەڵاتدار و هاوڵاتیاندا هەیە.

**٩/ دەستاودەستکردنی ئاشتییانەی دەسەڵات.**

ئیسلام هیچ ڕێوشوێنێکی لەم بارەیەوە دانەناوە بۆ وادەی مانەوە لە دەسەڵاتدا، بەڵکو زیاترگرنگی بە شیاوی و لەباری ئەو دەسەڵاتدارە داوە، بگرە لەئیسلامدا ڕێز لە وادەش نەگیراوە بۆمانەوە و بەردەوامبوون لە دەسەڵاتدا، تەنانەت خودی دەسەڵاتدارەکان ئەوەیان ڕاگەیاندووە بۆ خەڵک کە (ئێوە تا ئەو کاتە لەسەرتانە گوێڕایەڵی ئێمە بن کە ئێمە پابەندی بەرنامەکە بین و ئەگەر لاماندا ئەوا بەگوێمان مەکەن). بۆیە هیچ ڕێگریەک نیە لە دیاریکردنی ماوەی مانەوە لە دەسەڵاتدا بە پێی ئەو گرێبەستەی لە نێوان خەڵک و دەسەڵاتداراندا دەبەسترێت. ئەوەش کە ڕوویدا لە قۆرخکردنی دەسەڵات و گۆڕینی حوکمڕانی بۆ حوکمی پشتاوپشتی بنەماڵە، لادان بووله بنەماکانی حوکمڕانی لەئیسلامدا (کە دەبێت جێنشین بە ڕەزامەندی ئەهلی حەل و عەقد دیاری بکرێت)،

واتە دەسەڵاتدارهەرکات لایدا بەرکەنار دەکرێت نەوەک کوڕاوکوڕیان بە پاشایەتی لە دایک بین بەبێ ڕەچاوکردنی شیاوێتی و لەباربوونیان،

تەنانەت لەسەردەمی عمری کوڕی خطابدا کار بە سیستمی دیاریکردنی تەمەنی دەسەڵاتی والیەکان کرا وەک سەرەتایەک بۆ سنووردارکرنی مانەوەی والیەکان لە دەسەڵاتدا .

## ئێستا پاش ئەم هەڵوێستەیە بەگشتی دەگەینە چەند سەرنج و دەرئەنجامێك:

١/ ئیسلام وەک ئەوەی ئاینێکی ئاسمانییەو بە بڕوای ئێمەی موسوڵمان خوای بەدیهێنەری زەوی و ئاسمان داڕێژەریەتی، بەدووره لە هەموو نوقسانی و کەم وکورتیەک، بۆیە باسکردن لە ئیسلام و دیموکراسی بە واتای ئەوە نییە کە ئیسلام نوقسان بێت و بە دیموکراسی زادەی بیری مرۆڤەکان نوقسانی شەریعەتێکی خوایی پڕبکرێتەوە.

بەڵکو ئیسلام بۆ ئەوەی گونجاوو لە بار بێت بۆ سەردەمە جیاوازەکان، بە جۆرێک داڕێژراوە کە بابەتەکانی (عقیدة و عبادات و أخلاق) لەبەرئەوەی جێگیرن، حوکمەکانی بە تێرو تەسەلی باسیان لێکراوە و بوار بۆ ڕاو بۆچوون و کات و سەردەم دانەنراوە، بەڵام بابەتەکانی شێوازی حوکمڕانی و کاروباری ژیانی دنیای مرۆڤەکان، لەبەرئەوی پەیوەندی هەیە بە گۆڕانکاری لە کات و سەردەمەکاندا، بۆیە تەنها هێڵ و بنەما گشتییەکانی وەک(عدل و شوری و...) باسی لێکراوەو ووردەکاریەکانی جێهێڵراوە بۆ مرۆڤەکان.

٢/دیموکراسی بەگشتی وەک دۆخی شلی ماددە وایە کە دەڵێ شێوەی ئەو دەفرە وەردەگرێ کە لەناویدایە، (حكم الشعب للشعب) لە کۆمەڵگەیەکدا کە باوەڕیان بە هیچ ئایین و بەرنامەیەک نەبێت کە سنووردرایان بکات، ئەوا دیموکراسی لای ئەوان دەبێتە هەواو ئارەزوو و ڕێکەوتنی خۆیان، لەسەر هەرچی ڕێککەوتن ئەوە دەبێتە شەریعەت و بەرنامەی ژیانیان، بۆیە بۆ ئەوان دیموکراسی دەبێتە دین چونکە خۆیان دینێکیان بۆ خۆیان دیاری نەکردووە، بەڵام بۆ گەلێکی وەک ئێمە کە هەمیشە لادان لە بنەماکانی ئایین هێڵی سووری دەسەڵات وخەڵکیش بووە، ئەوکات دیموکراسی لای ئێمە دەبێتە شێوازو ئامرازی بەڕێوەبردنی دەسەڵات نەک، دین و شەریعەت .

٣/دیموکراسی چەندین مۆدێلی جیاوازی هەیە و پێناسەی جۆراوجۆری بۆکراوە لەلایەن خودی پەیڕەوکەرانییەوە بۆیە ڕاجیایی هەیە لەسەر خەسڵەت و بنەماکانی دیموکراسی هەندێک بە (٥) وهەندێک بە(٨)وهەندێک بە (١٠)بنەما دەستنیشانی دەکەن، ئێمەش وەک هەرنەتەوەیەکی سەر زەوی بۆمان هەیە کار بە مۆدێلێک لە دیموکراسی بکەین کە گونجاو و کۆک بێت لە گەڵ ئاین و نەریتی کۆمەڵگەی خۆمان و وەک هەر بابەتێکی تازە و سەردەم سوود لە چاکەکانی وەربگرین و خۆمان لە زیانەکانی بەدووربگرین .

بۆ ئەم مەبەستەش پێویستە لە سەر پێکهاتە جیاوازەکان جورئەتێکی حەکیمانە و دڵسۆزانە بە خەرج بدەن، لە پێناوی بەرژەوەندی گەلەکەیان و کۆتایی هێنان بەو دابڕان و شیر و تیر لەیەک ساوینە و کار بۆ پێکهاتن لە سەر خزمەتکردن بە هاوڵاتیان و ئاوەدانکردنەوەی وڵات بکەن، نەک گەڕان بەشوین جیاوازی و پێداگیری لەسەر هۆکارەکانی ناکۆکی.

ئێمە لای خۆمانەوە مۆدێلێک لە دیموکراسی بە گونجاو دەزانین کەڕێکخەری سیستمی دەسەڵاتی سیاسی و ئیداری سەردەمیانە بێت کە لەگەڵ پێشکەوتنی ژیاندا گونجاوبێت و کاروباری دنیای خەڵکی پێ ڕێکبخەین تا ئەوسنوورەی بەزاندنی بنەماکانی ئایینی زۆرینەی خەڵکی تیا پارێزراوبێت و مافی پێکهاتەکان و ورێزو کەرامەت وشکۆی تاکی تیا پارێزراو بێت.

ئەمەش پێویستی بە جورئەت و متمانە بەخۆبوون و نەترسان لەپێشکەوتن هەیە لەسەر بنەمای (الحكمة ضالة المؤمن أنى وجدها فهو احق بها) واتە (حیکمەت و دانایی وونبووی موسوڵمانەو

لە هەر کوێ و لای هەرکەس بینیەوە ئەو شایەنترە بەو حیکمەتە).

٤/ راستە دەوترێ دیموکراسی حوکمی زۆرینەیە، بەڵام یەکێک لە بنەماکانی دیموکراسی رێزگرتنە لە کەمینەکان و پاراستنی مافەکانیان، بۆیە لام سەیرە ئێمەی موسوڵمان سەری زمان و بنی زمانمان ئەوەیە کە زۆرینەی رەهای گەلی کورد موسوڵمانە کەچی بەقەدەر کەمینەیەک متمانەمان بە خۆمان نییە، خێرا خۆمان لێ بچووک دەبێتەوە دەڵێین، ئەگەر زۆرینە لەسەر هاورەگەزبازی رێککەوتن ئەوا دەبێ بکرێ بە یاسا.

من دەڵێم ئەگەرزۆرینەی گەلی کورد لەسەر هاورەگەزبازی رێککەوتن ئەوا ئێمە نەماوین و ئەگەر پێغەمبەریش بین وەک لوط پێغەمبەر (سەلامی خوای لەسەربێت) هەرەشەی شاربەدەربوونمان لێدەکرێت (أَخْرِجُوا آلَ لُوطٍ مِّن قَرْيَتِكُمْ إِنَّهُمْ أُنَاسٌ يَتَطَهَّرُونَ) النمل/٥٦ ، کەچی ئێمە هەر بیر لە خۆ فەرزکردن دەکەینەوە، پێم سەیرە خەڵک بەگژی هەوردا دەچێت ئێمەش بە زۆرینەی رەهای خەڵکیشەوە دەترسین ژێر پێ بخرێین، لەراستیدا ئەوە کرانەوە بەرووی دیموکراسیدا نەبووە کە موسوڵمانی ژێردەستە کردووە، بەڵکوبەشێکی پیلانی زلهێزەکانەو بەشێکیشی دەرئەنجامی بیری توندرەویی و کافرکردنی خەڵک و بە ئەژدیها وێناکردنی ئیسلامە، کە خەڵک ئەمرۆ لەگەڵ ئەوەی کە موسوڵمانە بەڵام دەنگ و متمانەکەی بە ئیسلامیەکان نییە چونکە دەترسن ئێمە بەناوی ئیسلامەوە ئازادییەکانیان لێ بەرتەسک بکەینەوە. ئەوەی ئەمرۆ دەیبینین لە ئەوروپا و رۆژئاوای دیموکراسیدا، نموونەی پارێزراوی مافی کەمینەیە، چی بگات بە زۆرینە ئێمە خۆمان شاهیدی ئەوەین ئەو موسوڵمانانەی لە وڵاتی بەناو ئیسلامی خۆیان ژیانیان نەپارێزراوە، بە هەمان ستایل و پابەندبوونەکانی خۆیانەوە پەنادەبەنە ئەو وڵاتانەو خۆیان و ماڵ و منداڵیان لەوێ ژیان بەسەردەبەن.

٥/ رازیبوون بە دیموکراسی وەک میکانیزم و مۆدێلێک لە بەرێوەبردنی وڵات و دەسەڵاتداری، بە مانای دەست هەڵگرتن لە ئیسلام و حوکمی ئیسلام نییە بەڵکو رێککەوتنە لەسەر ئەوەی بەرژەوەندی خەڵکی تیایە و دەرچوونیش نییە لە ئیسلام.

بۆیە من بە موسوڵمانان دەڵێم نیگەران نەبن دیموکراسی کوفر نییە، ئەگەر پەیرەوکەرانی بۆ خۆیان کافر نەبن، هەروەها بە دیموکراسخوازانیش دەڵێم بێ خەم بن ئیسلامەتی لە دیموکراسی زیاتر مافی زۆرینە و کەمینە و تاکیشی تیا پارێزراوە.

بۆ نموونە لە ئیسلامدا مەسیحییەکی کەمینە ماڵ و ژیان و کەرامەتی پارێزراوە، لەوەش زیاترمافی ئەوەی هەیە یاساکانی ئایینەکەی خۆی بەسەردا جێ بە جێ بکرێت کە ئەمە لە ئەوروپا و رۆژئاوا بۆ موسوڵمان دەستەبەرنەکراوە و یاسای کارپێکراو هەمان یاسای دەوڵەتە.

٦/ هەموو ئەوەی وترا مەبەست لێی خودی ئیسلام و دیموکراسییە وەک بەرنامە و سیستەم، نەک ئەو نموونانەی بەناوی ئیسلام یان دیموکراسیەوە لە ناوچەکەدا سەرقاڵی کوشتن و برین وستەمکاری و تاڵانکردنی خێروبێری وڵاتن و لەسەر ئەرزی واقع شتێک پەیرەو دەکەن هیچ شتێک نیە جگە لە ئارەزوو هەوەسی شێتانە بۆ حوکم و دەسەڵات وستەمکردن و تاڵانکاری و ئەوەی بوونی نەبێت بەرنامەو سیستەم و مافی خەڵک وحساب کردنە بۆ ئاین و نەتەوە و ئایندە وبەرژەوەندی و داهاتووی گەلەکەیان.

بۆیە لە کۆتاییدا دەتوانین بڵێین: دیموکراسی داهێنان و ئەزموونێکی بەرهەمی ژیریی مرۆڤەکانە، نەبەدیلی ئیسلامە و نە تەواوکەریشیەتی بەڵکو سیستمێکی پەسەندی رێگە پێدراوە، وەک میکانیزمێک بۆ حوکمڕانی لە کۆمەڵگە ئیسلامیەکاندا.

# هۆکارەکانی شکستی دیموکراسییەت لە کوردستان و ناوچە عەرەبییەکاندا






**د. کەریم ئەحمەد**

لەداکیبووی (١٩٥٩). ئەندامی دامەزرێنەری پڕۆژەی تیشک، سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی، ڕێکخراوی ژیار و ئینستیتیۆی بانگخوازان. چەند کتێب و دەیان وتاری بڵاوکراوەی بە زمانی کوردی و عەرەبی هەیە.

پێش ئەوەی بچمە ناو بابەتەکەمەوە، بە کورتی پێناسەیەکی دیموکراسی دەکەم، بۆ ئەوەی لەسەر بنەمایەکی زانستی لە بابەتەکە بدوێین. مانا زاراوەییەکەی دیموکراسی لە مانا زمانەوانییەکەی جیاواز نییە لەوەدا نەبێ کە چواچێوەکەی و شێوازەکەی و وردەکارییەکانی باسکردووە.

دیموکراسی واتە فەرمانڕەوایی گەل بۆ گەل، ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ لە ڕێی نوێنەرانییەوە، ئەوەشی ئەمڕۆ بەرپا دەکرێت جۆری دووەمیانە واتە ناڕاستەوخۆ. واتە گەل سەرچاوەی دەسەلاتی تەشریعی و جێبەجێکارییە لە ڕێگەی نوێنەرانیەوە.

دیموکراسییەت سیستمێکە بۆ ڕێگریکردن لە حوکمی خۆسەپاند و تاکڕەوی پەیرەوی دەکرێت.

سیستمێکە دەسەلات تێیدا بە ڕێگەیەکی ئاشتییانە لە ڕێگەی صندوقەکانی دەنگدانەوە ئالوگۆڕ دەکرێت، گەل نوێنەرانی خۆی هەلدەبژێرێت و لە ڕێگەی ئەوانەوە چاودێری دەسەلاتی تەنفیزی دەکات و دەتوانێ لێپێچینەوەی لە گەلدا بکات.

سیستمێکە دەسەلاتەکان تێیدا جیاکراونەتەوە بۆ دەسەلاتی تەشریعی و جێبەجێکردن و دادگایی.

سیستمێکە تێیدا کەمایەتییە سیاسییەکان مافی نەیارییان هەیەر لەچوارچێوەی یاسادا، هەروەها گەل و حزبە نەیارەکان مافی خۆپیشاندان و نارەزایەتی دەربرینی ئاشتییانەیان هەیە.

ئەمانە لایەنە ئەرێنییەکانی سیستمی دیموکراسیین، ئەگەر بە شێوەیەکی یاساییانەو دوور لە ساختەکاری بەرپابکرێت و ئالییەتی گونجاوی بۆ دابنرێت و ولات لە ڕێی موئەسسەساتەوە بەڕێوە ببرێت وئالییەتی گونجاو بۆ دابینکردنی بەرپاکردنی دانرابێت.

لایەنە نەرێنییەکانی دیموکراسییەت زۆرن، گرنگترینیان بریتییە لە دەسەلاتی رەهای مرۆڤ لە تەشریعداناندا بێ رەچاوکردنی سنوورەکان و بەها بەرزەکانی ئایینەکان. ئەم لایەنە نەرێنییە هێشتا بە تەواوی بۆ مرۆڤایەتی دەرنەکەوتووە، واتە هێشتا مرۆڤایەتی نازانێ لە شەرعییەتدان بە شتێکی وەکو زەواجی هاورەگەز(بۆ نموونە) چ دەرئەنجامێکی نەرێنی لێ ئەبێتەوەو ئەگەر لە هەموو دونیادا بەرپابکرێت سەر لە چییەوە دەردێنێت و مرۆڤایەتی بە چ ئاقارێکدا دەڕوات.

یەکێکی تر لە نەرێنییەکانی ئەوەیە کە زۆرجار خەلکی پێوەرێکی زانستییان پێ نییە بۆ هەلبژاردنی نوێنەرەکانیان و دەکەونە ژێر کاریگەری راگەیاندن یان سۆز و عاتیفەوە، زۆر جاریش خەلکی چەواشە دەکرێن، بە تایبەت خەلکە رەشۆکەکە، بۆ نموونە کلینتون زیاتر ئافرەتان دەنگیان دایێ لەبەر قۆزییەکەی، ئۆباما لەبەر ئەوەی وتاربێژێکی بەهێز بوو.

یەکێکی تر ئەوەیە هەرکەسێک دەولەمەند نەبێت ناتوانێ خۆی کاندید بکات چونکە پرۆپاگەندەی هەلبژاردن توانایەکی دارایی زۆری ئەوێت. خەلکی بەتواناش ئەگەر سەر بە حزب نەبن هەلی خۆ کاندید کردن یان دەرچونیان زۆر دەگمەنە.

یەکێکی تر ئەوەیە کە مەرج نییە نوێنەرەکان هەمیشە گوزارش لە راوبۆچوونی ئەو خەلکە بدەن کە هەلیان بژاردوون.

یەکێکی تر ئەوەیە کە لە سیستمی دیموکراسیدا دەنگی زانایەک و دانایەک و نەزانێک وەکو یەکە.

یەکێکی تر ئەوەیە سیستمێکە تێیدا زۆرینە حوکم دەکات، تەنانەت ئەگەر ئەو زۆرینەیەش بە رێژەیەکی کەم بێت. واتە ئەو جۆرە حوکمە گوزارش لە ویستی هەموو میللەت ناکات.

من لێرەدا باسی هەلوێستی ئیسلام ناکەم لە دیموکراسییەت و باسی ئەوە ناکەم چەندی لەگەل بنەماکانی ئیسلام تەبایەو چەندی تەبا نییە، بەلام بە شێویەکی ئەکادیمییانە باسی دەکەم وەکو سیستمێک ئەمڕۆ لە لە ڕوانگەی خەلکییەوە باشترین سیستمەو زۆربەی ولاتانی دونیا پیادەی ئەکەن و ئەوانەشی کە پیادەی ناکەن لافی ئەوە لێدەدەن کە دیموکراسین، بە تایبەت دوای شکستی بلۆکی رۆژهەلات و سیستمی ئیشتراکی و کۆمۆنیزمی خەلکی سیستمێکی تر بەدی ناکەن

لەم سیستمە باشتر بێت بۆ حوکمڕانی. بەڵام بە شێوەیەکی گشتی هەڵوێستی ئیسلامییەکان دوو جۆرە، ئەویش لەسەر چۆنێتی ڕوانینیان بۆ دیموکراسییەت. ئەوانەیان کە وەکو یەک پاکێج سەیری دیموکراسییەت دەکەن و ئەڵێن بەش بەش ناکرێت ئەوا بە یەکجاری ڕەتی دەکەنەوە بەو بەڵگەیەی کە دیموکراسییەت بریتییە لە حوکمی غەیری خوا خواش ئەفەرموێت « إن الحكم إلا لله» و تێیدا گەل سەرچاوەی تەشریع و دەسەڵاتیشە لەکاتێکدا کە مرۆڤ ئازاد نییە نە لە تەشریع داناندا و نە هەڵبژاردنی دەسەڵاتداراندا. دەستەی دووەم کە وەکو یەک پاکێج تەماشای دیموکراسییەت ناکەن ئەڵێن ئەتوانین بەش بەشی بکەین یان مەرجدار یان سنوورداری بکەین بە سنوورەکانی شەرع ئەوا ڕێگەی پێدەدەن وەکو ئامرازێک بۆ گەیشتنە حوکم و بەڕێوەبردنی وڵات.

زۆرێک لە وڵاتانی دونیا بەتایبەت وڵاتە ڕۆژئاواییەکان و ئەمریکاو هەندێک لە وڵاتانی ئاسیاو ئەمریکای باشور لە دوای بەرپاکردنی ئەم سیستمە فەرمانڕەواییە_ بەو هەموو کەموکورتییەوە _ جێگیرییەک و ئارامییەک و پێشکەوتنێکی زۆریان بەخۆیانەوە بینیوە و لە ڕژێمی دکتاتۆری ڕزگاریان بووەو هاووڵاتیانیان مافەکانیان تا ڕادەیەک دەستەبەر کراوە و ڕۆڵیان هەیە لە دەستنیشان کردنی جۆری دەسەڵات. بەڵام کێشەکە لە کوردستان و عێراق و هەندێک لە وڵاتانی دەوروبەرماندایە کە سەرەڕای بانگەشە بۆ دیموکراسییەت و پەنا بردنە بەر سندوقەکانی دەنگدان بەڵام نە جێگیری بە خۆیانەوە دەبینن نە پێشکەوتن و نە مافی مرۆڤیان تێدا ڕەچاو دەکرێت و نە دەتوانرێ لێپێچینەوە لەگەڵ دەسەڵات بکرێت و نە چاودێری بکرێت و نە دەستاودەستی ئاشتییانەی دەسەڵات بکرێت. لە هەموو ئەمانەش خراپتر دەستێوەردانی دەسەڵاتە لە ڕێگەی هێزە نیزامییەکان و ئاسایش و پۆلیس لە ئەنجامەکانی هەڵبژاردن بە شێوەیەک کە سەرکەوتنی حزبی دەسەڵات مسۆگەر بکات و پشکی شێر لە دەنگەکان بۆ خۆی ببات و کەمێک لە پاشماوەش بە حزبە نەیارەکان و ئۆپۆزسیۆن بدات. واتە لەم وڵاتانە پارەیەک و سەروەت و سامانێکی زۆری وڵات خەرج ئەکرێت و ماوەیەکی زۆر خەڵکی سەرقاڵ ئەکرێن و بازاڕی سیاسەت گەرم ئەکرێت و لە کۆتاییشدا ئەنجامەکان بەو شێوەیە دەبن کە حزبی دەسەڵات ئەیەوێت. ئەم هەڵبژاردنە دواییەی کوردستان و عێراق ومیسر نموونەی ئەمجۆرە مومارەسەیە بوون بۆ دیموکراسییەت.

بە کورتی لەم وڵاتانەدا دیموکراسییەت نەک هەر شکستی هێناوە، بەڵکو زۆر دەرئەنجامی نەرێنی لێ بووەتەوە، لە سەرووی هەموویانە بێ ئومێدی و هیوا براوی خەڵکی لە هەموو چاکسازییەک و گۆڕانکارییەک. جا ئایا ئەمە هۆکارەکانی خودین، واتە ئەم میللەتانە هێشتا نەگەیشتونەتە ئەو ئاستە سیستمی دیموکراسییەت بەرپا بکەن، یان بابەتین و لە دەرەوە نەخشەسازی و بەرنامە ڕێژییان بۆ دەکرێت، یان هەردوکیانن؟ دەبێ لێکۆڵینەوەی لەسەر بکرێت و خوێندنەوەیەکی بابەتییانەی بۆ بکرێت.

بەڕای من هۆکارەکە دەگەڕێتەوە بۆ هەردولا، بەشێکی بۆ ئەم میللەتانە، بە بەرپرس و خەڵکەکەیەوە، بەشێکیشی دەگەڕێتەوە بۆ هۆکاری دەرەکی. یەکێک لە هۆکارە خودییەکان ئەوەیە کە ئەم میللەتانە دابەش بوون بەسەر دوو تەوژمی زۆر دژ بەیەک، ئەویش تەوژمی عەلمانییەتێکی توندڕەو و دژ بە ئیسلام، لەگەڵ تەوژمێکی ئیسلامی کە عەلمانییەت بە ئامرازێک تێدەگات بۆ لە بن هێنانی ئیسلام و بە دەستێکی دوژمنانی ئایین سەیریان ئەکات، لە ئەنجامی ئەمەوە کلتوری یەکتر قبوڵکردن لە نێوان عەلمانییەکان و ئیسلامییەکاندا نەهاتۆتە کایەوە، لێرەوە بەشێکی زۆری کێشەکان سەر هەڵدەدەن و دواتریش ئەم فاکتەرە تێکەڵ بە



# لەئەنجامی ئەم دەستێوەردانەدا دیموکراسییەت لە جیاتی ئەوەی ئامرازێك بێت بۆ نەهێشتنی دیکتاتۆرییەت، دەکرێتە ئامرازێك بۆ سەپاندنی دکتاتۆرییەت.

فاکتەرە دەرەکییەکە ئەبێت کە ڕۆڵی زلهێزەکانە لە ڕێگریکردن لە گەیشتنی ئیسلامییەکانە بە دەسەلات و هەوڵی هێشتنەوەی عەلمانییەکان لە دەسەلاتدا بە هەر نرخێک بووە.

هۆکارێکی تری بریتییە لە نزمی ئاستی هۆشیاری سیاسی ئەم میللەتانە بە تایبەت حزبە سیاسییەکان، ئەگەر کوردستان بە نموونە بێنینەوە ئەو شتە بە ڕوونی بەدی دەکرێت، لێرەدا نە سەرانی حزبەکان ئەو هۆشیارییەیانە هەبوو نە لایەنگرانیان، بۆ نموونە لە دەنگداندا خوێندکارێکی زانکۆ و نەخوێندەوارێکی سود وەرگرتوو لەو حزبانە لە یەک ئاستا بوون و هەردوکیان لە یەک هەڵبژاردندا زیاد لە دە جار دەنگیان بۆ حزبەکەی خۆیان داوە، واتە حزبەکان و لایەنگرانیشیان ئەیانزانی ئەو سەرکەوتنە بە ساختەکاری بووە، و لە نێوان خۆشیاندا شانازییان پێوە کردووە!.

ڕۆڵی سوپا و دەستێوەردانی سوپا لە پرۆسەی سیاسی و عەقڵییەتی عەسکەرتاری دەسەلاتداران هۆکارێکی تری شکستی پرۆسەی دیموکراسییە لەم وڵاتانەدا، ئەمیش خۆی لە خۆیدا بەشێکە لەو مەنزومەیەی کاری پێدەکرێت بۆ دیاریکردنی جۆری ئەو حکومەتانەی پێک دەهێنرێن لەم وڵاتانەدا و لە لایەکەوە بەستراوەتەوە بە ڕۆڵە دەرەکییەکەوە.

بە لای منەوە هۆکارە بابەتییەکان، یان دەرەکییەکان، ڕۆڵی سەرەکییان هەیە لە شکست هێنانی دیموکراسییەت لەم وڵاتانەدا.

بۆ زانینی کاریگەری هۆکارە دەرەکییەکان، بە تایبەت ڕۆڵی وڵاتە زلهێزەکان لە شکست هێنانی دیموکراسییەت لەم وڵاتانەدا دەبێ بگەڕێینەوە بۆ تێڕوانینی ڕۆژئاواییەکان بۆ ئیسلام و هەوڵ و کۆششەکانیان بۆ ڕوخاندنی خەلافەتی عوسمانی و دواتر ڕێگری کردن لە گێڕانەوەی خەلافەتی ئیسلامی و حوکمی ئیسلامی و دواتریش هەڵوێستیان لەو حزب و لایەنە ئیسلامییانەی ئیش بۆ گەیشتنە دەسەلات و پێکهێنانی دەوڵەتی ئیسلامی دەکەن.

لەم نوسینەدا من تێگەیشتنی خۆم بۆ ئەم پرسە ئەنوسم کە لە ئەنجامی خوێندنەوەی بەرهەمی ڕۆژهەلاتناسان و سیاسەتمەدارانی ڕۆژئاواو لێدوانەکانی بیرمەند و سیاسییەکانیان و پاشان چاودێری واقعی جیهانی ئیسلامی و ڕووداوەکانەوە پێی گەیشتوم. لەم کاتەدا دۆکیومێنتێکی تایبەت بەم بوارەم لەبەر دەستدا نییە، بەڵام بە شێوەیەکی گشتی ئاگام لە تێڕوانینی وڵاتانی ڕۆژئاوا بۆ ئیسلام و نەخشەیان بەرامبەر بە ئیسلام و موسوڵمانان هەیە و دڵنیام لەوەی بەشێکی سەرەکی ئاژاوەو بشێوی ئەم وڵاتانە دەگەڕێتەوە بۆ پلانەکانی ئەوان.

دەستێوەردانی زلهێزەکان لەم وڵاتانەی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست شتێکی زۆر ئاشکرایە و بەڵگە بۆ هێنانەوەی ناوێت و ئێستا ئەو وڵاتانە نایشارنەوە ، بۆ نموونە پارێزگاریکردن لە قەوارەی جولەکە بە هەر نرخێک بووە ستراتیژییەکی نەگۆڕە

به نیسبەت ئەو وڵاتانەوە و لەو پێناوەدا ئامادەن قوربانی بەهەموو بەهاکان بدەن . دووفاقەیی لە مامەڵە لە گەڵ شۆڕشەکانی بەهاری عەرەبی شتێکی زۆر زەقە، قەززافی لەبەر ئەوەی ڕایان لێی نەبوو بە بیانووی ئەوەی هێزی لە ڕادەبەدەر دژ بە گەلەکەی بەکاردێنێت _ کە هێشتا بەکاریشی نەهێنابوو_ دەستیان لەو ولاتە وەردا لە دژی ڕژێم و بە ماوەیەکی کەم ڕوخاندیان، بەڵام لە سوریا وڵات وێران کراو زیاد لە نیوەی میللەتەکەی دەربەدەرکراو جۆرەها چەکی قەدەغە کراو بەکارهێنرا کەچی شۆڕشەکەیان بەلارێدا برد و ڕژێمەکەیان هێشتەوە، ئەویش تەنها لەبەر خاتری پاراستنی ئاسایشی قەوارەی جولەکە!

لە میسریش تەنها لەبەر ئەوەی ئیسلامییەکان سەرکەوتن و گومانیان هەبوو مەترسی بۆ سەر قەوارەی جولەکە هەبێت هانی سوپایان لێدان و بە کودەتایەک کە هەزارەها قوربانی لێکەوتەوە ئەو حکومەتە هەڵبژێرراوە لەناوبرا.

پشتگیریکردنی کۆدەتاکەی تورکیا لە تەمموزی ٢٠١٦ لەلایەن ڕۆژئاواییەکانەوە بەڵگەیەکی ترە لەسەر دوفاقەیی ئەو وڵاتانە.

لە عێراق و کوردستانیشدا کێشمەکێشی زلهێزەکان و هێزە ئیقلیمییەکان شتێکی شاراوە نییە و ڕەنگدانەوەی لە ئەنجامی هەڵبژاردنەکاندا ئاشکرایە.

دەستێوەردانی وڵاتە زلهێزەکان لەم وڵاتانەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست لە ئاستی سیاسی و ئابوریدا نەوەستاوە بەڵکو پەلی هاویشتووە بۆ لایەنی فەرهەنگیش ، عەرەبستانی سعودی نمونەیەکی زەقی ئەم دەستێوەردانەیە.

ڕەنگە زۆر کەس باوەڕنەکەن کە یەکێک لە پاڵنەرە هەرە سەرەکییەکانی دەستێوەردانی وڵاتە زلهێزەکان لەم ناوچەیە پاڵنەری ئایینییە، ئەویش یان لەبەر ئەوەی خۆیان ئایین بەلایانەوە گرنگ نییەو ئەو ئەرزشەی نییە، یان لەبەر بێئاگاییان، من تەنها ئاماژە بەناوی چەند کتێبێک دەدەم کە گرنگی ئەو فاکتەرە دەرئەخەن، یەکێک لەوانە کتێبی (النبوۃ والسیاسة)ی گرەیس هاڵسێل (pvophecy and Politics) کە تێیدا باسی ئەوە دەکات چۆن زۆرێک لە سەرۆکەکان و بەرپرسانی ئەمریکا کەوتونەتە ژێر کاریگەری مەسیحییە ئینجیلییەکانەوە کە پشت بە پێشبینییەکانی سفری حزقیال و سفری خەو و سفری یۆحەننا دەبەستن لە ئیشکردن بۆ ئیسرائیل و زەمینە ساز کردن بۆ هاتنەوەی مەسیح لە فەڵەستین.

دکتۆر یوسف الحسن لە کتێبی ڕەهەندی ئایینی لە سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکا لەمەڕ ململانێی عەرەبی و زایۆنی کە تێزێکی دکتۆرایە ئاماژە بۆ هەمان بابەت دەکاو دەڵێ هەر دانیشتنێکی کۆنگرس کە پەیوەندی بە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستەوە هەیە دەبێ قەشەیەک لە تەوژمی مەسیحییە ئینجیلییەکان ئامادە بێت نەوەکو بڕیارێک بدرێت پێچەوانەی ویستی خوا بێت دەربارەی فەڵەستین و جولەکە.

هەروەها لە کتێبی (ید الله) Forcing GODs HANDلە نوسینی گریس هاڵسێل و وەرگێڕانی محمد السماک باسی ئەوە دەکات بۆچی ئەمریکا قوربانی بەبەرژەوەندییەکانی خۆی دەدات لە پێناو ئیسرائیلداو باسی شەڕی هەرمەگدۆن دەکات و باسی ڕاستڕەوە مەسیحییە توندڕەوەکان دەکات چۆن زەمینە سازی دەکەن بۆ هاتنە دی ئەم پێشبینییەو گەڕانەوەی مەسیح کە ڕزگارکردنی مرۆڤایەتی تێدایە.

دەزگای ڕاند RAND CORPORATION کە دەزگایەکە سەر بە وەزارەتی بەرگری ئەمریکا بەشێک لە توێژینەوەکانی لە سەر کۆمەڵگە ئیسلامییەکانە بەتایبەت تەوژمی ئیسلامی و بەمەبەستی زیاتر ئاشنابوون پێیان، ئەم دەزگایە کاریگەری زۆرە لەسەر خاوەن بڕیارەکان لە ئەمریکا و یەکێک لە کارەکانی داهێنانی ناوناتۆرەیە لە بزوتنەوە ئیسلامییەکان بە مەبەستی ڕێگە



# ڕۆڵی سوپا و دەستێوەردانی سوپا لە پرۆسەی سیاسی و عەقڵییەتی عەسکەرتاری دەسەڵاتداران هۆکارێکی تری شکستی پرۆسەی دیموکراسییە لەم وڵاتانەدا.

خۆشکردن بۆ لێدانیان .(١)

ئەمانەو چەندین کتێب و لێدوانی بەرپرسانی ئەمریکا و ڕۆژهەڵاتناسانی لە وێنەی بەرنارد لویس بە ڕوونی دەریدەخەن کە ڕۆژئاوا ئەجێندای خۆی هەیە بەرامبەر ئیسلام و جیهانی ئیسلامی و لە هەوڵی بەردەوامدان بۆ شکست هێنان بە بزووتنەوە ئیسلامییەکان و ڕێگریکردن لە ئیسلام لەوەی جارێکی تر وەکو هێزێکی سیاسی کاریگەر بێتەوە.

کەواتە لە ئەنجامی ئەم تێڕوانینەی ئەمریکاو وڵاتانی ئەورووپی بۆ ئیسلام و جیهانی ئیسلامی هەرگیز ڕێگە نادەن ئیسلامییەکان بێنە سەر حوکم، بە تایبەت لە ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، لەبەر ئەوەش بوو دەستیان خستە ناو شۆڕشەکانی بەهاری عەرەبی و لەباریان بردن.

بە دڵنیاییەوە ئەو وڵاتانە ڕێگە نادەن ئیسلامییەکان سود لەو پرۆسە دیموکراسییە وەربگرن و لە ڕێگەیەوە بگەنە دەسەڵات بە بیانووی ئەوەی ئیسلامییەکان وەکو پەیژەیەک تەماشای ئەم ئالییەتە ئەکەن، لەئەنجامی ئەم دەستێوەردانەدا دیموکراسییەت لە جیاتی ئەوەی ئامرازێک بێت بۆ نەهێشتنی دیکتاتۆرییەت، دەکرێتە ئامرازێک بۆ سەپاندنی دکتاتۆرییەت، سەرەتا لە ڕێگەی چەواشەکاری وئاڕاستەکردنی خەڵکی بە ئاڕاستەی دەنگدان بە عەلمانییەت، ئەگەر ئەوە سەری نەگرت ساختەکاری و دەستکاریکردنی سندوقەکانی دەنگدان، ئەویش سەری نەگرت کودەتای سەربازی. کەواتە هیچ کاتێک ڕێگە نادرێت ئەم میللەتانە بڕیار بدەن و ئەو لایەنانە هەڵبژێرن کە خۆیان دەیانەوێت ئەگەر بزانن میللەت ڕووو لە ئیسلامن. واتە ئەو دیموکراسییەتەی کە ڕێگەی پێدەدرێت دیموکراسییەکی مەرجدارە، ئەگەر بەرپاکردنی ئەو ڕژێمانە بگەیەنێتە دەسەڵات کە ڕۆژئاوا ڕای لێیەو مەترسی بۆ سەر ئیسرائیل نییە ئەوا ڕێگەی پێدەدرێت ئەنجام بدرێت و ڕێز لە ئەنجامەکانی دەگیرێت، بەڵام ئەگەر گومانی ئەوەی لێ ببرێت ڕژێمێکی دژ بە بەرژەوەندییەکانی زلهێزەکان یان ئیسرائیل دێتە کایەوە ئەوا ڕێگری لێدەکرێت و ئەگەر سەریش بگرێت بە هەر نرخێک بووە لەباری دەبەن.

ڕەنگە لێرەدا پرسیارێک بوروژێنرێت، ئەویش ئەوەیە: ئەگەر شتەکە بەو شێوەیە بۆچی ڕێگە درا بە حکومەتی ئیسلامی ئێران و حکومەتی شیعی عێراق و ئاک پارتی لە تورکیا بێنە سەر حوکم؟ لە وەڵامدا دەڵێین ڕۆژئاوا شتەکانیان بە هەڕەمەکی نییە و بۆ هەموو شتێک حیسابی خۆیان کردووەو لە ئەنجامی خوێندنەوەی قووڵ بۆ شتەکان بڕیار دەدەن و لە هەموو شتێکدا قازانج و زەرەر لێکدەدەنەوە و سودو زیانە نزیک و دوورەکان لێک دەدەنەوە. ڕۆژئاوا جیاوازی نێوان شیعەو سوننە باش دەزانن و فکری خومەیەنییان باش خوێندبویەوە و پێدەچێ باش زانیبێتیان هەڵدەستێت بە هەناردەکردنی شۆڕش و بڵاوکردنەوەی مەزهەبەکەی و لە ئەنجامدا

ململانێیەکی زۆر لە ناوچەکەدا ڕوو دەدات و ناوچەکە بە شەڕی تائیفی گڕدەگرێت و وڵاتە عەرەبییەکانیش لە ناچاریدا و بۆ پاراستنی خۆیان پەنا دەبەنە بەر ئەمریکاو زیاتر خۆیان دەهاونە باوەشیەوە.

ڕێگەدان بە پێکهێنانی حکومەتێکی ئیسلامی لەسەر مەزهەبی شیعە لە عێراقیشدا بۆ هەمان مەبەست بوو، دەرئەنجامەکەشی دیارە کە ئەمرۆ ململانێی شیعەو سوننە لە ئاستێکدایە ڕەنگە بە درێژایی مێژووی ئیسلام بە سەردەمی صەفەوییەکانیشەوە شتی وای بە خۆیەوە نەبینیبێ. هەر ئەم ململانێیە وای کردووە پرۆژەی ئیسلامی زۆر بەرەو دواوە بچێت و خەڵکانێکی زۆر چ لە ئێران و چ لە عێراق و ناوچەکانی تردا ڕوو لە ئیلحاد و بێدینی بکەن.

تەسک کردنەوەی پەتەکە ئەمرۆ لە ملی ئێران من وای بۆ دەچم هۆکارەکەی بگەڕێتەوە بۆ ئەوەی تا ئێستا ئێران نایەوێت بە فەرمی دان بە قەوارەی جولەکەدا بنێت و یارمەتی حەماس دەدات و هەرکاتێک ئەو کارە بکات لەو باوەڕەدام ئەو ئابلۆقەیەی لەسەر لا ببرێت. جمهوری ئیسلامیش ناتوانێ ئەو کارە بکات چونکە پرسی فەڵەستین بە نیسبەت ئەوەوە زۆر هەستیارە، ئەوان لەیەکەم ڕۆژەوە دەماری عەرەبی سوننەیان ئەزانی و مێشکیانیان باش خوێندبویەوە بەتایبەت بزوتنەوە ئیسلامییەکان و ئەیانزانی بەلای ئەوانەوە مەسەلەی فەڵەستین و قودس پرسێکی مەرکەزین بەلایانەوەو پێوەری سەرەکین بۆ هەڵسەنگاندنی هەر لایەنێک، بۆیە جمهوری ئیسلامی لەیەکەم ڕۆژەوە ئەو پرسەی کردە پردێک بۆ پەڕینەوە بۆ ناو جیهانی سوننەو تاڕادەیەک سەرکەوتنی باشی بەدەست هێنا بە تایبەت لە ڕێگەی حزبوڵلاوە . بەڵام دوای هاتنی شیعەی عێراق و پاکتاوی سوننە لە عێراقدا و بەهاری عەرەبی و پشتیوانی کردنی ئێران و حزبوڵلا لە ڕژێمی سوریا، جمهوری ئیسلامیش و حزبوڵلاش مصداقییەتی خۆیان تاڕادەیەکی زۆر لەدەست داوە، تاقە وەرەقەیەکیش بەدەستیانەوە مابێت مەسەلەی فەڵەستین و حەماسە کەلەو باوەڕەدام ئێران کە دەوڵەتێکی پەیامدارە ئامادە نییە دوا وەرەقەی خۆی بدۆڕێنێ، ئەگەر چی زەرەری زۆریش بکات لە ڕووی ئابوریی یا سیاسییەوە.

بە نیسبەت تورکیاشەوە لەو باوەڕەدام عەلمانییەکانی تورکیاو سوپاش ناچاربوون ڕێگە بە حزبەکەی ئۆردوگان بدەن دەسەڵات بگرێتە دەست، چونکە ئابووری تورکیا تەواو تەپیبوو، چووبوونە ناو تونێلێکی داخراوەوەو هیچ چارێکیان نەبوو قبوڵکردنی ئەنجامەکانی هەڵبژاردن نەبێت، بەتایبەت ئەگەر ئەوە بزانین کە ئۆردوگان لەو ماوەیەی سەرۆک شارەوانی ئەستەمبوڵ بوو سەرکەوتنێکی گەورەی لە ڕووی ئابووری و ئیدارییەوە بەدەست هێنابوو، جگە لەوەی کە ئەوان خۆیان بە حزبێکی عەلمانی ناساندووەو لەوانەیە بەڵێنیان دابێ کە دژ بە ئیسرائیل هیچ کارێکی نەرێنی نەکەن. ڕووداوەکانیش سەلماندیان تورکیا دەوڵەتی بەرژەوەندییەکانە زیاتر لەوەی دەوڵەتێکی خاوەن پەیام بێت و بەرژەوەندییەکانی خۆی ناکاتە قوربانی هیچ شتێک، بە پێچەوانەی ئێرانەوە کە مەزهەب و بەرژەوەندی مەزهەبی بەلایەوە لەسەرووی هەموو شتێکەوەیە.

کۆتا خاڵ کوردستانی خۆمانە کە من لەو باوەڕەدام هەموو هۆکارە خودی و بابەتییەکانی تێدا هەیە بۆ ئەوەی نەهێڵێ دیموکراسییەت تێیدا بەرپا بکرێت. سەرباری ئەو هۆکارە خودییانەی لە پێشەوە باسمان کرد هەندێک هۆکاری تریش هەن، لەوانە عەقڵییەتی خێڵەکی حزبە عەلمانییەکانی کوردستان و سەرانی ئەو حزبانە بەتایبەت دوو حزبی دەسەڵاتدار.

عەقڵییەتی شاخ و عەسکەرتاری بەڕادەیەکە کە

کەسێکی دیاری ناو حزبێکی دەسەڵات بڵێت ئێمە تاخاوەنی کورسییەک بین کەس ناتوانێ لەسەر دەسەڵات لامان بدات ! (٢)

هەر هەمان بەرپرس رێکخراوێکی داناوەو لە ژێر دروشمی» ئایین بۆ تاک و دیموکراسی بۆ هەمووان» دا کۆنفرانس دەبەستێت لە کاتێکدا کە خودی ناونیشانەکە بەڵگەیە لەسەر تێنەگەیشتن لە چەمکی دیموکراسییەت چونکە لە دیموکراسییەتدا نابێ دید و بۆچوونی خۆت فەرز بکەیت بەسەر کەسدا بەتایبەت لە رێبازێکدا کە تێکستەکانی ئەو رێبازە وا ناڵێن. جا ئەگەر رۆشبیرترین کەسی ناو حزبێک ئاوها لە دیموکراسییەت گەیشتبێ ئەبێ حاڵی خەڵکانی تر چۆن بێت!

هۆکارە دەرەکییەکان کاریگەرییان لەسەر کورد زیاترە تاوەکو وڵاتانی تر چونکە ئەگەر بەنیسبەت وڵاتە عەرەبییەکانەوە تەنها وڵاتە زلهێزەکان رۆڵیان هەبێ وهەڵوێست لە ئیسلام و رەچاوکردنی بەرژەوەندی ئیسرائیل هۆکار بن ئەوا لە کوردستاندا وڵاتانی دەوروبەریش رۆڵیان هەیە و بەرژەوەندییەکانیان و ئاسایشی نەتەوەییان پەیوەندی هەیە بە دۆزی کوردەوە بۆیە کێشمەکێشی سیاسی نێوان ئەو وڵاتانە کاریگەری راستەوخۆیان هەیە لەسەر کوردستان.



## پەراوێزەکان:

١ . گرنگیدانی دەزگای راند بە ئیسلام دەگەرێتەوە بۆ ساڵ ١٩٩٩ واتە پێش رووداوەکانی ١١ی ٩ بە دوو ساڵ کاتێک توێژینەوەیەکیان بڵاوکردەوە بە ناوی رووبەڕوو بوونەوەی ئیرهابی نوێ کە کۆمەڵێک توێژەر نووسیبوویان.

٢ . لە راستیدا دەبوایە بوتایە : ئێمە تاخاوەنی یەک چەکدار بین کەس ناتوانێ لەسەر دەسەڵات لامان بدات یان تا خاوەنی یەک چەکدار بین خاوەنی کورسی پەرلەمانی خۆمان دەبین بەڵام وەکو بەعەرەبی دەوترێت: خانته العبارە. واتە قسەکەی بە جوانی بۆ نەهات!



# لەنێوان شورا و دیموکراسیەتدا

## چاوپێکەوتن لەگەڵ نووسەر و خاوەن فکری ئیسلامی ئەبوبەکر عەلی

گفتوگۆ: خاڵ

**خاڵ: تێگەیشتنی ئێوە بۆ چەمکی شورا چییە، ئەم واژە لە قورئاندا بە چ واتایەک بەکار براوە؟**

ئەبوبەکر عەلی: ناتوانین راستەوخۆ لە دەقی قورئانیدا ئاماژەکانو ناوەرۆکی شورا دیاری بکەین. چونکە یەکێ لە خەسڵەتەکانی قورئان بەشێوەیەکی گشتی بەکارهێنانی زاراوەیە بە ئاماژەکانی پێش دابەزینی وەحی، بەڵام لە سیاقێکی نوێ دا، هەروەها پێناس نەکردنی زاراوەکانە.

بۆ نموونە خوای گەورە فەرمانمان پێدەکات بە (شورا) و(دادپەروەری) بێ ئەوەی پێناسەیان بکات. ئەمەش ئەوە دەردەخات کە ناوەرۆکی ئەم چەمکەو زاراوانە ملکەچن بۆ رێکەوتنی دەستەجەمعیو کۆمەڵگەیی و پەرەسەندن، بەمجۆرەش (دەق) بۆ هەمیشە بۆ مانا لێهەڵێنجانو خوێندنەوەی نوێ کراوە دەبێت. لە سۆنگەی پێناسەکردنی چەمکی (شورا)ش لە قورئاندا بۆ نزیکبوونەوەلە ئاماژەو ماناکانی دەبێت پەنا بەرین بۆ:

١. ئاماژەکانی چەمکەکە لە فەرهەنگی زمانی عەرەبیدا.
٢. ئەو سیاقە قورئانییەی تیایدا بەکار هاتووە.
٣. هەندێ دەقی فەرمودە لەو بارەوە.
٤. جۆری مامەڵەکردنی پێغەمبەر و باوەڕدارانی سەرەتای ئیسلام لەگەڵ چەمکەکەو تێگەیشتنیو چۆنیەتی پیادەکردنی.
٥. لە ئاستێکدا دەتوانین سوود لە ئەزموونی قۆناغی (راشیدین) یش وەربگرین بە حوکمی نزیکبوونی لەسەرەتای ئیسلامو نزیکترین ئەزموون لە گیانی دەقەکە لە سیاقە مێژوویی یەکەیدا.

لەڕووی زمانەوە وشەکە ئاماژەیە بە: ئاماژە کردن، پاڵفتە کردن، بەرز کردنەوە، فەرمانکردن، نیشاندان و خستنە روو تاقیکردنەوە. (راغب)بە دەرهێنانی را لەڕێی گەڕانەوە و پێداچوونەوەی را جیاوازەکانی داناوە. نووسەرو بیرمەندە ئیسلامییەکان لە سەردەمی نوێدا پێناسەی جۆراوجۆریان بۆ کردووە، لە وێنەی را داواکردن لە خاوەن را یاخود لەو کەسەی نوێنەرایەتی دەکات، لەمەر کاروبارە گشتییەکان. یاخود: ئاڵوگۆڕی بیروڕا دەربارەی پرسو مەسەلەیەک بۆ گەیشتن بە باشترین ڕاو رێکەوتن لەسەری.

گەر بشگەڕێینەوە بۆ ئەو دوو ئایەتەو سیاقەکانیان، کە قورئان راستەوخۆ وشەی (شورا) ی تیایاندا بەکار هێناوە، هەست دەکەین لە ئایەتی (١٥٩)ی (آل عمران)دا:

(فَبِمَا رَحْمَةٍ مِّنَ اللَّهِ لِنتَ لَهُمْ وَلَوْ كُنتَ فَظًّا غَلِيظَ الْقَلْبِ لَانفَضُّوا مِنْ حَوْلِكَ فَاعْفُ عَنْهُمْ وَاسْتَغْفِرْ لَهُمْ وَشَاوِرْهُمْ فِي الْأَمْرِ فَإِذَا عَزَمْتَ فَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُتَوَكِّلِينَ) ١٥٩..

(شورا) بۆ دەستنیشانکردنی خەسڵەتێکی سەرکردە کە لە کەسێتی پێغەمبەردا (د.خ) بەرجەستە دەبێت بەکار هاتووە، ئاماژەشە بۆ وەلالانی دڵڕەقیو نامیهرەبانیو هەڵوێست نەگرتن لەسەر هەڵەیەک کە ڕوویداوەو سزا نەدانی ئەوانەی بەشداری هەڵەکە بوون ، لەڕێی پشتگوێ خستنو بێ ڕۆڵکردنیانەوە لە گوێلێگرتن و گوێلێنەگرتنو هاوبەشی پێکردن، بەڵام لەو سۆنگەوە کە ئایەتەکە بەشێکە لە چارەسەرکردنی دەرهاویشتەکانی جەنگی (ئوحود).. شورا بە پلەی یەکەم فەزیلەتی سەرکردەیە.

هەرچی پەیوەستە بە سورەتی شوراوە، چەمکەکە لە چوارچێوەیەکی بەرینترو بونیادیتردا خراوەتە ڕوو، چەمکێکە لەنێو مەنزومەیەکی فراوانتری ئەخلاقیو فکریو عیبادی کە بەشداری لە خەملاندنی ناسنامەی کەسێتیو کۆمەڵگەی موسڵمان دەکەن، سیاقی بەکارهێنانی شوراو بەستەوەی بە (أمر)ەوە، کە لە قورئاندا ئاماژەیە بۆ ئەوشتانەی پەیوەندیان بە سیاسەتو دەسەڵاتو بواری گشتی یەوە هەیە، هەروەها گرێدانی بە کۆمەڵێ مافو ئەرکو خەسڵەتی ترەوە لەوانەش: قبوڵنەکردنی ناهەقیو رەتکردنەوەی ستەمو بەرهەڵستی کردنی، ئاسۆیەکی یەکجار فراوان بۆ خوێندنەوەو ئیلهام و وزە لێوەرگرتنو پێگەیاندنی کەسێتی یەکی ئەرێنی خاوەن کەرامەتو جوامێرو

عەدالەتخوازو کۆمەڵگەیەکی ئەخلاقیو زیندوو، دەخاتە بەردەم نەوەکان. لە قۆناغە جۆراوجۆرەکانی مێژوودا، بە مەرجی دارِنینی فۆرمە مێژووییەکانی پیادەکردن لەم دەقانەو مامەڵە لەگەڵ کردنیان وەک چرای رێنوێنی و سەرچاوەی ئیلهام لێ وەرگرتنیو رۆحیەتو ستەم دژیو هەست بە بوونی خۆکردن.

مەترەحکردنی (شورا) لە سورەتی شورادا لەنێو چەندین فەرمانو خەسڵەتی تردا ئەم چەمکە دەکات بە کەرەسەی خۆبنیاتنانەوەیەکی فکریو ئەخلاقی بەردەوام. جێگای سەرنجە وەڵامدانەوە بە پەیامی خوا، پەرستنیو بەرپاکردنی نوێژەکان، چاوبرِینە لای خواو پشت پی بەستنی، بە پێچەوانەی بەرەنجامگیرییەکانی مارکس سەبارەت بە ئیسلام و لەروانگەی دەقەوە، نەک تاکو کۆمەڵگە بەرەو پاسیڤیو نەرێنیو دەستبەرداربوون لە ئیرادەو کەسێتی نابەن ، مرۆڤ بە واقیعی ژیانو دنیا نامۆ ناکەنو ملکەچی ئیرادەی شەرِو ستەمو چەوساندنەوەی ناکات، بەڵکو دەبێتە سەرچاوەیەکی تری هاندانو مانا پێدان لە سەرەرِێی بەگژداچوونەوەی ناهەقیو زۆرداریو بەرهەڵستی دەستەجەمعی دەرهەق بەو کەسو هێزانەی لە بیری دەستدرێژیو بێ حورمەتیدان بە کەسو کۆمەڵگەکان.

ئەوەی گرنگە لە [أمرهم شوری بينهم] لە سورەتی شورادا وەک هەندی ئاماژەمان پێکرد (رەنگە لە پرسیارەکانی دواتریشدا بگەرِێینەوە سەری) تێکەڵبوونی شورایە لەرِووە سیاسییەکەی بەم مەسەلانەی خوارەوە:

(أ) رەتکردنەوەی ناهەقیو زۆرداریو رووبەرِوو وەستانەوەی. کە لەدوای شۆرِشی فەرەنساوە بە مافی بەرگری لەخۆکردن بەرامبەر ستەمی حوکمرِانەکانو دەسەڵاتو شۆرِشکردن دژ بە حکومەتو دەسەڵاتی زۆردار، گوزارشتی لێ دراوەتەوە.

(ب) تێکۆشانی دەستەجەمعیو پشتی یەک گرتن لەم پێناوەدا.

(ج) رەتکردنەوەی لۆمەو تۆمەتبارکردنی ئەو کەسانەی بەرگری لە خۆیانو مافەکانیان دەکەنو دژ بە ناهەقیو زۆرداری دەوەستنەوە، بە پێچەوانەشەوە ئاراستە کردنی رەخنەو سەرزەنشت لەو هێزو گروپو کەسانەی دەستدرێژی دەکەنو ستەمکارو زۆردارن.

بۆیە بەرِای ئێمە مەسەلەی جەوهەری ئێمە لە پەیوەندی بە نزیکبوونەوە لە ناوەرِۆکو ئاماژەو وەزیفەکانی (شورا) لەم سیاقە قورئانی یەدا دوو شتە:

(١) دانەبرِینی چەمکەکە لە سیاقە قورئانییەکەو بە تەنها مامەڵە لەگەڵ نەکردنی.

(٢) بەستنەوەی ناوەرِۆکو ئاماژەکانی بە پرسی دژایەتی ستەمکاری یەوە.

بەو مانایەی دۆخی شورا و شوراخوازی دۆخێکی سیاسیو شێوازێکی بیرکردنەوەو مامەڵە کردنە کە لە چوارچێوەیاندا، سازش لەگەڵ ستەمو ناهەقی ناکرێتو جێگای خۆسەپاندنو بێمافیو نایەکسانی تێدا نابێتەوە.

گەر بشگەرِێینەوە بۆ سوننەتی پێغەمبەر(د.خ) سەرنج لەو دەقانە بدەین کە بەناوی فەرمودەوە لەم بوارەدا هاتوون، لەگەڵ ژیاننامەی پێغەمبەرو جۆری مامەڵە کردنی بە شێوەیەکی کرداری لەگەڵ چەمکەکەدا، دەتوانین ئاماژە بە چەندین خاڵ بکەین، لەوانەش:

(أ) بەستنەوەی شوراخوازیو رێزگرتن لەم پرەنسیپو بەهایە بەفەرِو چاکەو فەزیلەتە و بەرەنجامو ئاکامی دڵخوازو باشەوە.

(ب) بەشداری هاوەڵەکانی لە دروستکردنی هەندێ برِیاری گشتی.

(ج) ئامادەگی بۆ پێکهێنانی چوارچێوەی بەیەکەوە ژیانی هاوبەش لە سایەی ئومەتێکی سیاسی سەرو دینی دا لەگەڵ خاوەن ئاینەکانی تردا. کە لە سەحیفەی مەدینەدا رەنگ دەداتەوە.

(د) پارێزگاریکردن لە ئازادی ئاینی خاوەن ئاینەکانی ترو پێوەرە ئەخلاقی یەکانی جەنگ.

(ه) بەجێهێشتنی پرسی ئەمری سیاسی و مەسەلەی حوکمڕانی دوای خۆی بە کراوەیی بۆ شوراو رێککەوتنی موسڵمانانو دەستنیشانکردنی وەک مەسەلەیەکی گۆڕاو و دنیایی لەڕوانگەی رێنومایی یە ئیسلامییە گشتییەکانەوە.

لە ئەزموونی (راشیدین) یشدا کە دەتوانرێت وەک پێشینەی سیاسی (سابقە) سەیر بکرێت شورایی بوون و کاراکردنی چەمکەکە چەندین واتای گەیاندووە، لەوانەش:

(١) رەتکردنەوەوی حوکمی بنەماڵەیی و پشتاوپشت.

(٢) رەتکردنەوەی بەزۆر خۆسەپاندنی سیاسیو هەڵکوتانە سەر دەسەڵاتو زەوتکردنی.

(٣) خاکی بوونی حوکمڕانو تێکەڵ بوونی بە خەڵکو دانەبڕان لێیان.

(٤) دوور کەوتنەوە لە رواڵەتەکانی دەسەڵاتگەرایی باوو زەرقو بەرقی دەسەڵات.

(٥) مامەڵە کردنێکی پاکو لێپرسراوانە لەگەڵ ماڵی گشتی.

(٦) پیادەکردنی یاسا بەسەر کەسەکاندا بە یەکسانی و یەکسانی لەبەردەم دادگادا.

لەدوای ئەم پێشەکی یە دەخوازم بڵێم: لای ئێمە شورا قابیلی پێناسەکردنێکی یان مێژوویی نییە.

وە بە پلەی یەکەم ئاماژەو رۆحی یەتە ..

شورا ئاماژەیە بە جیهانبینی یەک کە تیایدا ئەمری سیاسی بە پرسێکی گشتی دەزانێت. بابەتو پرسی سیاسی دەبێت گفتوگۆی لەبارەوە بکرێتو رێکەوتنی لەسەر بکرێت، بریاری سیاسی لەلایەن هیچ کەسو بنەماڵەو هێزو تەوژمێکەوە قۆرخ نەکرێت. بەوەش نەتەوە نەک دەسەڵاتو دەوڵەت دەبێت بە سەرچاوەی رەوایەتیو نوێبوونەوەی بەهاکانی سیاسەت. بەڵام ئەمەی دەریشمان بڕی ناتوانین بڵێین ئەمە مانای شورایە لە قورئاندا، بەڵکو ئەوپەڕی ئەوەی بتوانین بیڵێین ئەوەیە کە ئەمە بۆچوونو تێگەیشتنو خوێندنەوەی ئێمەیە بۆ ناوەرۆکی چەمکەکە لەچوارچێوەی ئەو واقیعو قۆناغە مێژووییەی جیهانو کۆمەڵگە موسڵمانەکانیشی تێدا دەژی. بۆیە لەکایەی سیاسەتدا یەکێ لەو شتانەی پێویستی بەرێکەوتنە لەسەر ئاماژەو ناوەرۆکەکەی خودی (شورا) خۆیەتی. واتە دەبێت رێکەوتن لەسەر ناوەرۆکو مەبەست لە شورا بکرێت، پێش ئەوەی چاوەڕێی لێ بکرێت ببێت بە چوارچێوەی رێکەوتن لەسەر پرسەکانی تر، یاخود وەک ئامرازێکی شیکردنەوەو داوەریو بەراورد کردن بەکار بهێنرێتو سوودی لێ وەربگیرێت. ئەگەر رێکەوتن لەسەر ناوەرۆکەکەی لەسەر ئاستی وڵاتانی ئیسلامیشدا کارێکی نیمچە مەحاڵ بێت، بەهۆی جیاوازی رژێمی سیاسیو ئاستی گەشەکردنو تێگەیشتنی ئاستی ئیسلامی ئەوا دەبێت لەسەر ئاستی نیشتمان و هەر وڵاتێک رێککەوتن بکرێت.

**خاڵ: ئایا شورا مەسەلەیەکی رەوایەتی پێدراو بەشێکە لە کلتوری خێڵی عەرەبو قورەیش لە پێش ئیسلامدا، ئیسلام ئەوەی پەسەند کردووە، یاخود مەسەلەیەکی نوێیە لە ئیسلامداو ئەو هێناویەتیو دایهێناوە؟**

ئەبوبەکر عەلی: سەرچاوە مێژووییەکان پێمان دەڵێن (العقیدة والسیاسة/ لؤی صافی) (شورا) پێش ئیسلامیش وشەیەکی ناو فەرهەنگی زمانی عەرەبیو بەشێک بووە لە کلتوری خێڵی عەرەبی. بۆ هەڵبژاردنی سەرۆکی خێڵو دواتر بەشداری پێکردنی ریش سپیو پیاوماقوڵانی (خێڵ) لە دیاریکردنی سەرۆک خێڵ بریارو چارەسەری کێشەکاندا بەکار هاتووە. هەربۆیە جۆری پیادەکردنیشی لە نێو موسڵماناندا، بە سەردەمی خەلافەتی (راشیدین) یشەوە، لەڕوی میکانیزمو بەرجەستە کردنەوە، هیچ جیاوازییەکی لەگەڵ پێش خۆیو سەردەمی پێش دابەزینی ئیسلامدا نەبووە. پێناسە نەکردنی

چەمکی (شورا)ش لە قورئاندا ئاماژەیە بۆ ئەوەی ناوەرۆکی چەمکەکە بۆ باوەڕدارانی سەرەتای ئیسلام روونبووە، چونکە خودا فەرمان بە شتێک ناکات قابیلی تێگەیشتن نەبێ و (مکلف) تێی نەگات و نەزانێت مەبەست لێی چییە: ئیزافەی ئیسلام بۆ چەمکەکە لە جۆری پیادەکردنیدا نەبووە، چونکە ئەوە کاری (ئاین) و لەوانەش ئیسلام نییە، بەڵکو دووبارە تەرحکردنی چەمکەکەیە لە سیاقێکی نوێی کۆمەڵگەیدا بەستنەوەیەتی بە چەمکی کۆمەڵی موسڵمانانو ئوممەتی ئیسلامییەوە. واتە بەستنەوەیەتی بە بونیادێکی کۆمەڵایەتی نوێوە کە لەسەر بناغەی (ئیمان) و (برایەتی دینی) و هاوبیروباوەڕی، نەک هاوخوێنیو رەچەڵەکی خێڵ دامەزراوە. هەر خودی ئەمەش کار دەکاتە سەر سیاقو چوارچێوەو ئامانجەکانی چەمکەکە، بە حوکمی ئەوەی (شورا) لە سورەتی (الشوری) دا وەک بەشێک لە مەنزومەیەکی گشتی تری ئەخلاقیو زەمانەت پێدان خراوەتە ڕوو.

بە واتایەکی تر ئەوانەی لەم سیاقە قورئانیو ئیسلامی یەدا (شورا) دەکەن، هاو وێنەی سەرۆک خێڵو پیاوماقوڵو قسە رۆیشتووانی فەزای خێڵی عەرەبی نین. بەڵکو کەسانێکن چوونەتە نێو پرۆسەیەکی قوڵی دووبارە خۆداڕشتنەوەی جیهانبینیو ئەخلاقیو رەفتاریو بە گشتی کەسێتی یەوە. ئامانجیان لەژیانکردن گۆڕاوەو تێگەیشتنیان بۆ دۆستایەتیو دوژمنایەتی و (هەق)و (ناهەق)و چۆنیەتی هەڵوێستگرتن پەرە سەندنی بەخۆوە بینیوە. (اهلی شورا) کە باوەڕداران بە گشتی دەگرێتەوە، کەسانێکن لە ئاستێکی بەرزی ئەخلاقیدان، کۆنترۆڵی خۆیان کردووە وکەسایەتییەکی هاوسەنگن.

بۆ ئەوەی لێرەدا قسەکانمان کورت بکەینەوە، دەڵێین ئەوەی لەم شوێنەدا گرنگە سەرنجی بۆ لا ڕابکێشرێ، ئەم خاڵانەی خوارەوەن:

١. پەیوەست نەکردنی شورا بە توێژو کەسانێکی دیاریکراوی ناو کۆمەڵگەو مەترەحکردنی وەک خەسڵەتێکی گشتی کۆمەڵگەی موسڵمان و بەشێکی جیانەکراوەو رەسەنی کەسێتی باوەڕدار.

٢. بەستنەوەی شورا بە مافی دژایەتی کردنی ستەمو زۆرداری یەوە: [وَٱلَّذِينَ ٱسۡتَجَابُواْ لِرَبِّهِمۡ وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَمۡرُهُمۡ شُورَىٰ بَيۡنَهُمۡ وَمِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ يُنفِقُونَ ٣٨]الشوری/٣٨ .

بەڵام بەدەر لە هەموو ئەوە دیدی قورئان، بۆ تەرحکردنی بابەتەکانی، بەو بابەتانەشەوە کە مۆرکی سیاسیان هەیە، یاخود پەیوەندییان بە بەکارهێنانی هێزو ململانێ وە هەیە، دیدێکی ئەخلاقییە نەک فقهی. تەنها لەڕێی بە ئەخلاقی هێشتنەوەی ئەو دیدەشەوە، دەقی قورئانی بە نەمریو کراوەیی و سەرچاوەی تیشکدانەوەی دەهێڵرێتەوە و راڤەو لێکدانەوە مرۆڤییەکان و قۆناغە مێژوویی یەکانو میتودە فقهیو تەفسیریەکان لەقاڵب نادرێت.

**خاڵ: ئایە شورا هەمان دیموکراسیو عەقڵی دەستەجەمعی یە یاخود بە تەواوەتی مەسەلەیەکی ترە؟ لێکچوونو لێکنەچوونی لەگەڵ کۆدەنگی سیاسیو عەقڵی دەستەجەمعیو رای زۆرینە چییە؟**

ئەبوبەکر عەلی: پێم وایە (شورا)دیموکراسی نییە، بەراوردکردنی شورا بە دیموکراسی کە لەسەدەی نۆزدەو لەسەر دەستی بەشێ لە گەورە ریفۆرمیستەکانی ئەو رۆژگارەوە دەست پێ دەکات و تاکو ئێستاش درێژەی هەیە، پەیوەستە بەو تەحەدا ژیاریو سیاسییەی لەسەردەمی نوێدا دووچاری موسڵمانان بۆوە. هەڵبەت ئێمە لە پەیوەندی بەدیاریکردنی جۆرو سروشتو پەیوەندی نێوان (شورا)و (دیموکراسی) لە فکری نوێو هاوچەرخدا، زیاد لە بۆچوون وخوێندنەوەیەکمان لەبەر دەستدایە، لەوانەش:

١. یەکسان کردنی (شورا) بە (دیموکراسی).

٢. رەتکردنەوەی (دیموکراسی) بەناوی (شورا)و بە چەمکو سیستمێکی نائیسلامی لەقەڵەمدانی کە رەوتی سەلەفیو بەشێ لە

نوسەرانی بزاڤی ئیسلامیش کە دیسانەوە بە جۆرێکی تر هەڵگری بیری سەلەفیەتن، بەمجۆرە بیریان کردۆتەوە.

٣. بەراورد کردن لە نێوان (شورا)و (دیموکراسی) و قبوڵکردنی هەندێ رواڵەتی (دیموکراسی) کە گوایە لەگەڵ (شورا)دا گونجاوەو رەتکردنەوەی هەندێ بەشی تری، هەروەها فەزڵدانی (شورا) بەسەر دیموکراسی دا و نیشاندانی وەک شێواز و سیستمێکی کاملتر و تێرو تەواوتر.

هەڵبەت تێکڕای ئەم خوێندنەوانە ڕووبەڕووی پرسیارو رەخنەی جۆراوجۆر دەبنەوەو ناتوانن وێنایەکی روونو ئاشکراو سەردەمیانەی ئەم پەیوەندییەمان بدەنێ. لەگەڵ جیاوازی ئاستی نزیکیو دووریان لە پێکانی راستی یەوە.

کێشەی جەوهەری هەرسێ جۆرە خوێندنەوەکە سەیرنەکردنی (شورا) یە وەک چەمکێکی پێناسەنەکراوی قورئانی و بەهاو پێدراوێکی ئەخلاقی. لەکاتێکدا دیموکراسی هاوچەرخ تەنها بەها نییە، بەڵکو مەنزومەیەکی تێرو تەسەلە لە میکانیزمو رێکارو قاڵبو دەستەبەری. بە تەواوی مانا شێوازێکی دیاریکراوی پێناسەکراوە بۆبەڕێوەبردنی کۆمەڵگەو دەسەڵات. هەر بۆیە دیموکراسی (شورا) نییە. خۆ ئەگەر (شورا) ببەستینەوە بە بەرجەستەبوونە مێژووییەکانیوئەو شێوازانەی لەڕێیانەوە پیادە کراوە، تا ڕادەیەکی بەرچاو کێشەو ناکۆکی لەگەڵ دیموکراسی لە کۆمەڵگە نوێکاندا بۆ دروست دەبێت. ئەمە جگە لەوەی سیاقەکان بۆ تەرحکردنی هەریەک لە (شورا) و (دیموکراسی) لەڕووی قۆناغی ژیاریو چوارچێوەو وەزیفە و (اجتماع)ی سیاسییەوە لێکجیاوازن.

ئەوەی کێشەی ئەم بەراوردەشی خولْقاندووە، بیرۆکەی (تأصیل)و خاوەنداریێتی لە خودی شارستانێتی و تێکەڵاوکردنی زیاد لە پێویستی مەسەلە دنیاییو گۆڕاوەکانە بە

**ئەو دیدە راستترە کە لەم چوارچێوەدا دەخوازێت دیموکراسی بە چەمکی (عەدالەت) لە ئیسلامدا (تأصیل) بکات نەك شورا.**

**هەڵەی هەرە گەورەی بیرو بزاڤی ئیسلامی نوێش لە پەیوەندی بە پرسی دەوڵەتەوە، لەوەدا بووە، کە قاڵبو ئامرازە کۆنترۆڵکەرەکانو دەزگاکانی نوێ وەردەگرێتو زەمانەتی خراپ کارنەکردنی کە دیموکراسییە رەتکردۆتەوە!.**

**هەڵەی هەرە گەورەی بیرو بزاڤی ئیسلامی نوێش لە پەیوەندی بە پرسی دەوڵەتەوە، لەوەدا بووە، کە قاڵبو ئامرازە کۆنترۆڵکەرەکانو دەزگاکانی نوێ وەردەگرێتو زەمانەتی خراپ کارنەکردنی کە دیموکراسییە رەتکردۆتەوە!.**

حوکمەکانی شەریعەتو پراکتیکە مێژووییەکان و نوێنەبوونەوەی قوڵ ومەنهەجیی فکری ئیسلامییە.

هەر بۆیە ئەو دیدە ڕاستترە کە لەم چوارچێوەدا دەخوازێت دیموکراسی بە چەمکی (عەدالەت) لە ئیسلامدا (تأصیل) بکات نەک شورا. کە سروش بە یەکێ لەوان دەژمێردرێت، چونکە (عەدالەت) لەم شوێنەدا لە پیادەکردنە مێژووییەکان وفۆرمەکانی بەرجەستەبوونو حوکمە فیقهی یە داڕێژراوەکان لەسەر بناغەی واقیعو ئەو پراکتیکە، کە زۆرجار جەبری سیاسی و مەعریفەی قۆناغی مێژوویی لە پشتەوەیە، ڕزگارمان دەکات. شوراش دەبێت بە یەکێ لە ڕەنگدانەوەکانی پابەندی بە دادپەروەریو عەدالەتخوازی یەوە. بەڵام سەبارەت بە وێناکردنی پەیوەندی لە نێوان (شورا)و (دیموکراسی) یش دەتوانین، بڵێین: کە گروپو نەتەوە گەلێک خودا (شورا)ی کردبێتە یەکێ لە خەسڵەتەکانیان، دەبێت بێ کێشەتر دەرگای بیرو کۆمەڵگەکانیان بۆ دیموکراسی بخەنە سەر پشت، بە حوکمی ئەوەی بەرجەستەی باشترین فۆرمی عەدالەتی سیاسی و بەشداری خەڵک لە ئێستادا لەخۆ دەگرێت. ئەوەی لەم ڕووەشەوە گرنگە، دارنینی شورایە لە پراکتیکە مێژووییەکانی و مامەڵە لەگەڵ کردنێتی وەک بەهاو چەمکێکی ئەخلاقیو کراوە. بەڵام لەگەڵ هەموو ئەوەدا بە پێویستی نازانم لەجیاتی (دیموکراسی) یاخود لەپاڵ (ئەودا) چەمکی (شورا) بەکار بێنرێت، بۆ ئەوەی ڕاڕایی لە مامەڵەکردن لەگەڵ دیموکراسی دا، وەک عەقڵانی ترین شێوازی سەردەم بۆ بەڕێوەبردنی جیاوازییەکانو بەشداری سیاسیو وەلانانی توندوتیژیو پاراستنی ئازادییەکان نەیەتە کایەوە، هەروەها لەبەر گرانی جیاکردنەوەی (شورا) وەک چەمک لە (شورا) وەک پراکتیکی مێژوویی کە ملکەچی قۆناغو پێدراوە مێژووییەکان بووە.

ئەم مەترسی یەش لەوەوە سەرچاوە دەگرێت کە تاکو ئێستاش مۆرکی زاڵی عەقڵی ئیسلامی فقهی یە نەک بەهاییو ئەخلاقی. ئەم مشتو مڕانەش بەرهەمیان نابێتو کۆمەڵگە موسڵمان نشینە هاوچەرخەکان ناگەنە ساتەوەختی بنیاتنانی دەوڵەتی مەدەنی خۆیان، تا نەچنە دەرەوەی سیاقی ئەوەی لە ئەدەبیاتی ئیسلامی نوێداو لەوانەش ئەدەبیاتی (اخوان) و (کۆمەڵەی ئیسلامی پاکستان) و (مەودوودی)دا بە دەوڵەتی ئیسلامی ناوبراوە. چونکە ئەو مۆدێلە لە دەوڵەت کێشەی ڕاستەقینەی لەگەڵ دیموکراسیدا هەیە و (شورا)ش لە چوارچێوەی وەرگرتنو کارپێکردنی ڕووە ئامێریو کۆنترۆڵکەرەکەی دەوڵەتی نوێدا، دووچاری شێوان دەکات، لەبەر ئەوەی بەکارهێنانی چەمکی (شورا) لەسایەی ڕەتکردنەوەی دیموکراسی هاوچەرخ لە چوارچێوەی دەوڵەتی نوێدا، شورا لەگەڵ جۆرەها ڕواڵەتی نادادپەروەری و ستەمو جیاکاری تێکەڵاو دەکات.

هەرچی پەیوەستیشە بە کارکردن بەڕای زۆرینە، وەک پێوەرێک بۆ یەکلایی کردنەوەی جیاوازی بۆچوونەکان لەکاتی دارشتنی بڕیاردانی دەستەجەمعی دا، دەبێت بوترێت کە دەچێتە بواری فۆرمو ئەزموونەکانی پیادەکردنی چەمکەکەوە لە مێژوودا.

وروژاندنی ئەم پرسەش بەشێکە لە ڕەنگدانەوەکانی کاریگەربوون بە دیموکراسی، کە تیایدا زۆرینە پێوەرێکی بەلادا خستنی جیاوازییەکانە. گەر چاوێ بە مێژووی موسڵمانانیشدا بخشێنین سەیر دەکەین کە جیاوازیی جۆرە چارەسەر کردنی ئەم بابەتە لەلای نوسەرو بیرمەندە ئیسلامییەکان لە سەردەمی نوێدا، دەگەڕێتەوە بۆ جیاوازی ئەو پاشخانە فکریو قەناعەتە پێش وەختەی دەربارەی دیموکراسی هەیانبووە، هەروەها پەیوەست بووە بە ئاستی نوێبوونەوەی فکریی لەلای هەریەکێ لەوان.

ئەوانەیان کە فکریان نوی نەبۆتەوە و لەڕوانگە کەلەپورییەکانەوە ڕوانیویانەتە مەسەلەکە و دیموکراسیان بە چەمکو سیستمێکی نامۆ بە

ئیسلامو واقیعی موسڵمانان دیوە و فۆرمە مێژوویی یەکانی پیادەکردنی شورایان وەک بەشێکی خودی قورئان بینیوە، گەیشتونەتە ئەو بەرەنجامەی کە رای زۆرینە لە (شورا) دا بەوجۆرەی لە دیموکراسیدا هەیە، کاری پێ ناکرێت، چونکە ئەوەی لای ئیسلام گرنگە (هەق) و (ناهەق)ە نەک زۆری و کەمی! ئەم دیدەش جگە لەوەی کێشەی قوڵی لەگەڵ سروشتی کارو دروستکردنی بریاری سیاسی و گۆراو بوونی دا هەیە، هەروەها پێشمان ناڵی پێوەر بۆ دیاریکردنی هەق و ناهەق لە کاتی یەکلایی کردنەوەدا چییە؟ بەپێچەوانەی ئەمەشەوە ئەوانەی ویستوویانە لەرێی چەمکی (شورا)وە رەسەنسازی (تأصیل) ی دیموکراسی بکەن، هەوڵیانداوە سەرنج بۆلای هەندێ نموونە رابکێشن کە تیایدا بەرای ئەوان رای زۆرینە یەکلاکەرەوە بووەو کاری پێ کراوە. یەکێ لە نموونەکانیشیان شورای پێغەمبەر بووە بە هاوەڵەکانی پێش دەرچوون لە مەدینە لە جەنگی ئوحودا.

بەڵام لەراستیدا ئەم خوێندنەوانە لەگەڵ نیازپاکی خاوەنەکانیاندا لایەنگیرانەیە، لە دیموکراسییەوە گەرانەوە بۆ دووبارە بیناکردنەوەی ناوەرۆکی چەمکی شورا. چونکە لەگەڵ بوونی نموونەیەک لێرەو لەوی ئەم بۆچوون یان ئەوەی تر پشتراستبکاتەوە، دەردەکەوێت کە لەبەردەم سیستمێکی پێناسەکراوی تانو پۆداری روونو چەسپاو نین. واتە گەر لەرووداوێکدا پرس بە هاوولاتیش کرابێتو رەچاوی رای زۆرینە کرابێت، چارەسەری کێشەی رەوایەتی دان بە رای زۆرینە، لە دیموکراسی هاوچەرخدا چارەسەر ناکات چونکە:

(أ) نموونەی ترمان هەیە پێچەوانەی ئەوەو دەتوانرێت بۆ سەلماندنی پێچەوانەکەی بەکار بهێنرێت.

(ب) پێغەمبەر (د.خ) دەیتوانی پێوەرێکی تر بەکار بێنێ و کار بەرای زۆرینە نەکات ، بریاریشی لای هەمووان گوێلێگیراوو رەتنەکراوە بووە.

(ج) پێشتر رێکەوتن لەسەر فۆرمێکی دیاریکراوی (شورا) لەنێو هاوەڵاندا بوونی نەبووە، ئەوەی هەبووە ئەزموونەکانی نێو کلتوری خێڵ بووە.

(د) رای زۆرینە پێوەرێکی چەسپاو نەبووە، لە هەموو کاتو شوێنێکدا کاری پێ بکرێتو کارپێ نەکردنی کاردانەوە بەدوای خۆیدا بێنێ و بە رواڵەتێکی ناشورایی یوون لەقەڵەم بدرێت.

بۆیە راست ئەوەیە ئێمە مشتومرەکان لەم رووەوە لە پەیوەندی بە دیموکراسی یەوە لەناو بازنەی داخراوی (تأصیل) بەو جۆرەی فکری ئیسلامی هاوچەرخ کاری پێ کردووە، بێنینە دەرەوە و لە سۆنگەی بوونو نەبوونی بەرژەوەندیو پێویستییەکانی چەسپاندنی دادپەروەریو خۆگونجاندن لەگەڵ دنیای نوی و گەیشتن بە ساتەوەختی رۆشدی سیاسی بە پێوەرە هاوچەرخەکان، بینای دیدگاو گوتاری فکریو سیاسی خۆمان بکەینەوە.

**خاڵ: ئایە دەکرێت وێنای چەند قۆناغێک بۆ شورا بکەین؟ بۆ نموونە کاک ئەحمەدی موفتی زادە شورا بەرێیەریی کۆمەڵگەی ئیسلامی یەوە پەیوەست دەکاتو بۆ سێ قۆناغ: هەوڵی تاکە کەسی، راوێژ بە هاوولاتی پەروەردەکراو، شورای دوای کۆچی دوایی پێغەمبەر - رابەر - دابەش دەکات؟ ئایە لەگەڵ ئەم دابەشکارییە هاورای؟ ئەگەر وەڵام بە ئەرێنیە لەبەرچی؟ خۆ ئەگەر بە نەرێنیە لەگەکانت بخەرە روو؟**

ئەبوبەکر عەلی: هەرچی دەربارەی ئەم شتانە بوترێن دەچنە چوارچێوەی (اجتهاد) و (خوێندنەوە) وەن، بە حوکمی ئەوەی (شورا) لە قورئاندا چەمکێکی پێناسە نەکراوە، تەنانەت جۆری مامەڵەی چەمکەکە لەلایەن خودی پێغەمبەریشەوە(د.خ)

لەسەر بێت، بە حوکمی پێغەمبەر بوون و مەعصوم بوونی پەیوەندی راستەوخۆی ئاسمان بە زەوی و دابەزینی وەحی‌و سەرپەرشتی راستەوخۆی خوای گەورە بۆ بڕیارو رەفتارو جوڵانەوەکانی نابێتە فەرمانێکی (ملزم)ی ئایینی پابەندکەر. بەڵکو وەک پێشینەیەکی ئیلهام بەخش‌و لە ئاستێکدا رێنوێنیکەر دەمێنێتەوە. چونکە حوکمی پێغەمبەر(د.خ) یەکسان نییە بەحوکمی فەرمانڕەوایەکی ئاسایی. یەکی لە سەرچاوەکانی قەیرانی فیکری ئیسلامیش لەم روەوە (قیاس)ی فەرمانڕەوای رۆژ بووە بە پێغەمبەر(د.خ)! هەڵبەت نەک لەڕووی ئەخلاقی‌و ئاستی پابەندی ئایینی‌و عەدالەتخوازی یەوە. سەرمەشقبوونی پێغەمبەر(د.خ) بۆ دوای خۆی بەتایبەتیش لە بواری سیاسی‌و بە گشتی کایە گۆڕاوەکاندا، بە پلەی یەکەم ئیلهام بەخشینە. نەک خۆدزینەوە لە لێپرسراوێتی بەناوی پابەندی بەهەندێ رێکاری کرداری پیادەکردنی هەندێ چەمک لەسیاقێکی مێژوویی دیاریکراودا بەناوی سوننەتەوە.

گەر بشگەڕێینەوە بۆ سەر دابەشکردنەکەی کاک ئەحمدی مفتی زادە(غەرقی رەحمەتی خوا بێت) دەبێت بڵێین: بەرەنجامگری و بەرداشتێکە لە ئەزموونی پێغەمبەرو هاوەڵان‌و سەردەمی (راشیدین) و سەرەتای ئیسلام. وە گشتگیر کردنیەتی بۆ سەرجەم کات‌و شوێنەکان؟. بەبڕوای من ئەم گشتگیر کردنە کێشە دەخوڵقێنێ. چونکە کات‌و شوێن‌و واقیع‌و قۆناغە شارستانێتییە جیاوازەکان، خوێندنەوە و فۆرمی پیادەکردنی جیاواز لەگەڵ خۆیاندا دەهێنن‌و مانای نوێ بە چەمکەکان دەبەخشن‌و دەیانخەنە چوارچێوەی میتۆدی (تأصیل) کردنی نوێوە. کێشەیەکی تری خوێندنەوەکەی کاک ئەحمەد کە هەر پەیوەستە بە کێشەی یەکەمەوە، سەرێرکردنیەتی بۆ چەمکی (شورا) لەچوارچێوەی کۆمەڵی موسڵمان‌و ئوممەتی ئیسلامی‌و بوونی رابەرێتییەکی ئیسلامی کە بەرجەستەی بەکیەتی ئوممەت دەکات، نەک چوارچێوەی دەوڵەتی نوێ‌و کۆمەڵگە هاوچەرخەکان. هەڵبەت کاک ئەحمەد راستگۆ بوە لەگەڵ خۆی و چەمکو دەقەکەشدا، بە واتای ئەوەی ئەو خوێندنەوە چوارچێوەی ئوممەتی ئیسلامی و کۆمەڵی موسڵمان و تێپەڕاندنی سنوورەکانی دەوڵەتی نوێ دەخوازێت. بەڵام کێشەکە لەوەدایە کە لە ئێستادا کارێکی لەو جۆرە ئاسان نییە، پێ‌لەسەر داگرتنی (شورا) ش دەکات بە ئارمانێکی ئایدیاڵی‌و خەونێکی رەنگاڵەی بەدینەهاتوو لە ئایندەیەکی نادیاردا. بە جۆرێک تارادەیەک کۆمەڵگەی شورایی رۆڵی (مەهدی چاوەڕوانکراو) دەگێڕێت. واتە لەمێژوودا هەیەو لە داهاتووشدا ئەگەرە، بەڵام لە ئێستادا واقیعی پیادەکردنی بوونی نییە. کاک ئەحمەد لەو ڕووەشەوە کە شورای بە (رایزەنی) یاخود مەشوەرەت پێناسە کردووە، لەگەڵ هێڵی گشتی مێژوو زانایانی ئیسلام تەبا بووە. چونکە تا سەردەمە نوێکان‌و ئەو تەحەدایانەی دیموکراسی خۆرئاوا بۆ موسڵمانان دروستکردووە، بە نیمچە رەهایی (شورا) لای زانا و (فقیە)ەکان لەگەڵ (مەشوەرە)تدا یەکسان کراوە. ( فقە الشوری والمشورة، توفیق الشاوی) ئەو پاشخانەش یەکێکە لە هۆکارەکانی ئیشکالیەتی بەراورد کردنی بە دیموکراسی.

بە کورتی رەنگە کێشەش لەوەدا نەبێت یەکێکی وەکو کاک ئەحمەد ئەو دابەشکردنانە بکات، چونکە شورا چەمکێکی ئەخلاقی یە و لە سەرەتاشدا کۆمەڵێکی موسڵمانی لە دۆخی نادەوڵەت‌و نەبوونی دەسەڵاتی سیاسی پێ دوێنراوە، بە حوکمی مەککی بوونی سورەتی شورا، ئەخلاقی بوونی چەمکەکەش وا لێدەکات کە بتوانین لە ئاستی برادەرایەتی و خێزان و گروپە کۆمەڵگاییەکانەوە باس لە شورا بکەین تاکو کایەی سیاسەت‌و دەسەڵات، کە هەر ئەمەش جۆرەها لێڵی‌و ناڕوونی بۆ چەمکەکە

دروست کردووە. ئەوەی لەم رووەوە کێشە دروست دەکات، خودی ئەم دابەشکردنانە نین، بەڵکو وەک وتمان بە پیرۆزکردنی دابەشکردنەکەو وێناکردنیەتی وەک رووی دووەمی (دەق) و گشتگیرکردنیەتی بۆ کات و شوێنە جیاوازەکان. ئەگەر لە سەردەمی نوێشدا باس لە دابەشکردنێک بکەین دەکرێت باس لە بوونی (شورای) گوند تا پەرلەمانو حکومەت بکرێت. چونکە بیرمان نەچێت هەندێ لە پێوەرەکانی دیموکراسی پەیوەندی بە حکومەتیشەوە هەیە و تەنها لە چوارچێوەی پەرلەماندا قەتیس نابێت. لەوانەش کارکردن بەڕای زۆرینە لە دروستکردنی بڕیارو پارێزگاری لە دەقی دەستوور.

**خاڵ: دوا وتەت؟**

ئەبوبەکر عەلی: پێم وایە قسەکردن لە دیموکراسیو کردنی بە بەشێ لە ناسنامەی سیاسی بزاڤی ئیسلامیو کۆمەڵگە موسڵمان نشینەکان، لە ئەبێو نابێی فکریو سیاسی دەرچووە و بۆتە ئەرکێکی ئەخلاقیو تەنانەت لە ئاستی بەهاکاندا دینیش. چونکە دیموکراسی لە پەیوەندی بە کاراکردنی بەهای دادپەروەری لە ژیانی هاوچەرخی موسڵماناندا تاووتوێ دەکرێتو بۆچوونی لەبارەوە دیاری دەکرێت. بە واتای ئەوەی ئەگەر دادپەروەری مەبەستێکی باڵاو بەهاو خوازراوێکی ئیسلامی بێت وەک ئایین، بەڵکو بەسترابێتەوە بە تەوەرەی پەیامی پێغەمبەران (علیهم السلام) لە سەراپای مێژووی مرۆڤایەتیدا: **[لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِالْبَيِّنَاتِ وَأَنزَلْنَا مَعَهُمُ الْكِتَابَ وَالْمِيزَانَ لِيَقُومَ النَّاسُ بِالْقِسْطِ]** الحدید/٢٥، داوایەکی راستەوخۆو بێپەردە و هەتا هەتایی خودا بێت لە باوەڕداران: **[إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُ بِالْعَدْلِ وَالْإِحْسَانِ]** النحل/٩٠، **[كُونُوا قَوَّامِينَ بِالْقِسْطِ]** النساء/٣٥. لەم سەردەمەدا بەحوکمی کۆمەڵێ هۆکارو لە روانگەی واقیعی کۆمەڵگە جۆراوجۆرەکانی مرۆڤایەتی، دادپەروەری بێ دیموکراسی نیمچە مەحاڵ بێت، ئەوا بەگوێرەی رێسای ئوسوڵی: (ما لا یتم الواجب إلا به فهو واجب ) دیموکراسی دەبێتە ئەرکێکی ئیسلامی هاوچەرخ، بۆیە پێم وایە دیموکراسی بژاردەیەک نییە لەبەردەمماندا، بەڵکو ئەگەر بڕوامان بە بەرجەستە کردنی دادپەروەری لەدنیای هاوچەرخو کۆمەڵگەکانماندا هەبێت، تا جێگرەوەیەکی لەو باشتر دێتە کایەوە، تاکە بژاردەی ئەخلاقیو عەقڵانییە. بە حوکمی ئەوەی ئێمە لەبەردەم بەراوردکردن لە نێوان ئەمرێکی ئیلاهیو ئەمرێکی عورفی و دنیایدا نین، بەڵکو بە حوکمی ئەوەی رەتکردنەوەی دیموکراسی لە ئێستادا تێکەڵە لەگەڵ گەندەڵیو سەرکوت، ئەوا لەنێوان دوو ئەمری دنیاییو دوو فۆرمو شێواز لە دەسەڵاتو بەڕێوەبردندا، خراپەکەیان هەڵدەبژێرین. ئێمە بە ناچاریو بە حوکمی ئەو جەبرەی ژیانکردنی نوێو سیستمی نێودەوڵەتی بەسەرماندا سەپاندویەتی، ناتوانین باس لە هیچ کۆمەڵگەیەکو لەوانەش کۆمەڵگەیەکی موسڵمانو ئەزموونێکی ئیسلامی لە دەرەوەی دەوڵەتی باوەوە بکەین. کەتەلۆکی عەقڵانی بەڕێوەبردنی ئەم دەوڵەتەو رزگارکردنی مرۆڤ و کۆمەڵگەش لە هەڕەشەکانیو مەسخ بوون، هەروەک تیۆرسینی فەرەنسی ئالان تۆرین بۆی چووە، دیموکراسی یە. دەوڵەتی نوێ ئەگەر لەڕێی میکانیزمەکانی دیموکراسیو دەستەبەرەکانیەوە کۆتو بەند نەکرێتو ملکەچی خواستی کۆمەڵگە نەکرێت، لە ئامرازەوە دەبێتە ئامانجو هەوڵ دەدات جێگەی خودا بگرێتەوەو داوای پەرستن دەکات. بە حوکمی ئەوەی پاساوی خۆی بەخۆی دەدات. نەک بە شتێ لە دەرەوەی خۆیەوە. هەڵەی هەرە گەورەی بیرو بزاڤی ئیسلامی نوێش لە پەیوەندی بە پرسی دەوڵەتەوە، لەوەدا بووە، کە قاڵبو ئامرازە کۆنترۆڵکەرەکانو دەزگاکانی نوێ وەردەگرێتو زەمانەتی خراپ کارنەکردنی کە دیموکراسییە رەتکردۆتەوە!. لەو وەهمەدا ژیاون کە

ئەگەر گروپێکی ئایدۆلۆژیستی پەروەردەکراوی ئیسلامی هەڵبکوتنە سەر دەوڵەتو کۆنترۆڵی بکات، دەتوانێت دەستکاری ماهیەتی بکات؟!. بە مانایەکی تر دەوڵەتیان وەک ئامێرێکی بێلایەن بینیوە، هەر بۆیە فکری سیاسی ئیسلامیو رەوتی ئیسلامی نوێ لە (خوالێخۆشبوو حەسەن بەننا) وە تاکو ئێستا لەڕووی فکری یەوە زۆر کەم توانیویەتی هیچ ئیزافەیەک بخاتە سەر کەلەپوری رەخنەگرتنی ئەخلاقیانە لە دەسەلات. مەسەلەی جەوهەری لەم بوارەدا خۆ یەکلاکردنەوەی فکریو کردارییە لەمەڕ ئەو مۆدێلە لەحوکمڕانیو دەوڵەت، کە رەوتی ئیسلامیو کۆمەڵگە موسڵمانەکان دەیخوازن. ناکرێت ئێمە لە (١٥٠)ساڵی رابردووەوە تاکو ئێستا لەسەر سیستمی دڵخوازی سیاسیو ئایدیاڵ یەکلایی نەبوبنەوەو کۆمەڵگەکانمان بە نیمچە هەمیشەیی بکەینە کێڵگەی تاقیکردنەوەی مۆدێلە جۆراوجۆرە تاقینەکراوەکان، یاخود بە یەکەوە لکێنراوەکانی سیستمی سیاسی. کۆمەڵگە موسڵمانەکان باجێکی گەورەی ئەو دیدگا لێلی و تەمو مژو نابەرچاوڕوونی یەیان داوە. ئەوەی لە ئێستاشدا دەگوزەرێ. بەڵگەیە لەسەر بۆچوونەکەی سەرەوەمان. بەداخەوە کە دەوڵەت زۆر کەم نەبێت لە زۆربەی جیهانی ئیسلامی دا دانەمەزرا، هەر بۆیە لە ئێستادا چەندین دەوڵەت لە دۆخی شکستو رووخانی خۆیاندان، کاتی ئەوە هاتووە بە بوێری یەوە بوترێت کە ئێمە دەوڵەتی مەدەنی و دیموکراسی نوێمان دەوێت، دەوڵەتێ رێز لە ناسنامەی ئیسلامی زۆرینەی کۆمەڵگە بگرێتو بڕوای بە جیاوازی هەبێتو ببێتە پارێزەری مافو ئازادی یەکانی تاکو پێکهاتەکانی کۆمەڵگە. دەوڵەتی هەق و دادپەروەری و مافو یاساو هاوڵاتی، دەوڵەتی خزمەتگوزاری، دەوڵەتێ جێگەی ناسنامە جۆراوجۆرەکانی تیابێتەوە و پاسەوانی کەرامەتو کەسێتی هەمووانیش بێت. چی دی پێویست ناکات خۆمان بە چەمکێکی وەکو شوراوە ببەستینەوە، کە ئاماژە نییە بۆ سیستمێکی سیاسی دیاریکراو و مەنزومەیەک لە میکانیزمو دامو دەزگاو دەستەبەری و ملکەچی خوێندنەوەی جیاوازو قابیلی خراپ بەهرە لێ بردنە، لەوانەش بەکارهێنانی بۆ رەتکردنەوەی دیموکراسیو فرەییو دەوڵەتی مەدەنیو دەستور سالاری یەکی سازان لەسەرکراو.

# دیموکراسیەتی موحافیزکارانە و ماف و ئازادیەکان لەتورکیا





**د.سەلام عەبدولکەریم**

لەدایکبووی١٩٧٩، ماستەر(٢٠٠٩) و دکتۆرا(٢٠١٤) لە مێژووی نوێ و هاوچەرخ. خاوەنی (١٩) بەرهەمی چاپکراو و ژمارەیەکی زۆر وتار و لێکۆڵینەوەی زانستی بڵاوکراوەیە.

## دەسپێك

زۆرجار رەنگە پرسیاری ئەوە لەمێشکماندا دروست ببێت ئایا تورکیا دەوڵەتێکی دیموکراسیە یان نا؟

ئەگەر دیموکراسی نیە ئەی چۆن پرۆسەی هەڵبژاردن وەک کۆڵەکەو بنەمایەکی سەرەکی سیستەمی سیاسیو دیموکراسی هەر چوار ساڵێک تێیدا بەڕێوە دەچێتو ئاڵوگۆڕی دەسەڵات لەرێگەی ئامرازو کەرەستە دیموکراسیەکانەوە روودەداتو گەل وەک دیارترین رەگەزی سیستەمی دیموکراسی بەشداری سیاسی دەکاتو سیستەمی فەرمانڕەوا لەو وڵاتەدا دیاریدەکات؟!

ئەگەر دەوڵەتێکی دیموکراسیشە ئەی بۆچی مافی گروپە ئیتنیو کۆمەڵایەتیو سیاسییەکان بەئاشکرا پێشێل دەکرێو بەدەیان کەسایەتی سیاسی تا ئاستی پەرلەمانتار دەخرێنە کونجی زیندانەوەو باری نائاسایی رادەگەیەنرێو ئازادیە تاکەکەسیو دەستەجەمعیەکان پێشێل دەکرێن، تەنانەت هەڵبژاردن وەک دیارترین پرۆسەی دیموکراسی لەژێر سایەی باری نائاساییدا بەڕێوەدەچێت؟

## دەشێ بپرسین پەیوەندی نێوان چەمکی دیموکراسیەتو ئاسایش بەگشتی چییە؟

هەروەک چ پەیوەندیەک لەنێوان دیموکراسیەتو ئاسایش لەتورکیادا هەیە؟ ئاخۆ چەمکە گۆڕاوەکانی ئاسایش پەیوەندی بەگۆڕان لەدیموکراسی لەتورکیا هەیە یان نا؟

پرۆسەکانی پاکتاوی ئیتنیو سیاسیو کۆمەڵایەتیو جڤاتی لەژێر سایەی دیموکراسیەتی تورکیادا دەکەونە چوارچێوەی کام خانەوە؟

تێڕوانینی پارتی دادو گەشەپێدان بۆ مەسەلەی ئاینو سێکیۆلاریزمو دەوڵەت چیەو چۆن دەڕوانێتە ئەو گروپانەی خاوەن شەقڵی ئاینینو باکگراوەندیان فەرهەنگی ئاینیە؟

## ئایا تورکیا لەنێو جیهانی وڵاتانی ئیسلامیدایە؟

دەمێکە لای شارەزایانی بواری تورکیا ئەوە روونبۆتەوە، کە تورکیا وەک جوگرافیا لەنێو چوارچێوەی وڵاتانی جیهانی ئیسلامیدایە، بەڵام وەک سیستەمی سیاسی تا ئەم ساتەوەختەش، کە لەساڵی ٢٠٠٢ ەوە کەپارتێکی باکگراوەند ئیسلامی فەرمانڕەوایی دەکات، لەدەرەوەی جیهانی ئیسلامیە، واتە وەک ناوو جوگرافیا سەر بەو جیهانەیە، بەڵام وەک سیستەمی سیاسی، کە سێکیۆلاریزمە لەدەرەوەیە، چونکە تورکیا تاکە وڵاتی نێو جیهانی ئیسلامیە بەروونو ئاشکرا پەیڕەوی لەسیستەمی سێکیۆلاریزم دەکات، هەروەک لەبەرنامەی سیاسی پارتی دادو گەشەپێداندا هاتووە:

«حزبمان سێکیۆلاریزم بەبناغەی ئازادیو ئاشتی کۆمەڵایەتی هەژمار دەکات، بەشێوەیەک ئازادی مومارەسەکردنی رێو رەسمە ئاینیەکانی تایبەت بەخۆیان بۆ شوێنکەوتووانی ئاینەکان دەستەبەر دەکات لەگەڵ ئازادی گوزراشتکردن لەقەناعەتی ئاینیانو دواتر ژیانی تایبەتیان لەو چوارچێوەیەدا بۆ رێکدەخات. هەروەک ژیان بۆ ئەوانەش رێکدەخات، کە بیروباوەڕێکی دیاریکراویان نیە».

سەربارى ئەوەی پارتی دادو گەشەپێدان پابەندە بەبنەماکانی کەمالیزمەوە، کە سێکیۆلاریزم یەکێک لەشەش پایە سەرەکیەکەی فەلسەفەی کەمالیزمە، بەڵام بەکاوەخۆ پارتی دادو گەشەپێدان هەوڵی ئەوە دەدات لەرێگەی ئازادیو مافە تاکەکەسیو دەستەجەمعیەکانەوەو لەروانگەی ئەوەی ئاین وەک دامەزراوەیەکی مرۆیی دەبینێت، گۆڕانکاری لەهەندێ بواری کۆمەڵایەتیو یاساییشدا بکاتو بەپێدراوە ئیسلامیەکان رەنگڕێژی بکات، لەگەڵێشدا پابەندی خۆی بەسیستەمی سێکیۆلاریزمەوە بپارێزێت،

واته ئەم مامەڵەکردنە جیاوازترە لەو مامەڵانەی، کەپێشتر نەجمەدین ئەربەکان لەسەروبەندی سەرکەوتنی لەهەڵبژاردنەکانو بەرنامەی سیاسیدا کاری بۆ دەکردو روونو رەوان کاری بۆ گێرانەوەی شوناسی ئاینیو ئیسلامی کۆمەڵگەی تورکی دەکرد، واتە پارتی دادو گەشەپێدان لەرێگەی ئازادیو مافە تاکەکەسیو دەستەجەمعیەکانەوە هەوڵ بۆگێرانەوەی ئەو شوناسە دەداتو روانینێکی گۆڕاوو جیاوازتری هەیەو بڕواشی پێیەتی.

## دیموکراسیەت و ئاین و سێکیوڵاریزم لەدیدی پارتی دادو گەشەپێداندا

بێگومان کاتێک باس لەوە دەکرێ ئایا دیموکراسی لەجیهانی ئیسلامیدا دەردە یا دەرمان، پێمانوایە ئەمە پرسیارێکی ئەخلاقیە زیاتر لەوەی بابەتی بێ، بەو مانایەی دەرد بێ چ بایەخێکی هەیە، یان دەرمان بێ؟ چونکە دیموکراسی دەمێکە لەو دیدگا ئەخلاقیە دەرچووە, تەنانەت ئەو هێزە ئاینیانەش، کە هەڵگری فەلسەفەیەکی جیهادیو شۆڕشگێڕی ئیسلامی بوون، مامەڵەی لەگەڵدا دەکەنو قبوڵیان کردووە، لەئێستادا لەکوردستانو عێراقو جیهانیش بەشداری پرۆسەی هەڵبژاردنو دەستاودەستکردنی دەسەڵاتو بەشداری سیاسی دەکەن لەرێگەی سندوقەکانی دەنگدانەوە تادەگاتە سەلەفیەکانی میسر، ئیتر ناچاریو تاکتیکی قۆناغیی بێت یان بیروبڕواو قەناعەت. هەروەک دەردو دەرمانبوونی دیموکراسیەت کەوتۆتە سەر ناسنامەو بەرنامەو پرۆژەی سیاسی ئەو هێزە سیاسیو کۆمەڵایەتیانەی لەفەرمانڕەواییدان، جیا لەوەی قسەکردنی لەسەر دەرمانبوونو دەردبوونی دیموکراسی دەشێ هەر وڵاتە لەجیهانی ئیسلامیدا بەجیا وەربگیرێتو خوێندنەوەی بۆ بکرێتو ناکرێ بەتوێزی بخوێنرێتەوە.

گرفتی گەورە بەر لەوەی حوکمی ئەخلاقی بەسەر دەردو دەرمانبوونی دیموکراسی لەوڵاتانی ئیسلامیدا بدرێ، جارێ پەیوەندی بەوەوە هەیە وڵاتانی جیهانی ئیسلامی بەکۆمەڵگەو پارتە سیاسیو گرووپە کۆمەڵایەتیەکانیانەوە چۆن لەدیموکراسی دەڕوانن، ئایا پێیانوایە دیموکراسیی کوفرەو یان ئامرازێکی سیاسیە، هەروەک ئاخۆ بڕوابوون بەدیموکراسی تەنها لەرەهەندە سیاسیەکەیدایە، یان بڕوابوونیشە بەرەهەندە کۆمەڵایەتیو ئابوورییەکەی، کە لەروانینی کۆمەڵایەتیو ئابووری ئیسلامی جیاوازە؟!

ئەگەر تەماشای تورکیا بکەین، بەدیاریکراوی پارتی دادو گەشەپێدان، کە لەئێستا لە فەرمانڕەواییدان و سیستەمی سیاسی وڵاتەکەشیان لە پەرلەمانیەوە بۆ سەرۆکایەتی گۆڕی، پاش هەمواری دەستوورو دواجار لەهەڵبژاردنەکانی ٢٤ی حوزەیرانی ئەمساڵ، تێبینی دەکەین ئەوان روانینی جێگیرو بنەڕەتییان بۆ دیموکراسی هەیە، کەدیموکراسیەتێکی موحافیزکارانەیە، چونکە وەک خۆشیان پێناسەی پارتەکەی خۆیان کردووەو وەک پارتێکی دیموکراسی موحافیزکاریان ناساندووە، بەجۆرێ وەک لەدونیابینی سیاسیاندا هاتووە، بەمجۆرە پێناسەی خۆیان دەکەن:

«پارتی دادو گەشەپێدان بریتیە لەپارتێکی موحافیزکار- دیموکراسی تێروتەواو، کەخۆی خستۆتە نێو دڵی سیاسەتەوە».

هەروەها ئاماژە بۆ ئەوەش دەکەن، کە شوناسی سیاسی دیموکراسیەتی موحافیزکارانە، کەپارتی ناوبراو کاری بۆ کردووە، گۆڕاوە بۆ دامەزراوەیەک، کە لەمرۆدا بۆتە سەنتەری سەرنجراکێشانی گەورە. هەروەک شوناسی سیاسی ئەم دیموکراسیەتە موحافیزکارانەیە لەکۆمەڵێک تایبەتمەندی پێکداچووی مومارەساتی موحافیزکارانە لەنێو گشتی جیهاندا، هەروەک شێوازێکی سیاسیش لەخۆدەگرێت، کە بەیارمەتی

دینامیکیەتی نێوخۆیی پێکدێت. سازشێکی گەورەش هەیە لەلایەن تێگەیشتنی دیموکراسیەتی موحافیزکارانەوە لەکۆمەڵگەیەکدا، کە ژمارەیەکی گەورە لەمسوڵمانانی تێدا دەژی. تەوژمی موحافیزکارانە بەرگری لەدەسەڵاتێکی دیاریکراو دەکات، دژی هەموو جۆرەکانی تۆتالیتاریزمو جێبەدەهێڵێت بۆ دینامیکیەتی کۆمەڵایەتی لەنێو ماوەیەکی سروشتی گۆڕانکاریدا.

لەسادەترین تێڕوانینیدا بۆ دیموکراسی لای پارتی دادو گەشەپێدان ئەوەیە، کەدیموکراسی سیستەمێکە لەسەر یەکسانی نێوان هاوڵاتیان دادەمەزرێت، رێگە نادرێت هەندێ لەهاوڵاتیان مافو ئیمتیازاتو ئازادی بەرزتریان لەخەڵکانیتر زیاتر هەبێت، بەڵکو دەبێ هەمووان سەربەستانە بژین لەژێر سایەی یاساو لەئەرکو مافەکاندا یەکسان بن.

ئەگەرچی لەرابردوودا چەمکی موحافیزکاریی بەواتای پابەندبوونو پارێزگاری لەکولتورو ترادیسیۆنو بەرەنگاری گۆڕانکاری بوو، بەڵام لەدیدی پارتی دادو گەشەپێداندا بەمانای خودی گۆڕنکاریی دێت، بەڵام پێویستە ئەم گۆڕانکاریە لەرێگەی پاراستنی بەها بنەڕەتیەکانو دەسکەوتەکانی ژێرخانە کلاسیکیەوە بێت. لێرەدا پارتی دادو گەشەپێدان کاری لەسەر دروستکردنی ناسنامەیەکی سیاسیو کۆمەڵایەتی بەناوی دیموکراسیەتی موحافیزکارانە کرد، کە بناغەکەی بەهای هاوبەشی چینو توێژە کۆمەڵایەتیەکانی کۆمەڵگەی تورکی بێتو کۆکەرەوەی تەوژمە سیاسیو ئایدۆلۆجیە جیاوازەکان بێت لەتەوژمی ئاینیو ئیسلامیەوە تا دەگاتە لیبراڵیو نەتەوەییو موحافیزکارەکانو تانەنەت هەندێ سیکیۆلاری کلاسیکیش.

تێدەگەین کە روانینی پارتی دادو گەشەپێدان بۆ چەمکی دیموکراسی تەنها رەهەندە سیاسیەکەی نیە، بەڵکو کۆمەڵایەتیو ئابوریەکەشیەتی، بەجۆرێ جەخت لەئابوری ئازادو گەشەی موڵکداری تایبەتیش دەکاتەوە، کەهەمووی لەچوارچێوەی دیموکراسییەتێکی موحافیزکارانەدایە.

بەڵام پرسیاری سەرەکیو جەوهەری لێرەدا ئەوەیە: ئاخۆ پارتی دادو گەشەپێدان توانیویەتی ئەوەی لەبەرنامەی سیاسیو دونیابینی سیاسیدا لەمەڕ دیموکراسیو دیموکراسیەتی موحافیزکارانە سەبارەت بەمافی سیاسیو کۆمەڵایەتی گروپە کۆمەڵایەتیەکان باسیکردووە، لەواقیعی کرداریدا پیادەی بکات بەگشتیو بەدیاریکراوی مافی نەتەوەیی کورد، کە بەملیۆنان خەڵک لەو تورکیادا دەژیو لەرووی کولتورو زمانو دابو نەریتەوە جیاوازن؟ ئایا زاراوەی گەلی تورک، زمانی تورکی، هەموو تورکێک لەدەستووری کۆنو نوێی هەموارکراوی تورکیادا لەگەڵ دیموکراسیدا چۆن لێکدەدرێتەوە؟

سەبارەت بەدیدی پارتی دادو گەشەپێدان بۆ ئایینو سیکیۆلاریزم، پێشوەخت دەبێ ئەوە بزانین کام ئایینو چ جۆرە ئایینو تەوزیف کردنێک؟ بێگومان ئەو جۆرە ئایینو تەوزیفکردنە ئایینیە نا، کە لەیادەوەری مرۆڤی باوەڕداری ئێمەدا هەیە، هەم بۆ خۆی، هەم وەک ئەوەش، کە لەمۆدێلی فەرمانڕەوایی پارتی دادو گەشەپێدان دەڕوانێت، کەزیاتر ئاینێکی دەسەڵاتو فەرمانڕەواییە، بەڵکو ئەو مۆدێلەی ئایین لای پارتی دادو گەشەپێدان، وەک ژنە توێژەری سیاسیی(بار بارا ئان-ریڤەر) شرۆڤەی دەکات بریتییە لەناسیۆنالیزمی ئامرازی باوەڕمەند، واتە ئەو ئایینەی پارتی دادو گەشەپێدان لەنێو بۆتەی نەتەوەپەرستیدا پیادەی دەکات، وەک ئامرازێکی باوەڕمەندییە، نەک وەک ئایینێک لەدەسەڵاتدا حوکمی پێبکات، ئەمەش واتە پەیڕەوکردنی سیاسەتی پراگماتیکی بەرامبەر بەئایینو سوود لێوەرگرتنی لەبزواندنی سۆزی ئایینی مرۆڤی باوەڕداردا.

لەمبارەوە ئەگەر بڕوانینە بەرنامەی سیاسیی



# رەجەب تەیب ئوردوگان دەبێژێت: دەوڵەتی سێکیۆلار دژی ئاین نییە، بەڵکو گرەنتی ئازادیی ئاینییە، تەنانەت پێویستە ڕێز لە بێباوەڕان بگرێت و بشیانپارێزێت.

پارتی دادو گەشەپێدان ئەوە هاتووە، کە:» حزبمان وا تەماشای ئایین دەکات، کەیەکێک لەگرنکترین دامەزراوەکانی مرۆڤایەتییە...». یان لەدیباجەی ڕەشنووسی دەستوورەکەدا هاتووە:» «ڕێگە نادرێت هیچ هەستو سۆزێکی ئاینی پیرۆز هیچ جۆرە دەستێوەردانێک لەکاروباری دەوڵەتو سیاسەتدا بکات».

ئەگەر تێبینی بکەین لەبەرنامەی سیاسیدا، پارتی دادو گەشەپێدان ئایین وەک دامەزراوەیەکی مرۆڤایەتی تەماشا دەکات، نەک وەک ئاینێک بۆ فەرمانڕەوایی. لەڕەشنووسی دەستوورەکەشدا جگە لەوەی جەختکردنەوەیە لەپرنسیپو ناوەڕۆکی سێکیۆلاریزم، هاوکات ڕێگەنەدانە بەدەستێوەردانی ئایین لەکاروباری سیاسییو جیاکردنەوەی ئایینە لەدەوڵەت. لەمبارەوە رەجەب تەیب ئوردوگان دەبێژێت: «دەوڵەتی سێکیۆلار دژی ئاین نییە، بەڵکو گرەنتی ئازادیی ئاینییە، تەنانەت پێویستە ڕێز لەبێباوەڕان بگرێتو بشیانپارێزێت». تێدەگەین سەرباری ئەوەی پارتی دادو گەشەپێدان پارتێکی باکگراون ئاینیو ئیسلامیە، بەڵام مەحاڵە دەستبەرداری سێکیۆلاریزم ببێت، چونکە نەسیجی کۆمەڵایەتیو فیکری پارتی دادو گەشەپێدان تەنها لەسیاسەتو دەسەڵاتەوە سەرچاوەی نەگرتووە، ئەوەندەی دەرکەوتنی پارتی دادو گەشەپێدان لەسەر شانۆی سیاسییو کۆمەڵایەتیی تورکیا ڕیشەیەکی کۆمەڵایەتیی هەیە، کەدەرهاویشتەی گۆڕانکاریی چینایەتیو هاتنەپێشەوەی چینی مامناوەندی کۆمەڵگە و وردە بۆرژواو بازرگانو ئەو گۆڕانکارییە شارنشینییە بوو، کە لەساڵانی هەشتاکانەوە دەستپێکرد.

بەڵام هەر لەدەسپێکەوە پارتی دادو گەشەپێدان لەپەیڕەوو پرۆگرامو جیهانبینیدا بۆ ئازادییە تاکەکەسییو دەستەجەمعییەکانو خێزانو بازارو ئاینو...تاد، جەختی لەتێکەڵکێشکردنی بەدابو نەریتە تورکییە ڕەسەنەکان کردەوە. بۆیە لەمەسەلەی سێکیۆلاریزمو ئاینیشدا ڕێگەیان نەدا دەستکاری سیستەمی سێکیۆلاری دەوڵەت بکرێت، بەپێچەوانەوە بوونە پارێزەریی، لەولاشەوە ئاینیان دوورگرت لەکایەی سیاسییو زیاتر کار لەسەر بەها ئیسلامییو ئاینیەکان دەکەن.

بەدیاریکراویش پارتی دادو گەشەپێدان لەهاتنە سەر تەختی دەسەڵاتەوە ڕاستە پارێزگاری لەسیستەمی سێکیۆلار کردووە، بەڵام هەرگیز وەک مۆدێلی سێکیۆلاریزمی کەمالیی لێی نەڕوانیوە، کەزیاتر لەسێکیۆلاریزمی فەرەنسییەوە نزیکبووە، بۆیە بەپێی زۆر لێکدانەوە پێشبینی دەکرێت ئەو مۆدێلی سێکیۆلاریزمەی پارتی دادو گەشەپێدان بیری لێدەکاتەوە کاری بۆ بکات دەچێتەوە سەر سێکیۆلاریزمی مۆدێلی سویسری یان بەریتانی یان ئەمەریکی، کەزیاتر وەک ڕێکخەری پەیوەندی نێوان ئاینو دەسەڵاتو ڕێکخستنی کاروباری هاوڵاتیان کار بکاتو ڕێز لەبیروبۆچوونی ئاینیان بگرێت.

بەڵام پرسیاری لێرەدا ئەوەیە، پارتی دادو



## مەحاڵە لەچوارچێوەی ئەو دیموكراسیەتە موحافیزكارانەدا مافی نەتەوەیی بەكورد ببەخشرێ، چونكە لەنێو چەمكی دیموكراسیەتی موحافیزكارانەدا بەرزراگرتنی نەتەوەی تورك بوونی هەیەو ئەوەش گرێدراوی ئاسایشی نەتەوایەتیەكەیەتی.

گەشەپێدان كە ئێستا كەوتۆتە گیانی گولەنییەكانو ئیسلامی كۆمەڵایەتیی، هیچ گرەنتییەک هەیە نەكەوێتە گیانی سێكیۆلاریستە كەمالییەكان؟! بەتایبەت پاش هەڵبژاردنەكانی ٢٤ ی حوزەیرانو جێگیربوونی سیستەمی سەرۆكایەتی.

هەروەک پرسیاری سەرەكی ئەویە، پارتی دادو گەشەپێدان دوو بنەمای سەرەكی سێكیۆلاریزم قبوڵ دەكاتو وەک خۆی لەتوركیا دەیانهێڵێتەوە وەک هەستیارترین بابەتی نێوان ئاینو دەسەڵات؟ كەئەوانیش بریتین لە: یەكەمیان، هیچ دامەزراوەیەكی ئاینی شوێنی دامەزراوەكانی جێبەجێكردنو دادوەرییو یاسادانان لەدەوڵەتدا نەگرێتەوە. دووەمیان، دەوڵەت هیچ ئاینێكی فەرمی نەبێت. واتە لەمەسەلەی یاساداناندا ئایا دەتوانێت وەک ئێستا، كە لەتوركیا هەیە پشت بەئاینی ئیسلام نابەستێت.

### پارتی دادو گەشەپێدانو بیری نەتەوەپەرستی توركو كەمالیزم...

دەتوانین ئاماژە بەوە بكەین، كە بیری پارتی دادو گەشەپێدان خۆی لە سێ شتی سەرەكیدا دەبینێتەوە، ئەوانیش: (ئیسلام، كەمالیزم، سێكیۆلاریزم)ە، ئەڵبەت ئەم سێ چەمكە لەسیاقی هزریو فەلسەفەی دەوڵەتداریدا بەروونی رەنگیداوەتەوە. ئەوان نایشارنەوەو لەبەرنامەی سیاسی خۆیاندا رایانگەیاندووەو دەڵێن:»حزبمان جەخت دەكاتەوە، كەپرنسیپەكانی ئەتاتوركو گۆڕانكارییەكانی، گرنگترین ئامرازن بۆ باڵاكردنی تورک بۆ ئاستێک، كە لە سەروەوەی شارستانییەتی هاوچەرخ بێتو حزبمان وایدەبینێت، كە رەگەزێكی گرنگی ئاشتی كۆمەڵایەتییە». هەروەها لەدیباجەو هەندێ مادەی رەشنووسی ئەو دەستوورەشدا، كە راپرسی لەسەر كرا بەمجۆرە نوێترین بیروڕای سیاسیی خۆیان لەبارەی نەتەوەپەرستیو كەمالیزمەوە دەخەنەڕوو، كە بەدەق هاتووە: «ئەم دیباجەیە (بەو شێوە هەمواركراوەی لەرۆژی ١٧س ئۆكتۆبەری ٢٠٠١)دا هاتووە، هاورێكە لەگەڵ چەمكی نەتەوەپەرستیو ئەو چاكسازییانەی، كەدامەزرێنەری كۆماری توركیا مستەفا كەمال ئەتاتورک، سەرۆكی نەمرو پاڵەوانی بێوێنە دایناوە». هەروەها لەمادەی(٢) ی ئەو رەشنووسی دەستووری هەمواركراوەدا بۆ راپرسی هاتووە: «كۆماری توركیا، بریتییە لەدەوڵەتێكی دیموكراسییو سێكیۆلار (عەلمانی) و كۆمەڵایەتی، كەسەروەری یاسا بەڕێوەی دەبات، چەمكەكانی ئاشتی گشتیو هاریكاریی نیشتیمانیو دادپەروەرییو رێزگرتنی مافی مرۆڤوو دۆستایەتی بۆ نەتەوەپەرستی

ئەتاتورک بەئیعتیبار دادەنێت...».

هەربۆیە لێرەوە تێدەگەین دیموکراسیەتی موحافیزکارانە لە دیدی پارتی دادو گەشەپێداندا بەمانای چی دێت، بۆیە لێرەوە دەتوانین وەڵامی پرسیارەکانی سەرەتامان چنگ بکەوێت، چونکە مەرج نیە جوڵەکانی نێو سیستەمی دیموکراسی لەتورکیا هەمان جوڵەی دیموکراسی وڵاتێکی ئەورووپی وەک سوید یان بەریتانیا بێ، چونکە دواجار دیموکراسیش گرێدراوی بەرژەوەندیو ئاسایشی نەتەوەیی ئەو وڵاتەو سیستەمە فەرمانڕەواییەکەیو بگرە گروپە کۆمەڵایەتیو ئایدۆلۆجیە سەردەستەکەشیەتی، چونکە دیموکراسی پەیوەندیەکی پتەوی بەچەمکی ئاسایش بەگشتیو ئاسایشی نەتەوەییەوە هەیە.

لێرەوە گەر پێناسەی چەمکی ئاسایشی نەتەوەیی بکەین، لەفەرهەنگی سیاسیدا باوترین پێناسە بریتییە لە: «دڵنیایی سەلامەتی دەوڵەت دژی مەترسی دەرەکیو نێوخۆیی، کەببێتە هۆی کەوتنە ژێر دەسەڵاتی هێزی دەرەکی لەئاکامی گوشاری دەرەکی یان دارمانی نێوخۆیی». هەروەک (باری بۆزان) پێی وایە چەمکی ئاسایشی نەتەوەیی چەمکێکی ئاڵۆزەو بۆ تێگەیشتن لێی پێویستە سێ شت روون بکرێتەوە، ئەوانیش چوارچێوە سیاسیەکەیو رەهەندە جۆراوجۆرەکانیو رۆشنایی خستنەسەر ئەو تەمومژانەی، کەپەیوەستن پێیەوە لەکاتی جێبەجێکردنی لەپەیوەندییە نێودەوڵەتییەکاندا. هەروەک لێکۆڵینەوەو فەرهەنگە زمانەوانییەکان چەمکی (ئاسایش) بەگشتی بەچەمکی (دڵنیایی) یان دژی ترس دەبەستنەوەو زیاتریش وەک رزگاربوون لەمەترسی یان جەنگ یان ترس لێکدەدەنەوە. بەم پێیەش هەریەکە لە(بوپو ویلەر) بەو شێوە شرۆڤەی ئاسایش دەکەن، کە:»تاکەکەسو گروپەکان ناتوانن ئاسایشو سەقامگیریی دەستەبەر بکەن، دەبێ ئەوانیتر بێبەش بکەن ئینجا دەتوانن، ئەوەش بەدەست دێت، ئەگەر هاتوو وا سەیری چەمکی ئاسایش کرا، کە بریتییە لەپرۆسەی رزگارکردن».

لەکۆتاییدا تێدەگەین کەتێڕوانینی پارتی دادو گەشەپێدان لەحکومڕانیدا پەیوەستە بە تەوزیفکردن و فراوانکردنی چەمکی دیموکراسیەتی موحافیزکارانە، هەروەک مافو ئازادیە تاکەکەسیو جەستەجەمعیەکان گرێدراون بەروانگەیەکی کەمالیزمیو نەتەوەپەرستی، بەتایبەت دوای شکستی هەوڵی کودەتای ١٥ی تەمموزی ٢٠١٦ و نزیکبوونەوە لەپارتی نەتەوەپەرستو رێکەوتنو هاوپەیمانیو بەرزکردنەوەی دروشمی (یەک نەتەوە، یەک زمان، یەک ئاڵا)، بۆیە مەحاڵە لەچوارچێوەی ئەو دیموکراسیەتە موحافیزکارانەدا مافی نەتەوەیی بەکورد ببەخشرێ، چونکە لەنێو چەمکی دیموکراسیەتی موحافیزکارانەدا پەیوەستبوونو بەرزراگرتنی نەتەوەی تورک بوونی هەیەو ئەوەش دیسان گرێدراوی ئاسایشی نەتەوایەتیەکەیەتی، بۆیە دەبینین ئەم دیموکراسیەتە نەک تەنها بۆ کورد، بەڵکو بۆ گروپێکی تورکیو ئیسلامی وەک بزوتنەوەی خزمەتو خودی فەتحوڵا گولەنیش جێگەی ئیشکالیەتی گەورەیەو جێگەی ئەوانیش نابێتەوە، چونکە چەمکی ئاسایشی نەتەوەیی چەمکێکی گۆڕاوەو فرە شوناسەو هەر گروپو قەوارەیەکی کۆمەڵایەتیو سیاسیو ئیتنیو نەتەوەیی بوونە مایەی هەڕەشە، لەو دیموکراسیەتە موحافیزکارانەدا جێی نابێتەوە.

# خوێندنەوەی پراگماتیکی بۆ دیموکراسیەت لە ڕۆژهەڵاتی ناوین






**سەلام ناوخۆش/ پرۆفیسۆری یاریدەدەر**

لەدایکبووی ١٩٦٦ هەولێر. ماستەر لە زمانی ئینگلیزی. پڕۆفیسۆری یاریدەدەرە لە زانکۆی سەلاحەددین. نزیکە (٦٠) بەرهەمی چاپکراوی هەیە. ڕاوێژکاری گۆڤاری (خاڵ)ە.

**دەروازە**

خوێندنەوەی سیمانتیکی دەق یا ڕەوش نەیتوانی درێژە بە تەمەنی خۆی بدات، بۆیە هەر لە بەرایی هەفتاکانەوە ناچار بوو لە پرۆسەی پاوانکاری دەست سووک بکات و دەرفەت بە شەریکێک بدات، کە زیاتر کار لە سەر کۆنتێکست دەکات، نەک تەنیا خودی دەق.

ئەم نووسینە هەوڵ دەدات دوور لە پرسی «حەلال» و «حەرام»ی چەمکی « دیموکراسیەت »، چەمکەکە وەک غەوارەیەکی ڕەزا قورس و ئامێرێک بەدەست دکتاتۆرانی ڕۆژهەڵات بەتایبەتی وڵاتە موسڵمانشینەکان، تاوتوێ بکات. دەپرسین هۆی چییە دیموکراسیەت لە ڕۆژهەڵاتی ناوین هەرەس دەهێنێت؟؟

**پرانسیپەکانی خوێندنەوەی پراگماتیکی**

پراگماتیکس کار لەسەر کۆنتێکست-ژینگە دەکات، نەک تێکست. ژینگەی دەق- تێکست مەرجێکی بنەڕەتییە لە شرۆڤەکردنی خودی تێکستدا. هەروەها پراگماتیکس کار لەسەر بەکارهێنانی چەمک لە کۆنتێکست–ژینگە دا دەکات، بۆیە زیاتر بە چەمکێکی هەناوی ژینگە دەناسرێت. کەواتە چەمک لە ژینگەدا واتای زەلاڵتر دەبێت و لێڵی ناهێڵێت، بۆ نموونە چەمکی « دیموکراسیەت» لە ژینگەی ئەورووپا واتایەکی هەمەلایەنەی هەیە. سیستەمی وڵات هەرچی بێت، واتای دەنگی تاک، دەسەڵاتی تاک، شوناسی تاک دەگەیەنێت، کە تەواو جیایە لە ژینگەی ڕۆژهەڵاتی ناوین.

لێرەوە تەنیا ئیش لە سەر ژینگەی چەمک و بەکارهێنەری چەمک وەک دوو پرانسیپی خوێندنەوەی پراگماتیس دەکەین.

پرینسیپی کۆنتێکستی چەمک و بەکارهێنەری دیموکراسیەت بە فۆڕمی نوێی بەرهەمی سەرمایەداریی، بە تایبەتی لیبرالیەکەی فرانسیس فوکویاما ١٩٩٢ لە کتێبی «کۆتایی مێژوو و دوا مرۆڤ» جەخت لەسەر ئەوە دەکات، کە دوای تەواوبوونی شەڕی سارد بە قازانجی ئەمریکا و هەردوو پرۆسەی گلاسنۆست و بیرۆسترۆیکای گۆرباتچۆڤ، دەلیڤەیەکی بۆ دنیای تاکجەمسەریی دروست کرد بە جۆرێک فوکویامای هاندا بێژێت: دیموکراسیەتی لیبرالی ئەمریکا دوا سیستەمی مرۆڤە بۆ ژیان.

ئەمریکا و ئەورووپا کۆنتێکستی دیموکراسیەت بوون. هەرچەندە پارێنتی مایکل ٢٠١٠ لە کتێبی دیموکراسی بۆ هەندێک گومان لە سەر دیموکراسیەتی حکومەتی ئەمریکا دروست دەکات بەوەی تەنها هەندێک یا گرووپێکی ئۆلیگاریی ئیحتیکاری دەسەڵات و ئیقتیساد دەکەن، هەروەها کەسانی وەک بیرمەند هێربەرت مارکۆس باسی غیابی فەزای ئایینی لە مارکسیەتی ئەورووپا دەکات. هەر چۆنێک بێت تاکی ئەوڕوپی باکگراوەندێکی کەلتوری لەمەڕ دیموکراسیەت هەیە، سیکیولاریزمی ئەورووپی وەرچەرخانێکی بەخۆوە دیوە و بەرەو پۆست سیکیولاریزم دەچێت بۆ ئەوەی فەزایەک بۆ ئایین بکاتەوە... بەڵام دیموکراسیەت لە ڕۆژهەڵاتی ناوین لەسەر «هیچ» دانەمەزراوە، بەڵکو لە پارادۆکسێکی هزریی دەژی، چونکە بەرهەمی سەرمایەداری و کۆمۆنیستییە نەک دیموکراسی لیبرالی.

**دیموکراسیەتی ڕۆژهەڵاتی ناوین بە بۆیەی ستالینی**

لە وڵاتە ئەورووپیەکاندا «دیموکراسیەت»، هەر فۆڕمێکی هەبێت، سنووری دەسەڵاتی گەل نابەزێنێت، بە واتای سیستەمی وڵات کۆماریی یا شاهانەیی یا سەرۆکایەتیی یا پەرلەمانیی بێت، دیموکراسیەت هەر دیموکراسیەت –ە. تاکی ئەورووپی خۆی تاڕادەیەک بڕیار لە سەر چارەنووسی خۆی دەدات (بەداخەوە لە کوردستان پرسی سیستەمی وڵات، کرابووە کراسی عوسمان و هەندێک بانگەشەی ئەوەیان دەکرد «گەر

سیستەمی وڵات پەرلەمانی بێت زۆربەی ئاریشەکان چارەسەر دەبن» هەندێکی تر پێیان لەسەر ئەوە دادەگرت کە سیستەمی وڵات سەرۆکایەتی بێت...)

لە ڕۆژهەڵاتی ناوین دەوڵەتی کۆماریی و دەوڵەتی شاهانەیی یا شاهانەی دەستووریی هەن، بەڵام «تاک» لەو ژینگانە هەر لە پەراوێزدا دەژی، بەتایبەتی لە دەوڵەتە کۆمارییەکانی عێراق و سوریا و یەمەن و میصر...هتد. بۆیە دەبینین تاکی ئەوروپی خەمی ئەوەی نییە لە فەرەنسا یا هۆڵەندا یا بەریتانیا یا سوید یا ئەڵمانیا بێت، بەڵام لە ڕۆژهەڵاتی ناوین ئەوە کراوەتە ئاریشەکی گەورە.

لە لایەکی تر زۆربەی دەوڵەتە کۆمارییەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوین بەرهەمی کودەتای عەسکەرییین، نەک هەڵبژاردن بە جۆرێک کۆمارییبوونی دەسەڵات تەنیا قاڵک-ە، ئەگەرنا ویراسیەکی خراپتر لە هەناوی دەسەڵاتەکان دەژیت، بۆ نموونە لە سوریا و لیبیا و میصر و یەمەن تیۆری «کوڕ لە شوێن خۆدانان» زۆری کاری لە سەر دەکرا.

خۆی لە خۆیدا دیموکراسیەت و هەڵبژاردن جمکی یەکترن، بەڵام دەسەڵاتەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوین ئاشنا نیین بەو دوو چەمکە. بۆیە ستالینیانە لەو دوو چەمکە دەڕوانن. زیندانی ئەو وڵاتانە جمەی دێت لە کەسانی ئۆپۆزسیۆن، هەڵبژاردن لای دەسەڵات بریتییە لە «بەیعەتدان» بۆیە دەبینین هەردەم دەنگدان بۆ سەرۆکی وڵات لە سەرەوەی سەدا نۆهەتە. گەر بە لۆژیک قسە لەسەر ئەو ڕێژەیە بکەین، سەرۆکەکانی ئەو وڵاتانە زیاتر لە زاتی خودا دەنگ دەبەن، بۆیە هەردەم هەست دەکەی فیرعەون بە فۆرمی تر لە ڕۆژهەڵاتی ناوین دەژی.

ئەو توندوتیژی و زەبردۆستییە لەلایەک بەرهەمی توراس-ە، کە ئیسلام لێی بەرییە، یا بەرهەمی پرانسیپەکانی مارکسییە کە خودی دیموکراسیەت و هەڵبژاردن بە ئامرازی سەرمایەداری دەزانێت. ئەو دووە «توراس و مارکسیەت» هێندەی باوەڕی بە توندوتیژی هەیە بە هیچ جۆرێک باوەڕی بە لیبوردەیی و پێکەوەژیان نییە.

عێراق لە دوای کودەتای تەمووزی ١٩٥٨ نەک هەر پرسەکانی پێش لکاندنی باشووری کوردستان، بەڵکو پرسی شیعە و سوننە و بەشداری کامپی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا لە پرسی عێراق هەردەم خەریکی فۆرماتکردنی عێراقە بە بەرنامەی ڕۆژهەڵاتی یا ڕۆژئاوایی یا ئێرانی.

ڕاستە عێراق بەرهەمی کۆلۆنیالیزم بوو، بەبێ ویستی کورد، کورد کرایە بەشێک لەو وڵاتەی پێ ڕەش بارزانی بە (دولة بالعنف) ناوی دەبات. بەریتانیا لەو ماوەیەدا عێراقی نا ڕاستەوخۆ بەڕێوە دەبرد، سیستەمی وڵات سیستەمێکی بنەماڵەیی بوو. عبدالستار عەبوسی لە ١٤ی تەموزی ١٩٥٨ کۆتایی بەو بنەماڵەیە هێنا و ئەوانەی هەموو کوشتن: شا فەیسەلی دووەم، عبدالالە و نەفیسە ی دایکی عبدالالە و عابدەی خوشکی هەروەها چێشتلێنەرە تورکەکەی کۆشک..لە دەرەوەش سەدانی ترا!

لە ١٩٥٨ کە عێراق بووە کۆماری لە هەمان کاتدا بووە شانۆی کودەتاکان، پاش ئینقلابی عبدالکریم قاسم، بەعسیەکان بە قیتاری ئەنگلۆ-ئەمریکی لە ١٩٦٣ هاتنەوە و عبدالکریمیان کوشت، زۆری نەبرد عبدالسلام عارف لە بەعسیەکان هەڵگەڕاوە و خۆی کرد بە سەرۆک کۆمار، ئەویش لە ١٩٦٦ لە فرۆکە سوتێندرا. عبدالرەحمانی برای هەتا ١٩٦٨ بووە سەرۆک، بەعسیەکان ١٩٦٨ دووبارە هاتنەوە و هەتا ٢٠٠٣ لە دەسەڵات بوون!! لەو ماوەیەدا شەڕی سارد بە کاراکتەری عێراقی جمەی دەهات، بە جۆرێک لای عێراقیەکان شتێک نییە ناوی کۆلۆنیالیزم و پۆست کۆلۆنیالیزم بێت بۆ زۆربەی تاکی سوننە و شیعە و کورد.

دروشمی دیموکراسیەت لە ڕۆژهەڵاتی ناوین

پاش ڕوخاندنی عوسمانییەت لە کودەتای ١٩٠٨، پرسی ئەو هەموو نەتەوەیە لە ئیمپراتۆریەتی عوسمانی جێگای مشتومڕ بوو، بۆیە کۆلۆنیالیزمی



# چەمکی "دیموکراسیەت" لە ژینگەی ئەوروپا واتایەکی هەمەلایەنەی هەیە. سیستەمی وڵات هەرچی بێت، واتای دەنگی تاك، دەسەڵاتی تاك، شوناسی تاك دەگەیەنێت، کە تەواو جیایە لە ژینگەی ڕۆژهەڵاتی ناوین.

بەریتانی و فەرەنسی هەر دابەشکردنی مومتەلەکاتی دەوڵەتی عوسمانی نەبوو، بەڵکو بڵاوکردنەوەی دیموکراسیەت بە فۆرمی ڕۆژهەڵاتی ناوین بوو.

کەواتە خودی دیموکراسیەت لە ڕۆژهەڵاتی ناوین دروشمی کۆلۆنیالیزم -بوو، پاش ماوەی سەرکردایەتی ستالین ١٩٢٤-١٩٥٣ شیوعیەکان پێگەیەکی ستراتیژیان لە ڕۆژهەڵاتی ناوین داگیر کرد: کۆلۆنیالیزم خاکی داگیرکرد و مارکسیەت هزر. لە پاش پەنجاکانەوە پرسی دیموکراسیەت لە ڕۆژهەڵاتی ناوین بووە خەمی کۆلۆنیالیزم و مارکسیەت هەتا حیزبە ئۆپۆزسیۆنەکانیش بە دوو تەیاری قەومی و شیوعی لە سەر ئەو وەتەرە ئیشی کرد. بۆ نموونە دروشمی یەکەمی حیزبی شیوعی عێراقی، دیموکراسیەت بۆ عێراق بوو. پارتی دیموکراتی کوردستانیش هەر دیموکراسی بۆ عێراق بوو. ئەوە نزیکەی ١٠٠ ساڵە قەومی و لیبرالی و شیوعی، بانگەشەی دیموکراسیەت دەکەن. دیموکراسیەت هەر بە فۆرمەکەی ئەوروپا دەرنەکەوت، بەڵکو لە سەردەمی پۆست کۆلۆنیالیزم وەک کۆلۆنیالیزمی لۆکەلی دەرکەوتن!

### هەڵبژاردن و ڕیفراندۆم لە ئەجێندای ڕۆژهەڵاتی ناوین

هەردوو چەمکی هەڵبژاردن و ڕیفراندۆم چەمکی غەوارەن، نا-بەلەدن لە ڕۆژهەڵاتی ناوین. لە سەردەمی کۆلۆنیالیزم و پۆست کۆلۆنیالیزمدا زۆربەی هەرەزۆری دەوڵەتەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوین ئاشنانین بەو دوو چەمکە. ئەو دوو چەمکە لە هەناوی دیموکراسیەت لەدایک دەبن، ئەو فۆرمە دیموکراسیەی لە ڕۆژهەڵاتی ناوین هەیە تەواو جودایە لەگەڵ ئەوەی ڕۆژئاوا. پرسەکەش پەیوەندی بە سیستەمی وڵات نییە، بەڵکو پەیوەندی بە ڕەوش و هزر و بیرکردنەوەی ڕۆژهەڵاتیەکان هەیە. لە ساڵی ١٩٩٧ لە وتارێکدا نووسیم ئەمە پەیوەندی بە فیرعەونیەتی دەسەڵاتە بەناو عەلمانیەکانی عەرەبەوەیە، کە قەبووڵی ئەویتر ناکات، ئەو خۆی هەر وەک فیرعەون وێنا دەکات و قەبووڵی موسا ناکات، ئەگەرنا موسا و لایەنگرانی جگە لە داوای یەکخوایی داوای هیچی تر ناکەن.

ئەو دکتاتۆرانەی ڕۆژهەڵاتی ناوین دەسکردی ئەمریکا یا ڕووسیان، هەر کاتێک لە خەتەر بن، ئەمریکا و ڕووسیا هاتوونەتە ناو گەمەکە. هەر بۆ نموونە پەیمانی لیتۆڤسک ١٩٢٣ و سەعد ئاباد ١٩٣٧ و سەنتۆ ١٩٥٥ و هەشتی شوبات ١٩٦٣ و کوشتنی عبدالسلام عاریف بەشێکن لە پاراستنی کیانەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوین. یانی ڕۆژئاواییەکان نایانەوێت دابی کۆلۆنیالیزم لە ڕۆژهەڵاتی ناوین بشکێنن، گەر لە ١٩٩١ بریاری ٦٨٨یان لە ئەنجومەنی ئاسایش دەرکرد بەناوی «مافی دەستێوەردان» لە سەر کۆچی ملیۆنی کورد بە دەنگ هاتن. لە لایەکی تر ڕەوشەکە هۆکاری تر بوو، ئەگەرنا هەر ئەو وڵاتە ئەوروپیانە بە یەک

دەنگ ڕیفراندۆمی ٢٠١٧ی باشووری کوردستانیان ڕەتکردەوە و پەسنی حوکمی مەرکەزیان کرد لە عێراقدا.

لە بیستەکانی سەدەی بیستەم مێجەر نوئیلی لۆرانسی کورد دەیوت: «گەر کورد دەیەوێت دەوڵەتی ببێ و لە تورک و عەرەب و فارس ڕزگاری ببێ با ببێتە مەسیحی، هەر ئەوە چارەسەرە». یانی کۆلۆنیالیزم هەر بە داگیرکردنی خاکی کورد و دابەشکردنی بەسەر عەرەب و تورک دلی ئاو ناخواتەوە، دەیەوێ دینیشی بگۆڕێت. حیزبە کوردیەکانیش، کە زۆربە بەرهەمی مارکسیزم بوون لەنێو شاخە عاسێکانی کوردستانیش بۆ ماوەی سی ساڵ ١٩٦١-١٩٩١ هەر دروشمی دیموکراسیەت بۆ عێراقیان بەرزکردبۆوە.

## دیموکراسیەت بە بۆیەی مارکسیی یان کۆبوونەوەی دژەکان؟

چیرۆکی دیموکراسیەت لە کوردستان ڕەگێکی سەد ساڵەی هەیە، یا ڕێکتر بڵێین بەستراوەتەوە بە سەرهەڵدانی مارکسیەت و فیگەرە چەپە کوردەکان لە کوردستان.

لە هەردوو بەشی باکوور و باشووری کوردستان، دوو منەوەری کورد بە ئایدیۆلۆژیای مارکسی لە دەیەکانی سەدەی بیستەوە دەرکەوتن (ناوخۆش ٢٠١٥ ، مێژووەک لە پەرتەوازەیی)، لە باکوور دکتۆر عەبدوڵڵا جەودەت بە قسەی (زەنگەنە ٢٠٠٥، ل٦٧، عبدالستار ٢٠٠٥، ل٣٦، پیربال ٢٠٠٩، ل١١، عوسمان عەلی ٢٠١١، ل١٨٤) قسە لەسەر ئەوە دەکەن کە عەبدوڵڵا جەودەت یەکێک لە دامەزرێنەرەکانی ئیتحاد و تەرەقی-یە هەڵگری هزری ئومەمییە. لە نەزەر موحەمەد ئۆزۆن (١٩٨٩، ل٣٠) «عەبدوڵڵا جەودەت هیمداری هزری ژۆن تورکەکان (باڵی هزری ئیتحادوتەرەقی لە هەندەران) بوو، هەروا یەکێ بوو لەوانەی هزری ماتریالی مارکسی هێنایە نێو کورد». ئەو مارکسیە، کە هەڵگری بیرۆکەی عەلمانیەتی موتڵەق بوو، بەشێک بوو لە ماڵوێرانی بۆ کورد. جەلیلی جەلیل لە ل٨٤ وێنەیەکی دی عەبدوڵڵا جەودەت پیشاندەدات بەوەی دژ بە هزرەکەی خۆی کاری لەسەر بە دیموکراتیزکردنی کۆمەڵگای کوردی دەکرد. لە نەزەر مارکسیەت هەر یەک لە «پەرلەمان» و «دیموکراسیەت» دوو بەرهەمی وردە بۆرژوای سەرمایەدارین، بەڵام عەبدوڵڵا جەودەت بە دیدێکی عەقیدەیی/ لا دینی لە دیموکراسیەت گەیشتبوو»، تێڕوانینە سیاسیەکانی ئەوە دەردەخەن کە ئەو سەر بە نەوەی ڕۆشنگەریی بۆرژوازیی دیموکراتی نێو کورد بووە».

لە باشووریش جەمال عیرفان لە سەردەمی حوکمداریەکەی شێخ مەحموود دەرکەوت، کە بە هیچ جۆرێک باوەڕی بە دەسەڵاتی دەرەبەگی ویراسی شێخ مەحموود نەبوو. لە ئیدارەی مێجەرسۆن و ڕۆژنامەکەی -پێشکەوتن- کاری لەسەر بڵاوکردنەوەی هزری مارکسی و بێدینی دەکرد (ناوخۆش ٢٠١٥ ، ل٩٣-١٠٢).

جەمال عیرفان وەک مەلا سەعید نورسی لە جەنگی جیهانی یەکەم لە لای سوپای ڕوسی بەدیل دەگیرێت و هەتا دوای شۆرشی بەلشەوی ١٩١٧ دەمێنێتەوە. جەمال عیرفان بە پێچەوانەی مەلا سەعیدی کوردی/نورسی وەک هەوادارێکی سیستەمی کۆمۆنیستی ڕوسیا دەگەڕێتەوە باشووری کوردستان. لەمبارەیەوە تاڵەبانی لە ل٨٥ چاپی کوردی کتێبی «کوردستان و بزوتنەوەی کورد» دەنووسێت: «لە ماوەی حوکمڕانی یەکەمی شێخ مەحموودا چەند ڕەگەزێکی شۆرشگێڕ لە ئەدەبیاتی کوردی دەرکەوتن خەریکی بڵاوکردنەوەی شۆرشی ئۆکتۆبەر و حکومەتی سۆڤیەتی بوون. ئەوانە لە نێو کورد بە بەلشەفی ناسران، بێ ئەوەی لە ڕاستیدا بەلشەفی بن و لە مارکسیزم و لینینیزم و تێگەیشتنەکانی کۆمۆنیستی تێبگەن. لەنێو ئەو کوردانە خوێنەوارێک هەبوو، ئەویش



# دیموکراسیەت لە ڕۆژهەڵاتی ناوین لەسەر "هیچ" دانەمەزراوە، بەڵکو لە پارادۆکسێکی هزریی دەژی، چونکە بەرهەمی سەرمایەداری و کۆمۆنیستییە نەك دیموکراسی لیبرالی.

جەمال عیرفان بوو. «سەرچاوەکانی سەردەمی جەمال عیرفان نکۆڵی لەوە ناکەن کە ئەو خەریکی بڵاوکردنەوەی مارکسیەت بووە، مارکسیەتیش لای ئەو بریتی بوو لە بێدینی و گۆڕینی کۆمەڵگای دەرەبەگی کوردی بۆ کۆمەڵگایەکی کۆمۆنیستی بێ چین. عبدالرقیب یوسف و سەدیق صالح لە وتارێکی ژمارە سێزدەی (ڕۆڤار) قسەیەکی باوی جەمال لەسەر بیروباوەڕی دامەزراو لەسەر ماتریالیزم دەگوازنەوە: «ئەو شتەی کە من بیپەرستم، دەبێ بە چاوی خۆم بیبینم، بزانم چیە؟» خواجە و ڕەفیق حیلمی ئاماژە بەوە دەکەن کە جەمال عیرفان فەرماندەی سوپای لیڤی بوو، ئەو سوپایەش بە پێی بەڵگەی فەرەنسی ژمارە ٣٥ لە ١٩٢٥ شیخ مەحموودی تەنگەتاو کردبوو».

جەمال عیرفان وەک عەبدوڵلا جودەت بە پێچەوانەی هزرەکەیەوە مامەڵەی دەکرد، بۆ نموونە ئینگلیز بە گوێرەی مارکسیەت کۆلۆنیالیزم و ئیمپریالیزم بوو، بەڵام جەمال عیرفان بە قسەی (خواجە، ل٦٢، تاڵەبانی، ل٨٧ و عبدالرەقیب یوسف، ل٤): «ئینگلیزخوایەک بوو، شێخ وتەنی ئاوی ئینگلیزی خواربۆوە، بانگەشەی بۆ دیموکراسیەت و بێباوەڕی دەکرد.»

جەمال عیرفان لە سەر مەسەلەیەکی کۆمەڵایەتی لە ١٩٢٢ کوژرا و عەبدڵلا جەودەت لە ١٩٣٢ مرد، بەڵام تێڕوانینەکانیان لە هزر مارکسی و لە دەوڵەتداری بۆرژوای دیموکرات، بووە هەوێنی حیزبی مارکسی کوردی. مەسعود عبدالخالق ٢٠٠٩ لە کتێبی «ناسنامەی حزبە کوردستانیەکان» ئەو ڕاستیە پشتڕاستدەکاتەوە کە حزبە عەلمانیەکانی کورد هەڵگری پەتای بڵاوکردنەوەی مارکسیەت و بێباوەڕی و دروشمی دیموکراسیان هەبووە. حزبی هیوا و ڕزگاری و شۆڕش و پارتی لە غیابی مستەفا بارزانی بەرەو کۆمۆنیستی دەچوون. ئەو هەموو حزبە بە دروشمە کانیان: کوردایەتی شەرمەزارییە، نیشتمانێکی ئازاد و گەلێکی بەختیار، دیموکراسی بۆ عێراق و ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان، بوونە هۆی چەسپاندنی سایکس بیکۆ و لۆزان (مەسعود ٢٠٠٩،ل٣٩٢، ناوخۆش ٢٠١٥، ل١١١) ئەمەش بە ئایدیۆلۆژیاکردنی خەبات و کوشتنی دەوڵەتی خوارووی کوردستانی لێکەوتەوە. لەمە زیاتر، کۆمەڵەی مارکسیزم و لینینزم مارکسیەتی لە دیموکراسیەت جیاکردەوە بیرۆکەی عێراقیەت و کوردستانیەتی هێنایە گۆڕێ بەوەی کوردستانیەت لە دەرەوەی پرانسیپەکانی مارکسیەتە، بەڵام هەر داوای دیموکراسیەتی بۆ عێراق دەکرد. لێرەدا مەسعود عبدالخالق ناهەقی نەبوو، کە عەلمانییەت، منداڵدانی دیموکراسیەت بەماڵوێرانی کۆمەڵگای کوردی بزانێت، چونکە عەلمانییەت لای حزبی کوردی شاخ و شار میکانیزم نەبوو، بەڵکو عەقیدەیەک بوو بەرانبەر ئیسلام.

بە گوێرەی مارکسیەت ئەوەندەی دیموکراسیەت وەک «عەقیدەیەک، ئایدیۆلۆژیایەکی ئالتەرنەتیڤ»

ئیشی لە سەر کراوە وەک «میکانیزمێک» لە شاخ و شار کاری لە سەر نەکراوە .

کارل پۆپەر لە کتێبی «کۆمەڵگای کراوە«دا هەق بە مارکسیەکان نادات، گەر لە هەڵبژاردنیشدا سەرکەون، ولات بەرێوە ببات، چونکە دەسەلاتی رەهای دیموکراسیەت دەکوژێت و موتلەقیەتی ئایدیۆلۆژی و مەرکەزیەت دەسەپێنی.

زۆربەی ولاتانی رۆژهەلاتی ناوین لە سەرەتادا بەرهەمی کۆلۆنیالیزم بوون، بەشێکی سیستەم مارکسی بوون، لە نێو ئەو پارادۆکسیە هزریە، دیموکراسیەت بە فۆرمی ئەوروپی و ئەمریکی ئامادەگی نییە، بەڵکو ئەوەی حزوری هەیە دیموکراسیەکی رۆژهەلاتییە، کە صەدام وتەنی : الدیمقراطیتتنا من طراز الخاص ...

**کورتە**

دیموکراسیەت لە رۆژهەلاتی ناوین/ناوەراست سەرەتا بەرهەمی کۆلۆنیالیزم بوو بۆ بەگژدادانی نەتەوەکانی دەوڵەتی عوسمانی، بۆیە لە قۆناغی پۆست کۆلیانیزمیش، کۆلۆنیالیزم هەر مایەوە، کەواتە دیموکراسیەت لە کۆنتێکستی- ژینگەی رۆژهەلاتی ناوین بەرهەمی نابێت. کۆمەڵێک هۆکار لە پشتەوە ئەو « دیموکراسیە ترشاوە«ی رۆژهەلاتی ناوینن وەک توراسی فیرعەونی عەرەبی و هزری مارکسی، پشت لە کۆلۆنیالیزم بکات و لێبگەرێت دیموکراسیەت وەک میکانیزمێک دروستببێت, هەر خۆیان بەربەستی بۆ دروست نەکەن.



**سەرچاوەکان**

أ.سەرچاوەی ئینگلیزی

Fukuyama , Francis 1992 The End of History and the Last Man.

Parenti , Michael 2010 Democracy for Few, 9th edition . USA.

Van Dijk , Teun 1977- 2008 Text and Context . London : Longman.

ب. سەرچاوە کوردیەکان:

پۆپەر ، کارل ٢٠٠٠ کۆمەڵگەی کراوە . سلێمانی.

تاڵەبانی ، جەلال ٢٠٠٤ کوردستان و بزوتنەوەی نەتەوەیی کورد . سلێمانی .

خواجە ، احمەد ١٩٦٨ چیم دی ، بەرگی یەکەم . بەغدا : شەفیق.

زەنگەنە ، عبدلله ٢٠٠٥ گۆڤاری کورد . هەولێر .

شریف ، عبدالستار ٢٠٠٥ الجمعیات و المنظمات و الاحزاب الکردیة في نصف قرن ١٩٠٨-١٩٥٨, الطبعة الثانیة . السلیمانیة

ناوخۆش ، سەلام ٢٠٠٤ دەوری کۆنتێکست لە دیارکردنی واتادا . هەولێر: کالێ.

ناوخۆش ، سەلام ٢٠١٥ مێژووەک لە پەرتەوازەیی . هەولێر : هیڤی .

عبدالخالق ، مەسعود ٢٠٠٩ ناسنامەی حزبە کوردستانیەکان . هەولێر : هیڤی.

# ئەمریکا و دیموکراسی تەوافقی لە عێراقدا

**پێشەکی:**

بەشێوەیەکی گشتی وەها بڵاوە کە دەوڵەتانی ڕۆژئاوا بە تایبەت ئەمریکا ڕێگرن لەبەردەم بەرەوپێش چوونی دیموکراسی لە وڵاتانی جیهانی ئیسلامی، ئەوەش هەندێکجار وەك پاساو بەکار هاتووە بۆ ئەوەی بەرپرسیارێتی بەرەوپێش نەچوونی دیموکراسی لەسەر کاراکتەرە ناوخۆییەکان لابەرن و هەموو گرفتەکە بخەنە سەر ڕەهەندی دەرەکی. دەکرێت ئەم پاساوە بۆ سەردەمێك و قۆناغێکی مێژوویی کە تیایدا سیستشمی جیهانی لە ماوەیەکی دیاریکراودا پێیدا تێپەڕ بووبێت دەست بدات، بەڵام ناکرێت گشتگیر بکرێت بۆ هەموو سەردەمەکان و هەموو دەوڵەتان وەك یەك سەیر بکرێت.



**ئیبراهیم محەمەد عەزیز**
لەدایکبووی ١٩٧٨، هەڵەبجە
دکتۆرا لە سیاسەت و پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان (٢٠١٧) لە وڵاتی بەریتانیا.

ئەم بابەتە هەوڵێکە بۆ وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارە کە ئایا ئەمریکا (وەک رەهەندی دەرەکی) کاریگەری نێگەتیڤانەی هەبووە لەسەر دیموکراسی تەوافقی(١) لە عێراقدا لە دوای ٢٠٠٣ وە یان بە پێچەوانەوە؟ یان مامەڵەی ناتەندروستی کاراکتەرە ناوخۆییەکان بەربەست بوون لەبەردەم ئەو پرۆسەیەدا؟

لەم بابەتدا باسی خراپی یان باشی دیموکراسی بەگشتی و دیموکراسی تەوافقی بەتایبەتی ناکرێت، نوسنیەکەش بۆ ئەوە تەرخان نەکراوە، دەکرێت لە کات و شوێنێکی تردا ئەوە ببێتە بابەتەی سەرەکی لێکۆڵینەوەیەک، بۆیە لێرەدا بەهیچ جۆرێک باسە لەسەر ئەوە نییە کە دیموکراسی تەوافقی باشە بۆ عێراق یان باشتر دەبوو ئەگەر بەجۆرێکی تر بوایە، بەڵکو بابەتەکە تەرخان کراوە بۆ ئەوەی بزانرێت کە ئەمریکا وەک هێزێک لە دوای ٢٠٠٣ کە سەرۆکایەتی هاوپەیمانێتییەکی نێودەوڵەتی کرد و حزبی بەعسی روخاند(٢) چ رۆڵێکی هەبوو لە دووبارە بنیات نانی سیستمی سیاسی لەعێراقدا؟ ئایا کاراکتەرە ناوخۆییەکان مامەڵەو کارەکانیان بەچ ئاراستەیەک بوو؟ ئەمەش هەوڵێکە بۆ ئەوەی لەوە تێ بگەین کە راستەوخۆ بڕیار نەدەین کە رۆژئاوا دژی بەدیموکراسی کردنی وولاتانی جیهانی ئیسلامی یە یان پشتگیری دەکات، بەڵکو بەشێوەیەکی پراکتیکی لە هەر کەیسێک بڕوانین و توێژینەوەی لەسەر بکەین و ئەو کات بۆمان روون دەبێتەوە کە بەکرداری رۆژئاوا دژی بە دیموکراسی کردنی ئەم وولاتانە و دەستاودەستکردنی دەستەلات و هاوبەشی کردنی پێکهاتەکانە لە دەستەڵات یان نا.

**بابەتەکە بەسەر دووتەوەری سەرەکیدا دابەش بووە:**

یەکەم: ئەمریکاو دووبارەبنیات نانەوەی سیستمی سیاسی لەعێراقدا.

دووەم: قۆناغی پراکتیزەکردنی سیستمی سیاسی نوێی عێراق لە ژێر رۆشنایی دەستووری نوێدا.

پاشان بەکورتی بەرئەنجامی گشتی باتەکە دەخەینە روو.

**یەکەم: ئەمریکاو دووبارەبنیات نانەوەی سیستمی سیاسی لەعێراقدا.**

لە دوای رووخانی رژێمی بەعس لە ٢٠٠٣، ئەمریکا و هاوپەیمانەکانی زوو بە زوو دەستیان کرد بە دووبارە بنیات نانەوەی سیستمی سیاسی لە عێراق و فۆرمۆلەکردنی دامەزراوە سیاسیەکانی بەجۆرێک کەلەگەڵ بارودۆخی دابەش بووی عێراقدا بگونجێت بە ئامانجی ئەوەی هەنگاوێک بێت بە ئاراستەی ئارامی لە نێوان پێکهاتەکان وکەمکردنەوەی ململانێی نێوان پێکهاتەکان و سەرەتاییەکی گرنگ بێت بۆ پێکهێنانی حکومەتێک کە نوێنەرایەتی هەموان بکات. (٣) زاڵمای خەلیل زاد دەڵێت: سیاسەتی ئێمە لە روخاندنی رژێمی بەعس ئەوە بوو کە حکومەتێکی بنکە فراوان کە نوێنەرایەتی هەمووان بکات بێهنینەکایەوە. (٤) چونکە ئەو سیستمە لە کۆمەڵگایەکی دابەش بووی وەک عێراق کە سێ پێکهاتەی جیاوازی لە خۆی گرتووە پێویستە و دەگونجێت.

لەبەر ئەوە لەیەکەم هەنگاوی ئەمریکا بۆ دروست کردنی هاوبەشی راستەقینە لەنێوان پێکهاتەکاندا (مجلس الحکم) ی دروست کرد کە پێکهاتبوون لە (١٣ شیعە، ٥ سوونە، ٥ کورد، یەک مسیحی، یەک تورکمان) کۆی هەمووی ٢٥ کورسی بوو کە لە ٢٣ تەموزی ٢٠٠٣ تا ١ حوزەیرانی ٢٠٠٤ بەردەوام بوو، بە پێی بڕیاری ئەنجوومەنی ئاسایش ١٤٨٣ و ١٥١١و جێ بەجێ کردنی بڕیاری ژمارە CPA 9 . (٥) ئەم هەنگاوە وەک دروستکردنی هاوپەیمانیەکی گەورە مامەڵەی لەگەڵ کراو بوو بەسەرەتایەک بۆ ئەوەی کابینەی حکومەتیش لەسەر هەمان شێواز بنیات بنرێت. ئەوەبوو پۆڵ بریمەر(حاکمی مەدەنی عێراق) حکومەتێکی دروست کرد لە سەر هەمان بنەما و بەهەمان ژمارەی ئەندامانی ئەنجوومەنی حوکم لە ١ ئەیلولی ٢٠٠٣ تا حوزەیرای ٢٠٠٤ بە هەمان رێژەش پێکهاتەکان بەشداریان تێدا کرد. ئەمریکا زۆر باوەڕی بەوە هەبوو کە ئەمجۆرە

دابەشکردنە دەبێتە هۆی دروستکردنی هاوبەشی راستەقینەو هێنانەکایەی هاوپەیمانی لەنێوان پێکهاتە سەرەکییەکاندا، لەوێوە دووبارە سیستمێکی نوێ بۆ عێراق بنیات دەنرێت کە ببێتە هۆی کەمکردنەوەی ململانێیەکان و هێنانەکایەی جۆرێک لە ئارامی بۆ عێراقی یەکان، چونکە سیستمی زۆرینە ناتوانێت بەرئەنجامێکی باشی هەبێت لە کۆمەڵگایەکی دابەش بووی وەک عێراقدا(٦)

بۆ ئەوەی بنیات نانەوەی دامەزراوە سیاسیەکان شێوەی دەستووری وەربگرێت پێویست بوو لە دەستووری نوێی عێراقدا بابەتی هاوبەشی راستەقینەو هاوبەشی لە دەستەڵات بەتەواوی ڕەنگبداتەوەو لەسەر بنەماکانی دیموکراسی تەوافقی ڕەنگرێژبکرێت. ئەوبوو ئەمریکییەکان یاسای بەڕێوبردنی دەوڵەت بۆ قۆناغی گواستنەوەیان هێنایە بەر باس و گفتوگۆیان لەسەر کرد. ڕەشنوسی ئەو یاسایە کەبە ( TAL(٧)) تاڵ ناسرا لەلایەن CPAیەوە دانرا و پاشان خرایە بەردەستی عێراقییەکان بۆ ئەوەی گفتوگۆی لەسەر بکەن و تالّی لێ بێتە بوون. (٨) TAL بەتەواوی سیستمی تەوافقی تێدا ڕەنگی دابوویەوە و ڕەنگرێژی هاوبەشی لەدەستەڵات لەنێوان پێکهاتەکان دروست کردبوو. بەتایبەت لە بابەتی (فیدرالیزم، بەشداری راستەقینە، ڕێژەیی پێکهاتەکان، ڤیتۆ بۆ کەمینەکان، ئۆتۆنۆمی کلتوری ...هتد) (٩) ئەمەش وەنەبێت بێ گیروگرفت تێپەڕبووبێت، بەڵکو هەندێک لەو بابەتانە مشتومڕی زۆری دروست کرد لەنێوان پێکهاتەکان بەگشتی بەڵام سەرئەنجام هەموویان لەژێر چاودێری CPA دا رازی بوون بە و یاسایە کە وەک دەستوورێکی کاتی وابوو. لێرەدا دەتوانین ئەوە بڵێین کە ئەم قۆناغی نوسینەوەیە هەنگاوێک سیستمی تەوافقی بردە پێشەوە بەوەی کە بەشێوەیەکی فەرمی ڕەنگدانەوەی بنەماکانی دیمکراسی تەوافقی تێدا بوو.

لەژێر ڕۆشنایی تاڵدا حکومەتی کاتی دامەزرا لە ٣٠ حوزەیرانی ٢٠٠٤ تاوەکو کانونی دووەمی ٢٠٠٥، لە پێناو دروستکردنی حکومەتێک کە هاوپەیمانیتیەکی گەورە لە خۆ بگرێت پۆڵ بریمەر ونوێنەری تایبەتی نەتەوەیەکگرتووەکان ئەخزەر ئیبراهیمی هەوڵیاندا حکومەتێک پێک بهێنن کە لەئاستی قۆناغەکەدا بێت، هەرچەندە نوێنەری نەتەوەیەکگرتووەکان دەیویست حکومەتێکی تەکنۆکرات لە هەموو پێکهاتەکان پێکبهێنێت، بەڵام بریمەر بۆچوونی جیاواز بوو، ئەوەبوو دوای گفتوگۆی بەردەوام پۆستەکانی کابینەکە بەمشێوەیە بوو (١٦ شیعە، ١٠ سوونە، ٨ کورد، یەک تورکمان، یەک مسیحی) کەبەڕێژەی ٤٤٪ شیعە، ٢٧ ٪ سوونە، ٢٢٪ کورد) بوو. ئەم شێوازە زۆر روونە کە تیایدا ڕێژەی پێکهاتەکان لەبەرچاو گیراوە و هەوڵدراوە کە هاوبەشی لەنێوانیاندا دروست بکرێت. (١٠)

لەپاڵ ئەم حکومەتدا ئەنجوومەنی نیشتمانی کاتی دروستکرا بۆ ئەوەی وەک دەستەڵاتی تەشریعی کارەکانی خۆی بکات، لە ١٠٠ ئەندام پێکهاتبوو، کە ٢٥ یان راستەوخۆ دانران، ئەوانیش ئەندامی (جلس الحكم )بوون، راستەوخۆ بوون بەئەندامی ئەو ئەنجوومەنەو ٧٥ تریان بەلیستێک لەنێوان پێکهاتەکان دروستکراو لە کۆبوونەوەیەکی گشتی لە بەغداد بریاری لەسەر دراو ڕێژەکەش بەم شێوەیەبوو (شیعە ٤١، سوونە ٢٥، کورد ٢٥، ٦ تورکمان، دوو مسیحی، یەک یەزیدی). (١١) ئەم ئەنجوومەنەش هەر لەژێر کاریگەری ئەمریکادا بوو، چونکە تا ئەو کاتەش ئەمریکییەکان حاکمی عێراق بوون، دەستەڵاتی تەواویان هەبوو بەسەر کۆی پرۆسەی سیاسی لە عێراقدا.

یەکێکی تر لەو هەنگاوانەی بەرەو جیبەجێکردنی سیستمی تەوافق هاتەبوون بریتی بوو لە ئەنجامدانی هەڵبژاردنی ٣٠ کانونی دووەمی ٢٠٠٥ کە بەپێی یاسای هەڵبژاردنی CPA کە بریمەر دەری کردبوو

لەسەر بنەمای نوێنەرایەتی ڕێژەیی و یەک بازنەی هەڵبژاردن و سیستمی داخراو(١٢) ئەنجامدرا بۆ ئەوەی پێکهاتەکان ڕێژەی خۆیان بزانن و پاشان بەپێی ئەو ڕێژە بەشداری پرۆسەی سیاسی عێراق بکرێت. بەڵام پێکهاتەی سوونە بایکۆتی پرۆسەکەیان کرد و نەهاتنە ناو پرۆسەکەوە، سەرەڕای ئەوەی کە ئەمریکا و نەتەوەیەکگرتووەکان هەوڵی جدیان دا بۆ ئەوەی ئەوانیش بەشداری پرۆسەکە بکەن بەڵام هەوڵەکەیان نەیتوانی هەموو سوونەکان بهێنێتە ناو پرۆسەکەوە، ئەوەبوو ئەنجامی هەڵبژاردنەکە بەم شێوەیەی خوارەوە بوو (١٤٠ شیعە، کورد ٧٧ کورسی، لیستی ئەیاد علاوی ٤٠ کورسی، غازی یاوەر کە سوونە بوو تەنها ٥ کورسی هێنا، تورکمانەکان ٣کورسی ) لەکۆی ٢٧٥ کورسی. (١٣) پاشان هەوڵدرا کە حکومەتێکی هاوبەش دروست بکرێت و سوونەش بەشداری تێدا بکەن، ئەمریکا زۆر هەوڵیدا کە بەبێ سوونە ئەو حکومەتە تەشکیل نەکرێت بەڵام هەولەکان لەگەڵ سوونە بەو شێوەیە بەرهەمی نەبوو کە ئەمریکیەکان دەیان ویست. ئەوەبوو حکومەتی گواستنەوە کە ئیبراهیم جعفری سەرۆکایەتی دەکرد لە (٢٠٠٥/٥ بۆ ٢٠٠٦/٥) کارەکانی ئەنجامدا، بەڵام سوونە زۆر بەلاوازی بوونی هەبوو کە لەکۆی ٣٥ پۆست تەنها ٤ پۆستیان سوونە بوون ئەوی تریان لەلایەن پیکهاتەکانی تر بەڕێوەدەبران (١٤). ئەمە ئەوە دەگەیەنێت سەرەڕای ئەوەی کە ئەمریکا و نەتەوەیەکگرتووەکان ڕەنگرێژی و پلانیان هەبووە بۆ ئەوەی هاوبەشی راستەقینە لەدەستەڵات بێتە بوون و هەموو پێکهاتەکان بەشداری بکەن لە پرۆسەکەدا بەڵام کاراکتەرە ناوخۆییەکان بەتایبەت سوونەکان کە دەیان ویست عێراق بگەڕێتەوە ئەو قۆناغەی کە خۆیان دەستەڵاتداربوون نەیان ویست بەشدار بن و بایکۆتی پرۆسەی سیاسیان کرد. لەهەمان کاتدا شیعەکان حەزیان دەکرد کە سوونەکان نەیەنە ناو پرۆسەکەوە تاوەکو خۆیان پۆستە گرنگەکان بەرێوەبەرن و پێگەی خۆیان بەهێز بکەن.

لەپاش ئەو قۆناغە و بەپێی پلانی ئەمریکا و نەتەوەیەکگرتووەکان دەستکرا بە ئامادەکاری بۆ ئەوەی دەستووری هەمیشەیی عێراق بنوسرێتەوە، پاشان لە ریفراندۆمدا دەنگی لەسەر بدرێت و هەموو لایەک تیایدا بەشداربن. ئەوەبوو پاش گفتوگۆیەکی دورو درێژ لیژنەیەک پێکهات بۆ ئەوەی ڕەشنوسی دەستوور بنوسرێتەوە، بەڵام لەسەرەتادا سوونە کان بەشداریان نەکردو پاش ماوەیەک هاتنە ناو پرسەکەوە، ئەویش بەهەوڵی ئەمریکا ونەتەوەیەکگرتووەکان بۆ ئەوەی دەستوور ڕەنگدانەوەی هەموو پێکهاتەکان بێت نەک تەنها یەک یان دوو پێکهاتە. لیژنەی نوسینەوەی دەستوور پێکهاتبوون لە (٢٨ شیعە، ١٥ کورد، ١٥ سوونە، ٦ ئەیاد عەلاوی ، ٤ ئەندامیش بۆ مەسیحی و تورکمان) کەلە ٢٠٠٥/٥/٢٥ دەستیان بەکارەکانیان کردو و ڕەشنووسی یەکەمیان لە ٢٠٠٥/٨/٢٨ دا تەواو کرد، کۆتا ڕەشنوسیش کە ریفراندۆمی لەسەر کرا لە ٢٠٠٥/٩/١٩ دا لە لایەن ئەنجوومەنی نیشتمانی بۆ قۆناغی گواستنەوەوە پەسەند کراو لە ٢٠٠٥/١٠/١٥ دا ریفراندۆمی لەسەر کرا و ئەنجامەکەیش ٧٨,٦ ٪ بەبەڵێ دەنگی دا و ٢١,٤ ٪ بەنەخێر دەنگی دا کە نەخێرەکان نوێنەرایەتی سوونەکانی دەکرد. (١٥) لەنوسینەوەی ئەو دەستورەدا تاڵ کرایە بنەمای سەرەکی بۆ دانوستاندن و گفتوگۆکردن بۆ ئەوەی لەوێوە بتوانرێت سوود لەو پرۆژەیە وەربگیرێت و کارەکەیان بۆ ئاسان بکات. (١٦) لەهەمان کاتدا سەرەڕای ئەوەی لیژنەیەکی سەرەکی هەبوو بەهەمان شێوە لیژنەیەکی بچووکراوەش هەبوو کە سەرکردە باڵاکانی هەر سێ پێکهاتەی سەرەکی (شیعە، سوونە، کوردی) تێدا بوو پێیان دەگوترا (مەتبەخی سیاسی) کەتیایدا کێشە سەرەکییەکان

که لەلیژنەی دەستووری چارەسەر نەدەکرا لەوێ تاوتویدەکرا و بڕیاری لەسەر دەدرا. ئەمریکی یەکان و راوێژکارانی نەتەوەیەکگرتووەکان لەگەڵ مەتەبخی سیاسی بەردەوام لە پەیوەندیدا بوون بۆ ئەوەی دەستووریک بنوسرێتەوە کە بتوانرێت هەموو لایەنەکان کۆبکاتەوە و لەسەر بنەمایەک بێت کە بەکرداری هەمووولایەک هاوبەش بن لەدەستەلاتدا نەک تەنها پێکهاتەیەک یان دوو پێکهاتە چونکە بارودۆخی عێراق وەک کۆمەڵگایەکی دابەش بوو پێویستی بەجۆرێک لە سیستمە کە هەموو پێکهاتەکان پشکیان هەبێت و پێکەوە دەوڵەت بەڕێوە بەرن.

کۆی دەستوورەکە بەتەوافق نوسراوەتەوە و تەوافقیەت تیایدا ڕەنگی داتەوە بەجۆرێک کە دەستووری عێراقی بەیەکێک لە دەستووری وولاتانی تەوافقی ئەژماردەکرێت. لە دوای پەسەند کردنی و کەوتنە بواری جێ بەجێ کردنەوە، دووبارە بنیات نانی دامەزراوە سیاسیەکان بە پێی ئەو دەستوورە چوو ەبواری جێبەجێکردنەوە وپرۆسەی سیاسی لە عێراق چووە قۆناغێکی نوێ وە کە قۆناغی پراکتیزەکردنی تەوافقیەت بوو کە تیایدا هەموو پێکهاتەکان بتوانن پێکەوە بە هاوبەشی دەستەڵاتەکان بەڕێوە بەرن و ببێتە مایەی کەمکردنەوەی ململانێ و دروستکردنی هاوبەشی راستەقینە لە دەستەڵات لە نێوان هەموو پێکهاتەکان. واتە قۆناغی پراکتیزەکردن زیاتر کەوتە ئەستۆی کاراکتەرە ناوخۆییەکان هەرچەندە ئەمریکا تا ٢٠١١ سوپاکەی لە عێراقدا مابوویەوە بەڵام دەستەڵاتی مەدەنی و بەڕێوبردنی وولات بەفەرمی لەدەست عێراقیەکان بوو.

لێرەدا دەتوانین ئەوە بڵێین کە ئەمریکا سەرەتایەکی تیۆری و پراکتیزی دەست پێکرد لە عێراق بۆ ئەوەی لە داهاتوودا پەرەی پێبدرێت و بەرەو پێش ببرێت و هەموو پێکهاتە سەرەکییەکانی عێراق پێکەوە وولات بەڕێوە بەرن و هیچ پێکهاتەیەک پەراوێز نەخرێت، چونکە بەبێ بوونی هەموو پێکهاتەکان لە دەستەڵات و هاوبەشی راستەقینە بەڕێوەبردنی عێراق ئەستەمە، لەبەر ئەوەی دابەش بوونەکە لە ڕووی نەتەوەی و مەزهەبی و زمان و جوگرافیاییەوە کاریگەری تەواوی لەسەر هاوکێشە سیاسیەکان و سیستمی سیاسی دروست کردووە و دەبێت.

بۆیە زۆر پێویستە لێکدانەوەیەکی دروست بکرێت بۆ قۆناغی پراکتیزەکردنی تەوافقیەت و دەستوور و ئەو ڕێکەتنانەی کەلەلایەن پێکهاتە سەرەکییەکانەوە ئەنجام دەدرا بۆ ئەوەی بزانرێت ئایا بە کرداری ئەوە ئەمریکا و نەتەوەیەکگرتووەکان بوون نەیان هێشت دیموکراسی بێتە بوون لە عێراق یان عێراقیەکان خۆیان بوون؟

**دووەم: قۆناغی پراکتیزەکردنی سیستمی سیاسی نوێی عێراق لە ژێر ڕۆشنایی دەستووری نوێدا**

پاش ئەوەی دەستوور پەسەند کرا و کەوتە بواری جێبەجێکردنەوە، عێراقیەکان ڕۆڵیان لەبەڕیوبردنی دامەزراوە سیاسیەکاندا گەورەتر و فراوانتر بوو، لەهەمان کاتدا ئەمریکا ئەوبوارەی بۆ عێراقییەکان بەجێ هێشت، هەرچەندە سوپایەکی گەورەی ئەمریکا تا ٢٠١١ کە تەواوی سوپاکەی لە عێراق کشاندەوە دەستەڵاتێکی باڵای سەربازیان هەبوو لەعێراقدا وکاریگەریان هەبوو لەسەر پرۆسەی سیاسی.

لەم تەوەرەیەدا لایەنی پراکتیزەکردنی دیموکراسی تەوافقی دەخەینە ڕوو کە چۆن کاراکتەرە ناوخۆییەکان لەژێر ڕۆشنایی دەستوورێکی تەوافقی مامەڵەیان کرد لە سێ تەوەرەدا:

١. پراکتیزەکردنی دیموکراسی تەوافقی لە ٢٠٠٦- ٢٠١٠.

٢. پراکتیزەکردنی دیموکراسی تەوافقی لە٢٠١٠-٢٠١٤.

٣. پراکتیزەکردنی دیموکراسی تەوافقی لە ٢٠١٤-٢٠١٨

### ١. پراکتیزەکردنی دیموکراسی تەوافقی لە ٢٠٠٦- ٢٠١٠:

دوای ئەوەی مالکی بەپێی ڕێکەوتنی نێوانە پێکهاتەکان پۆستی سەرۆک وەزیرانی عێراق وەرگرت، چاوەڕوان دەکرا کارنامەی حکومەتەکەی هاوبەشی راستەقینە لە دەستەڵاتدا بەدی بهێنێت و کار بکات بۆ ئەوەی هەموو پێکهاتەکان بەپێی بوونیان هاوبەشیان پێ بکرێت لەدەستەڵاتدا.

ئەوەبوو تەنها بەدابەشکردنی پۆستە وەزارییەکان بەسەر پێکهاتەکاندا ئیکتفای کرد و لەوێوە دەیوست لایەنەکان بە شێوەی شکلی بەشداری پرۆسەی سیاسی ببن. لە کۆیی ٤٠ پۆستی وەزاری (٢٢ شیعە، ١٠ سوونە، ٧ کورد، یەک مەسیحی) کە هەموو پێکهاتەکانی لەخۆی گرت، وەک دابەشکردنی پۆست وەها پیناسە دەکرا کە حکومەتێکە هاوبەشی راستەقینەی تێدایە و لەسەر بنەمای تەوافوق دامەزراوە. (١٧) لەسەرەتای دامەزاندنی حکومەتەکەی مالکی یەوە زاڵمای خەلیل زاد ئەوەی دووپات کردەوە کە ئەو حکومەتە هاوبەشی راستەقینەی دەستەڵاتە لەنیوان لایەنەکان لەسەر بنەمای تەوافق لە بڕیاردان لەسەر بابەتە چارەنووسسازەکان. (١٨) پاشان سوونەکان بەهۆی مامەڵەی مالکی یەوە بایکۆتی حکومەتیان کردو پۆستەکانیان لەلایەن شیعەوە پڕکرایەوە.

بەڵام ئەوەی بەدی کرا هەر لەسەرەتاوە هەنگاوەکانی بۆ بنیاتنانی دەستەڵاتی تاکە کەسی خۆی و پارتەکەی بوو، تەنانەت کاری بۆ پێکهاتەکەی خۆی کە شیعەیە لە پاش کارکردنی بوو بۆ خۆی و حزبەکەی، بۆیە ئاراستەی کارەکانی بەرەوهاوبەشی لە دەستەڵات نەبوو بەڵکو بەرەو دەستەڵاتخوازی تاکەکەسی و حزبی بوو. (١٩) هەر ئەمەش وای کرد کە پاش ماوەیەکی کەم لە دەستەڵاتی مالکی سوونەکان بایکۆتی حکومەتیان کردو ناڕەزایەتی خۆیان راگەیاند بە کارەکانی کە ئاراستەیەکی خراپی وەرگرتووە بەتایبەت لە بارەی مصالحەی نیشتمانی کە سوونەکان لەگەڵ مالکی لەسەری ڕێکەوتبوون. نەک ئەوەندە بگرە صەدرییەکانیش لە حکومەت کشانەوە و نەگەڕانەوە حکومەت چونکە نارازی بوون لە سیاسەتەکانی مالکی کە تاکڕەوی تەواوی پێوەدیار بوو. نەک تەنها صەدرییەکان بگرە مجلسی ئەعلی کە پرۆژەیەکی پێشکەش کردن بۆ دروست کردنی هەرێمی باشوور بۆ شیعەکان مالکی دژی وەستایەوەو ڕێگری لێکرد. (٢٠) تەنها ئەو دوو پێکهاتەیە نارازی نەبوون لە سیاسەتە و کارەکانی مالکی بەلکو کوردیش لەوان زیاتر نارەزایەتی هەبوو بەتایبەت ئەو کاتەی کە مالکی بەنیازی جوڵاندنی هێزبوو بەرەوکوردستان لەناوچەی خانەقین لەسەر کێشەیەک کە لەنیوان هەریمی کوردستان و بەغداد دروست بوو، ئەگەر ڕێگری ئەمریکییەکان نەبوایە ئەوا بێگومان لەو کاتەدا شەڕ دروست دەبوو لەنێوان مالکی و هەرێمدا. ئەمە جگە لەوەی کە ماددەی ١٤٠ و جیبەجێکردنی لەلایەن مالکی یەوە کاری جددی لەسەر نەکراو مامەڵەکردنی ئەو بەو شێوازە یەکێک بوو لە هۆکارەکانی پشتگوێ خستنی ئەو کێشەیە لەو ماوەیەی کە بۆی دانرا بوو تاکۆتای ٢٠٠٧ نەتوانرا جی بەجێ بکرێت.

ئەوەی کە مالکی پشتی پێدەبەست سەرەڕای ئە و پۆستانەی کە خۆی دەستی بەسەردا گرتبوو، دروستکردنی ئۆفیسێکی تایبەت بەخۆی بوو کە لایەنی سەربازی و هەواڵگری وئەمنی لە خۆی دەگرت بۆ ئەوەی لە دەرەوەی وەزرارەتە پەیوەندیدارەکان کاری خۆی بکات و دەستەڵاتی فراوانخوازی خۆی پەرەپێ بدات. (٢١)

ئەمانە و چەندین نموونەی تر لەماوەی خولی یەکەمی دەستەڵاتی مالیک بوونی هەبوو کە بەتەواوەتی جیاواز بوو لەو بنەمایانەی کە دیموکراسی تەوافقی لەسەر دامەزرا بوو. هەرچەندە

ئەو بنەمایانە رەنگدانەوەی هەبوو لەدەستووری عێراقیدا بەڵام هەنگاوەکان و کارەکانی مالکی بەو ئاراستەیەدا نەبوو کە بتوانرێت رەنگدانەوەی ئەو بنەمایانە لەسەر ئەرزی واقیع ببینرێت. ئەڵبەتە هەر یەک لە پێکهاتەکانیش هەندێک لەکارەکانیان بەو ئاراستەیەدا نەبوو کە پشتگیری تەواوی دیموکراسی تەوافقی بێت بەتایبەت سوونەکان کە هەمیشە چاویان لەسەر ئەو دەستەڵاتەبوو کەپێشتر هەیان بوو. ئەم کارانە وای کرد تەنانەت داوای گۆڕینی مالکی بکرێت لە ئەمریکییەکان، بەڵام گۆندالیزا رایس ئەوەی راگەیاند کە ئێوە خۆتان ڕێکەوتوون لەسەری و خۆشتان ئەتوانن لای بەرەن، ئەمریکا نایەتە ناو ئەو کێشەیەوە و کێشەی خۆتانە.

لەمەوە بۆ مان روون دەبێتەوە کە کێشەی دیموکراسی تەوافقی لە قۆناغی یەکەمدا ئەو دنیا بینینەی عێراقییەکان بوو بۆ چۆنیەتی پراکتیزەکردنی دەستەڵات و هاوبەشی دروست کردن. کە زیاتر مۆرکێکی دەستەڵاتخوازی لەخۆی گرتبوو نەک دروست کردنی هاوبەشی راستەقینە. ئەمەش پێچەوانەی ئەوەبوو کە ئەمریکی یەکان رەنگرێژیان بۆ کردبوو کە عێراق بەهاوبەشی بەرێوە ببرێت نەک تاکە کەسێک یان حزبێک یان تەنانەت پێکهاتەیەک بەرێوەی ببات.

## ٢. پراکتیزەکردنی دیموکراسی تەوافقی لە ٢٠١٠-٢٠١٤

پاش ئەوەی مالیکی نەیتوانی زۆرترین کورسی بەدەست بهێنێت لەهەڵبژاردنی ئەنجوومەنی نوینەران لە ساڵی ٢٠٠٩ و ئەیاد علاوی توانی بەسەریدا سەرکەوێت، چونکە مالکی ٨٩ کورسی هێنا و علاوی ٩١ کورسی بەدەست هێنا(٢٢) بەڵام مالکی بەهەوڵی خۆی و پێکهاتەکەی دوای زیاتر لە ١١ مانگ گفتوگۆ توانی هەردوو بەرەی ئەمریکی و ئێرانیش رازی بکات بەوەی کە بۆ جاری دووەم ببێتەوە بەسەرۆک وەزیران بەپێی ڕێکەوتنێک لە نێوان هەر سێ پێکهاتەکەدا و بەچاودێری ئەمریکا و نەتەوەیەکگرتووەکان.

دوای ئەوەی کە دەستەڵاتی وەرگرتەوە بەجۆرێک کاری کرد نەک کەم و کورییەکانی پێشو تری چارەسەر نەکرد بەڵکو بە ئاراستەیەکی خراپتردا مامەڵەی کرد بەتایبەتی کە دوا سەربازی ئەمریکی لە عێراق پاشەکشەی کرد راستەوخۆ هێزی بەکار هێنا بۆ سەرکوت کردنی نەیارەکانی لە سوونە وەک تارق هاشمی (جێگری سەرۆک کۆمار)و رافع عیساوی (وەزیری دارایی) ...هتد. (٢٣)

بەدەر لەوەی سوونەکان زۆر بێزار بوون لە کارەکانی مالیکی، شیعەکانیش بەتایبەتی صەدرییەکان هەڵویستیان توندتر بوو، ئەوە بوو بەیەکجاری لە حکومەت کشانەوە و دژایەتی خۆیشیان بۆ مالکی دەبرِی. کوردیش بەهەمان شێوە نارازی بوو لە سیاسەتەکانی مالکی بەجۆریک هەر یەک لە سەرۆک کۆمار و سەرۆکی هەریم و ئەیاد علاوی و صدر پەیماننامەیەکیان واژوو کرد کە مالکی لاببەن، چونکە ئاراستەی دکتاتۆریەتی وەرگرتووە بەڵام سەرکەوتوو نەبوون لەهەوڵەکەیان. بەجۆرێک مالکی ئەوەی راگەیاند کە دیموکراسی تەوافقی خراپە و دەبێت کار بە سیستمی زۆرینە بکرێت و حکومەتێکی زۆرینە دروست بکرێت. ئەم داواکارییەی مالکی لەوەوە سەرچاوەی گرتبوو کە شیعە زۆرینەیە و مافی ئەوانە دەستەڵاتی تەواویان هەبێت و حکومەتی هاوبەش کارێکی خراپە.

لەراستیدا ئەم داواکارییەی مالیکی بارودۆخەکە خراپتر دەکرد ئەگەر بهاتباو سەرکەوتنی بەدەست بهێنایە، چونکە ئەو کاتە تەنها بەرژەوەندی پێکهاتەی زۆرینە لەبەرچاو دەگیراو و پێکهاتەکانی تر ناتوانن بەرژەوەندییەکانیان بپارێزن. بۆ کۆمەڵگایەکی دابەش بووی وەک عێراق بەسەر سێ پێکهاتەدا بە قوڵی زۆر ئەستەمە تەنانەت دوو

پێکهاتەش دەستەڵات بەڕێوە بەرن چونکە هەرگیز ناتوانن بەرژەوەندی پێکهاتەکانی تر بپارێزن.

سوونەکان کەهەستیان کرد مەترسی گەورە لەسەریانە و هەوڵی لابردنی مالکی شکستی هێناوە، پرۆژەی هەریمی سوونیان هێنایە پێشەوە بۆ ئەوەی هیچ نەبیت هەندیک بەرژەوەندی خۆیان بپارێزن و بەرامبەر بە هەوڵە تاکڕەوییەکانی مالکی بوەستنەوە. لەبەرامبەردا کورد هەڵویستی پۆزەتیڤانەی هەبوو، بەڵام شیعە بەگشتی و نوری مالکی بەتایبەتی بەهیچ شێوەیەک ئەو بابەتەیان بەهەند وەرنەگرت و پشت گوێیان خست. (٢٤) هەر چەندە بەدەستهێنانی ئۆتۆنۆمی بۆ پێکهاتەکان یەکێکە لە بنەما سەرەکی یەکانی دیموکراسی تەوافقی و لە دەستووریشدا ئەوە بەروونی هاتووە و یاسای تایبەتیشی بۆ دەرچووە لەساڵی ٢٠٠٨ ەوە.

هێندە نارەزایەتییەکان زۆر بوون ناوچە سونییەکان خۆپیشاندانی مەدەنیان دەست پێکرد بۆ ماوەیەکی دور و درێژ بەڵام هیچ ئەنجامیکی پۆزەتیڤانەی نەبوو لە لایەن حکومەتیشەوە گوێیان بۆ نەگیرا.

ئەمجۆرە لە پراکتیزە ردنی دەستەڵات نەک بوەیە بەربەرست لەبەردەم دیموکراسی تەوافقی بەڵکو یەکێک بوو لە هۆکارەکانی سەرهەڵدانی داعش و داگیرکردنی بەشێکی زۆری خاکی عێراق و نەهامەتییەکی گەورە بەسەر گەلی عێراقەوە.

لە کۆی هەردوو خولی مالکی خودی عێراقییەکان بەربەستیان دروستکرد لەبەردەم جێبەجێکردنی دیموکراسی تەوافقی بەو شێوەیەی کە لەدەستووردا هاتووە و ڕێکەوتنیان لەسەر کردبوو بەتایبەتی هاوبەشی لە دەستەڵات و ئۆتۆنۆمی بۆ پێکهاتەکان ئەوە سەرەرای ناهاوسەنگی لە دابەشکردنی پۆستەکاندا بەتیابەتی پۆستە بالاکان هەرچەندە کە ڕێکەوتنی سەرکردەکانی لەسەر کرابوو بەڵام ئەو ریکەوتنانە نەتوانرا لەسەر ئەرزی واقیع بەرجەستە بکرێت.

### ٣. پراکتیزەکردنی دیموکراسی تەوافقی لە ٢٠١٤-٢٠١٨:

دانانی عەبادی یەکێک بوو لەو هەنگاوانەی کە پێکهاتەی شیعە لەبەرامبەر لادانی مالکی ئەنجامیاندا و پێکهاتەکانی تریش هەمان هەڵویستیان هەبوو لەسەر لادانی مالکی بەکەسێکی تر لە پێکهاتەی شیعە و ئەوانیش ڕێکەوتن کە عەبادی سەرۆکایەتی حکومەت وەربگرێت بەو مەبەستەی کە ئەو بتوانێت هاوبەشی لەدەستەڵات بهێنێتە بوون و عێراق بەرەو قۆناغێکی تر بەرێت. بەتایبەت کە داعش مەترسییەکی گەورە بوو لەسەر عێراق و ناوچەکە و پێویستی زیاتری بەوە هەبوو کە هەموو پێکهاتەکان هاوبەشی راستەقینەیان هەبێت بۆ ئەوەی سەرکەوتن بەدەست بهێنێت.

لەگەڵ ئەوەشدا کە پۆستە باڵاکان تارادەیەک بە هاوسەنگی بەسەر پێکهاتەکاندا دابەشکرا، بەڵام پاش ماوەیەکی کورت عەبادی بەناوی پرۆژەی چاکسازی چەندین وەزارەت و وەزیری لابرد و بەوەش لاسەنگییەک دروست بوو بەتایبەت کە شیعە زیاتر لە ٦٠ ٪ پۆستە باڵاکانی بۆ خۆی برد کە لەسەردەمی مالکیدا ڕێژەکە تەنها ٥١٪ بوو. لەهەمان کاتدا پۆستی جێگرانی سەرۆک کۆمارییشی لابرد کە پاش ماوەی ساڵێک دادگای فیدراڵی بریارەکەی بەنایاسایی داناو گەڕانەوە پۆستەکانی خۆیان. ئەم هەنگاوەی عەبادی ئەوەی لێدەخوینرایەوە کە مامەڵە و کارەکانی بە هەمان ئاراستەی سەردەمی مالیکدا دەڕوات و جیاوازیەکی ئەوتۆیی نەهێنایە کایەوە کە بتوانرێت هاوبەشی راستەقینە لە دەستەڵات بێتەبوون، هەنگاویک بێت بەرە وئەو دیموکراسیەی کە لە دەستوردا رەنگی دابویەوە وئەمریکا سەرەتایەکی تیۆری و پراکتیکی بۆ دارشت لەدوای رووخانی رژێمی بەعسەوە.

عەبادی یەکێک لە پاساوە هەرە بەهێزەکانی ئەوەبوو کە لەناوبردنی داعش ئەولەویەیتی کارەکانێتی و پاشان هەنگاوی جددی تر بۆ ئارامی

و پێکەوەی بەشێوەی سازان دێنێتە بوون. ئەوەی دەتوانرێت ببینرێت لەسەردەمی عەبادی بارودۆخی عێراق بەجۆرێک بوو زۆر باسی تەوافق نەدەکرا، چونکە سوونە زۆربەی ناوچەکانی لەلایەن داعشەوە دەستی بەسەردا گیرابوو، کورد هەوڵی ئابووری سەربەخۆیی دەدا و کاری بۆ ریفراندۆم دەکرد، شیعەش لەرێگەی حەشدی شەعبیەوە هەوڵی بەرپەرچدانەوەی داعشی دەدا و هێزێکی نوێی بۆخۆی دروست کرد، بۆ یە لە بارودۆخێکی لەو شێوەیەدا زۆر ئەستەمە بتوانرێت باسی دیموکراسی و تەوافق بکرێت.

لەهەمان کاتدا عەبادی هەمان داوای مالکی بۆحکومەتی زۆرینەی بەرزکردەوە و لە ئێستاشدا هەنگاوەکانی بەوئاراستەیەیە بە جۆرێک لە ئێستادا تەنها کوردە کە داوای سازان و حکومەتی هاوبەشی راستەقینەدەکات، بەڵام لایەنە شیعەکان کەبراوەی سەرەکی هەڵبژاردنن و سەرۆک وەزیرانیش بۆ ئەوان دەبێت هیچ لایەنێکیان باسی سازان و حکومەتی هاوبەش ناکات و کار بۆ جۆرێک لە حکومەتی زۆرینە دەکەن کە پێکهاتەکانی تریش بوونی خۆیانی تێدا بەدی بکەن و لەوێوە ئارامی و سەقامگیری بۆ عێراق بگێرێتەوە.

### پێنجەم: بەرئەنجام

لەوەی باسمان کرد بۆمان روون دەبێتەوە کە بەکرداری و لە بواری پراکتیزەییدا ئەوە ئەمریکا نەبووە بۆ وەلا نان و جیبەجێنەکردنی دیموکراسی تەوافقی لە عێراقدا کاری دەکرد، بەڵکو هێزە ناوحۆییەکان بەتایبەت ئەوانەی دەستەڵاتیان هەبووە بە جۆرێک مامەڵەیان کردووە کە پێچەوانەی تەواوی بنەماکانی سیستمی سازان بووە.

سەرکردە دەستەلاتدارەکان ئیرادەیان نەبووە کە عێراق بەرەو دیموکراسی ببەن و ئایندەیەکی باشتری بۆ بەدی بهێنن بەڵکو هەم باوەڕیان پێی نەبووە وهەم لەپراکتیزیشدا خراپ مامەڵەیان کرد.

بوونی ئەمریکا لەسەرەتای ٢٠٠٣ تا ئەو کاتەی کە بەتەواوەتی دوا سەربازی لە عێراق کشاندەوە هاوبەشی لە دەستەڵات و سازانی لە نێوان لایەنەکان باشتر بوو لە دوای ئەوەی کە ئەمریکا نە سەربازەکانی لە عێراق بوو نەخۆیشی دەیویست بێتە ئەو مەیدانەوە و کاری بۆ بکات. ئەمەشە ئەو راستەیە دەسەلمێنێت کە بەکردار ئەمریکا وەک لایەنێکی دەرەکی پێویست بوو تا ئەو کاتەی کە گەرەنتی ئەوە هەبوایە کە کاراکتەرە سیاسی و مەزهەبی یە ناوخۆییەکان نەدەبوون بە مەترسی بۆ سەر پرۆسەی سیاسی و سازان و هاوبەشی راستەقینە لەدەستەڵاتدا.

ئەوەی پێویستە بگوترێت ئەوەیە ئەمە بۆ کەیسی عێراق و کەسی تریش راستە، چونکە گرفتەکە لە سیستمەکەدا نییە هێندەی گرفتەکە خودی کاراکتەرەکانە بەو دید و مامەڵەیەیەی کە ئەنجامی دەدەن لەگەڵ ئەو پرۆسەیەدا. چونکە سیستمی تەوافقیەت لە زۆر دەوڵەت جێبەجێکراوە و بەرهەمی باشی هەبووە لە قۆناغێ لە قۆناغەکانی پەرەسەندنی سیاسی ئەو دەوڵەتانە. ئەمەش بۆ عێراق راست دەبوو ئەگەر بهاتبایە ئیرادەیەکی بەهێز هەبووایە بەئاراستەی دروست کردنی هاوبەشی راستەقینە لەدەستەڵاتدا.

وەک رەهەندێکی ستراتیجی پێویستە دووبارە پراکتیزەکردنی دەستوور و تەوافقیەت لە ژێر چاودێری نەتەوەیەکگرتووەکان یان دەوڵەتانی زلهێزی دەرەکی بێت و عێراق بخرێتە ژێر جۆرێک لەچاودێری توند تا ئەو کاتەی کە پرۆسە سیاسیەکە رێرەوی تایبەتی خۆی دەگرێت. چونکە دەرکەوتووە ئەو دەوڵەتانەی کە چاودێری دەرەکیان لەسەر بووە بۆ جێبەجێکردنی تەوافقیەت سەرکەوتنیان بەدەست هێناوە و دەکرێت لە کەیسی عێراقدا وەک لە ئەزموونی خۆیدا دەرکەوتووە لایەنی دەرەکی کاریگەری پۆزەتیڤانەی هەبێت لەسەر پرۆسەکە.



## پەراوێزەکان

١. دیموکراسی تەوافقی جۆرێکە لە جۆرەکانی دیموکراسی کە ئەو دەوڵەتانەی دابەش بوونی نەتەوەی ، یان ئیتنیکی ، یان زمان یان جوگرافی قوڵیان هەیە دەتوانن پەیڕەوی دەکەن بۆ ئەوەی ئارامی و سەقامگیری بەرپا ببێت و ململانێیەکان کەمتر ببێتەوە تا بتوانرێت بەرژەوەندی هەموو پێکهاتە جیاوازەکان لەبەرچاو بگیرێت. بەپێچەوانەی دیموکراسی زۆرینە کە تیایدا زۆرینە حوکم دەکات و کەمینەش ڕۆڵی نییە لە پرۆسە سیاسیەکاندا بەتایبەت دامەزراوە سیاسیەکان. ئەرێنت لایپهارت زۆر بە ڕوونی ئەوەی خستۆتە ڕوو کە دەوڵەتانێک لەو جۆرە بن پێویستە چوار بنەمای سەرەکی تەوافقیەت هەیە لەبەر چاوی بگرن کە ئەوانیش بریتین لە ( هاوپەیمانیەتیەکی گەورە لە نێوان لایەنەکاندا کە لایپهارت ئەمەی بەیەکێک لەسەرەکیترین بنەماکان داناوە، نوێنەرایەتی ڕێژەیی لە دامەزراوە سیاسیەکاندا هەر پێکهاتەیەک بە پێی ڕێژەی خۆی، مافی ڤیتۆ بۆ هەموو پێکهاتەکان، ئۆتۆنۆمی بۆ هەموو پێکهاتەکان). ئەم سیستمە لەلایەن شارەزایان و توێژەرانی بوارەکەوە پەرەی پێدراوە و باس و خواسی تێۆری زۆری لەسەرە و بەردەوامیش کاری لەسەر دەکرێت.

٢. بە پێی بڕیاری ژمارە ١٤٨٣ ئەنجوومەنی ئاسایش ئەمریکا وەک هێزێکی داگیر کەر ناسراوە لەو پرۆسەیەدا و مامەڵەی هێزێکی داگیرکەر لەگەڵدا دەکرا لەلایەن نەتەوەیەکگرتووەکانەوە. بۆ ئێمەی کورد ڕۆخانی ڕژێمی بەعس یەکێکە لەوەرچەرخانە گرنگەکانی عێراق و دوای ڕووخانی ئەو ڕژێمە ستەمکارە کورد توانی جۆرێک لە ئاسوودەی بۆ بگەڕێتەوە کە مەترسی ئەو هێزە درەندەیەی لەسەر نەماوە.

3.Bremer, L. Paul and McConnell, Malcolm, My Year in Iraq: The Struggle to Build a Future of Hope (New York: Simon & Schuster, 2006). P.12

4.Khalilzad, Zalmay, The Envoy: From Kabul to the White House, My Journey through a Turbulent World, First edition (New York: St. Martins Press, 2016). P.151

5.“CPA Doc./REG/ 09,” June 9, 2004.

6.Bremer, L. Paul and McConnell, Malcolm, My Year in Iraq. P.83-84

7.کورت کراوەی(TAL) بریتی یەلە The Transitional Administrative Law ئەگینا ناوە تەواوەکەی بەم جۆرەیە The Law of Administration for the State of Iraq for the Transitional Period

8.Benomar, Jamal, “Constitution-Making After Conflict: Lessons for Iraq,” Journal of Democracy 15, no. 2 (2004): 81–95.

٩. بڕوانە بەندەکانی تاڵ کەچۆن ئەو بابەتانەی لەخۆ گرتووە.

10. Sharon, Otterman, “IRAQ: The Interim Government Leaders” (council on Foreign Relations, 2004), http://www.cfr.org/iraq/iraq-interim-government-leaders/p7664#.

١١. معد فياض, ”بغداد: أعضاو مجلس الحكم المنحل يستعدون للانتقال الي المجلس الوطني المؤقت,“ الشرق

approach/.

20. Visser, Reidar, A Responsible End?: The United States and the Iraqi Transition, 2005-2010 (Charlottesville, VA: Just World Books, 2010).

21. Dodge, Toby, Iraq. P. 128

22. IHEC, http://www.ihec.iq/ar/index.php/result.html

23. Morse, Dan and Asaad Majeed, "Iraq Prime Minister Al-Maliki Challenges Restive Provinces.» https://Www.washingtonpost.com/World/Middle_east/Iraq-Premier-Nouri-Al-Maliki-Chides-Restive-Provinces/2011/12/24/gIQAzegYFP_story.html," Washington Post, December 24, 2011.

24. Visser Reidar, "In Salahaddin, a Confused Federalism Bid" (Iraq and Gulf Analysis,https://gulfanalysis.wordpress.com/2011/10/27/in-salahhadin-a-confused-federalism-bid/, October 7, 2011).

## REFERENCES

BBC. "New Iraqi Government Members, Http://News.bbc.co.uk/1/Hi/World/Middle_east/4493999.stm," August 5, 2005.

Benomar, Jamal. "Constitution-Making After Conflict: Lessons for Iraq." Journal of Democracy 15, no. 2 (2004): 81–95.

Bremer, L. Paul, and McConnell, Malcolm. My Year in Iraq: The Struggle to Build a Future of Hope. New York: Simon & Schuster, 2006.

CNN. "Iraqs New Unity Government Sworn in." World. http://edition.cnn.

الاوسط, June ١٥, ٢٠٠٤, ٩٣٣١ edition.

12. "CPA Doc./REG/ 96, Elections Law," June 15, 2004.

13. Dodge, Toby, Iraq: From War to a New Authoritarianism, Adelphi 434–435 (London: The International Instit معد فياض, "بغداد: أعضاء مجلس الحكم المنحل يستعدون للانتقال الي المجلس الوطني المؤقت," الشرق الاوسط ute for Strategic Studies, 2012). P.215. And see: http://psephos.adam-carr.net/countries/i/iraq/iraq2005.txt , http://www.ihec.iq/ar/index.php/alwataneya.html

14. BBC, "New Iraqi Government Members, Http://News.bbc.co.uk/1/Hi/World/Middle_east/4493999.stm," August 5, 2005.

15. Katzman, Kenneth, "CRS Report for Congress Doc. RS21968," November 20, 2006, http://fpc.state.gov/documents/organization/76838.pdf.

16. "Minutes of the Meetings, The Constitutional Drafting Commission, Second Meeting," May 25, 2005.

17. CNN, "Iraqs New Unity Government Sworn in," World (http://edition.cnn.com/2006/WORLD/meast/05/20/iraq.main/index.html?eref=sitesearch, May 20, 2006). In addition, see Katzman Kenneth, 2005, Iraq: Elections, Government, and Constitution, CRS Report for Congress. With some other websites.

18. Khalilzad, Zalmay, The Envoy. P. 266

19. Gokpinar, Ali, "Power Sharing in Iraq: Liphartian or Horowitzian Approach?," April 16, 2012, http://www.aligokpinar.com/power-sharing-in-iraq-lipjhartian-or-horowitzian-

Morse, Dan, and Asaad Majeed. “Iraq Prime Minister Al-Maliki Challenges Restive Provinces.» https://Www.washingtonpost.com/World/Middle_east/Iraq-Premier-Nouri-Al-Maliki-Chides-Restive-Provinces/2011/12/24/gIQAzegYFP_story.html.” Washington Post, December 24, 2011.

Sharon, Otterman. “IRAQ: The Interim Government Leaders.” council on Foreign Relations, 2004. http://www.cfr.org/iraq/iraq-interim-government-leaders/p7664#.

Visser, Reidar. A Responsible End?: The United States and the Iraqi Transition, 2005-2010. Charlottesville, VA: Just World Books, 2010.

Visser Reidar. “In Salahaddin, a Confused Federalism Bid.” Iraq and Gulf Analysis,https://gulfanalysis.wordpress.com/2011/10/27/in-salahhadin-a-confused-federalism-bid/, October 7, ٢٠١١.

فياض, معد. ”بغداد: أعضاو مجلس الحكم المنحل يستعدون للانتقال الي المجلس الوطني المؤقت.“ الشرق الاوسط. June ١٥, ٢٠٠٤, ٩٣٣١ edition.

com/2006/WORLD/meast/05/20/iraq.main/index.html?eref=sitesearch, May 20, 2006.

“CPA Doc./REG/ 09,” June 9, 2004.

“CPA Doc./REG/ 96, Elections Law,” June 15, 2004.

Dodge, Toby. Iraq: From War to a New Authoritarianism. Adelphi 434–435. London: The International Institute for Strategic Studies, 2012.

Gokpinar, Ali. “Power Sharing in Iraq: Liphartian or Horowitzian Approach?,” April 16, 2012. Http://www.aligokpinar.com/power-sharing-in-iraq-lipjhartian-or-horowitzian-approach/.

Katzman, Kenneth. “CRS Report for Congress Doc. RS21968,” November 20, 2006. http://fpc.state.gov/documents/organization/76838.pdf.

Khalilzad, Zalmay. The Envoy: From Kabul to the White House, My Journey through a Turbulent World. First edition. New York: St. Martins Press, 2016.

“Minutes of the Meetings, The Constitutional Drafting Commission, Second Meeting.,” May 25, 2005.

# کاریگەری ئایین وەك بەشێکی فەرهەنگی کۆمەڵگا لەسەر دیمکوکراتیزەبوون

## کۆمەڵگای هەرێمی کوردستان بە نموونە






**شەماڵ ئەحمەد ئیبراهیم**

ماستەر لە زانستە سیاسییەکان مامۆستای زانکۆ

ئەو بنەمایانەی کە فەرهەنگی کۆمەڵگا پێکدەهێنن کاریگەری ڕاستەخۆ وناڕاستەوخۆیان دەبێت لەسەر ڕەوشی جوڵەی کۆمەڵگا، بە ئەندازەیەک کە لە قۆناغێک لە قۆناغە مێژووییەکاندا، دەبنە فاکتەر یان لەمپەر لەبەردەم هەڵکشان یان داکشانی بزوتنەوە کۆمەڵایەتییەکان، گومان لەوەدا نییە کە ئایین وەک چەمکێکی گشتی کە کاریگەری گەورەی هەیە لەم بوارەدا، ئەم ووتارە زیاتر باس لە کاریگەری و پێگەی هێزە سیاسی یە ئیسلامییەکانی هەرێمی کوردستان دەکات لە جوڵەی کۆمەڵایەتی بەرەو دیموکراسی لە هەرێم، هەوڵی دۆزینەوەی وەڵامی گونجاو دەدات بۆ ئەم پرسیارانەی خوارەوە:

- تا چەند هێزە سیاسی یە ئیسلامییەکانی هەرێم بەشدارن لە پرۆسەی دیموکراتیزەبوونی کۆمەڵگای کوردەواری دا؟

- ئایا ئەم هێزە سیاسییە ئیسلامییانە سوودمەند بوون لە ڕێکارەکانی پرۆسەی دیموکراسی؟ یان نەخێر ؟

- ڕۆڵی هێزە ئیسلامییەکان لە دیموکراتیزەبوونی سیستەمی سیاسی هەرێمی کوردستان لە چ ئاستێکدایە؟

گرنگی ئەم بابەتە دەگەڕێتەوە بۆ خوێندنەوەیەکی کۆمەڵایەتی سیاسی بۆ پێگەو ڕۆڵی هێزە سیاسییە ئیسلامییەکان وەک هێزێکی کاریگەر لەسەر ڕەوشی سیاسی هەرێمی کوردستان و بەشداریان لە پرۆسەی سیاسی دا، لە لایەکی دیکەوە تیشک خستنە سەر ڕۆڵی ئەو لایەنانە لە چەمکی دیموکراتیزە بوونی کۆمەڵگای هەرێمی کوردستان.

بۆ گەیشتن بە وەڵامی ئەم پرسیارانە و بەدیهێنانی گرنگی ووتارەکە لەو گریمانەیەوە دەست پێدەکەین کە هێزە ئیسلامی یە سیاسییەکان کاریگەرێتی نەرێنیان لەسەر دیموکراتیزە بوونی هەرێمی کوردستان هەیە پاڵپشت بە کارتێکردنیان بە فەرهەنگی کرانەوەی بانگەوازی ئیسلامی جیهانی.

لەم ووتارەدا بنکۆڵکارییەدا بۆ ڕۆڵ و پێگەی هێزە ئیسلامییەکان پشت دەبەستین بە میتۆدی بنکۆڵی حاڵەتی هێزە سیاسی یە ئیسلامییەکان، و دابەشی دەکەین بە دەستپێکی زاراوەکان و بەشی یەکەم کە بریتی یە لە دیموکراتیبوون لە ئەزموونی حوکمڕانی هەرێم وبەشی دووەم کە بریتی یە لە ڕۆڵی هێزە ئیسلامییەکانی کوردستان.

**دەسپێک: ناساندنی زاراوەکان**

لەم دەسپێکەدا چەند زاراوەیەک پێناسەدەکەین بۆ ئەوەی هەریەک لەو زاراوانە لە دوو توێ ی ئەم ووتارەدا کە بەکاردێن مەبەست لەو بەکارهێنانەی دیار بێت کە بریتین لە: هێزە ئیسلامییە سیاسییەکان، دیموکراتیزە بوون، بانگەوازی ئیسلامی، ڕۆڵ و پێگەی هێزە سیاسییەکان، ئەو بوارە زەمەنەی کە ووتارەکە دەربارەی دەدوێ.

**یەکەم**: هێزە سیاسی یە ئیسلامییەکان، هەرێمی کوردستان وەک تەواوی جیهانی ئیسلامی ئەزموونی هزری ئیسلامی بەخۆیەوە بینیوە، لە ناوەڕاستەکانی سەدەی بیستەوە بە شێوەیەکی گشتی دوو ڕەوتی ئیسلامی لەناو کوردستاندا کاریگەرییان لە جوڵەی کۆمەڵایەتی هەبووە کە بریتی بوون لە ڕەوتی ئیسلامی سیاسی، وڕەوتی ئیسلامی کۆمەڵایەتی، کە یەکەمیان بە ئیخوان موسلمین و دووەم بە ڕەوتی تەسەوف دەناسرێتەوە، دواتر ڕەوتی سیاسی ئیسلامی لە ئیخوانەوە، بزووتنەوەی ئیسلامی و بزووتنەوەی ڕاپەڕین و یەکگرتووی ئیسلامی وچەند هێزێکی سیاسی دیکەیان لێجیادەبێتەوە و ڕەوتە کۆمەڵایەتییەکەی ئیسلامی بە هەمان شێوە بزافی سەلەفی بە هەموو بۆچوونەکانیەوە وبزافی تەسەوف بە تەریقەتە جیاوازییەکانیەوە دروست دەبن، ئەوەی مەبەستی ئێمەیە لەم ووتارەدا بریتی یە لە ڕەوتی سیاسی و لەناو ڕەوتی سیاسیدا هەریەک لە یەکگرتووی ئیسلامی و کۆمەڵی ئیسلامی و بزوتنەوەی



# لایەنە سیاسییە ئیسلامییەکانی هەرێم بەشێك بوون لە پڕۆسەی دیمکراتیزەبوون و ڕۆڵی بەشدار یان نەیاریان گێڕاوە لەو پڕۆسەیەدا

ئیسلامی یە، لەبەر ئەوەی ئەم هێزە سیاسییانە بە شێوەیەکی ڕاستەخۆ بەشداربوون لە پرۆسەی سیاسی هەرێمی کوردستان.

**دووەم**: دیموکراتیزەبوون، بە شێوەیەکی گشتی دەتوانین بڵێن کە دیموکراتیزە بوون بریتی یە لە قۆناغێکی پێش دیموکراسی کە تیایدا لە ڕێگای گۆڕانکاری لە ڕێکارەکانی حوکمڕانی لەناو سیستەمی سیاسی، یان گۆڕینی دەستەبژێری سیاسی حوکمڕان یان سەرهەڵدانی بزافی کۆمەڵایەتی یەوە سیستەمی سیاسی لە قۆناغێکی نا دیموکراسی یەوە دەگوازێتەوە بۆ قۆناغێکی دیموکراتی ناکامڵ لە ڕێگای برەو دان بە ڕێکارەکانی دیموکراسی و بەدیهێنانی پرنسیپە سەرەکییەکانی وەک ئازادی و یەکسانی و دادپەروەری، بەڵام ئەم قۆناغە مەترسی هەڵگەڕانەوەی لەسەرە لە کاتێکدا کە بزافتە سیاسی ویاسای و کۆمەڵایەتییەکان لە ئاستی داخوازییەکاندا نەبن بەوەی کە جارێکی دیکە تاکرەوی لە پەیرەو کردنی دەسەڵات ببێتەوە مۆتەکەی کۆمەڵایەتی.

**سێیەم**: بانگەوازی ئیسلامی، بریتی یە لەو پرۆسەیەی کە تیایدا هێزێکی سیاسی تۆکمەو ڕێکخراو پەیامە کۆمەڵایەتی و ئابووری و سیاسییەکانی ئیسلام لە دوو توێی هێزێکی سیاسی و بەنامەیەکی سیاسی وەک جێگرەوەی بەرنامەکانی دیکە دەخاتە بواری کاری سیاسی یەوە بەمەبەستی گەیشتن بە دەسەڵات، بەواتایەکی دیکە هەر بانگەوازێکی ئیسلامی مەبەستی گەیشتن نەبێت بە دەسەڵات ناچێتە چوار چێوەی ئەم ووتارەوە.

**چوارهەم**: بواری زەمەنی ووتار، ئەم ووتارە کاردەکات لەسەر ڕۆڵ و پێگەی هێزە سیاسییەکانی هەرێمی کوردستان لە ماوەی دوای هەرەس هێنانی ڕژێمی بەعس لە دوای ٢٠٠٣ تا دوا ئەنجامەکانی هەڵبژاردنی پەرلەمانی عێراق لە ١٢ ی ئایاری ٢٠١٨.

### بەشی یەکەم
### تایبەتمەندییەکانی دیموکراتیزەبوون لە ئەزموونی حوکمڕانی هەرێم

ئەزموونی کرانەوە بە ڕووی دیموکراسی دا لە هەرێمەی کوردستان سەرەتاکانی دەگەڕێتەوە بۆ دوای وەدەرنانی هێزە سەربازییەکانی حکومەتی بەعس لە هەرێم لە سەرەتای نەوەدەکانی سەدەی ڕابوردوو، لەم ئەزموونەدا هێزە سیاسی یە ئیسلامییەکان و لەیەکەم ئەزموونی هەڵبژاردنی هەرێمی کوردستان بزووتنەوەی ئیسلامی نوێنەرایەتی کرد، ئەمەسەرەتای ئەزموونی بەشداریکردنی سیاسی کارای هێزە ئیسلامی یە سیاسییەکان بوو لە هەرێمی کوردستان و بەڵام بەهۆی ئەو ڕێکارە یاساییانەی تایبەت بە هەڵبژاردن و بەدەست نەهێنانی ڕێژەی دیاریکراو و نەتوانرا وەک هێزێکی سیاسی ئیسلامی بەشداری کارایان لە پرۆسەی حوکمڕانی هەرێمی کوردستاندا هەبێت، بەڵام لە کابینە یەک لەدوا یەکەکانی حکومەتی هەرێم لە پرۆسەی حوکمڕانیدا بەشداربوون، بە شێوەیەکی کاریگەرتر لە دوای پرۆسەی ئازادی

عێراق وپێکهێنانی ئەنجومەنی حوکم هێزە سیاسی یە ئیسلامییەکانی هەرێم نوێنەرایەتییان  لە ناو ئەنجومەندا هەبوو، هەر وەک سەرجەم هێزەکانی دیکەی ناو هەرێم، هێزە ئیسلامییەکان بە تایبەتی هەریەک لە یەکگرتووی ئیسلامی و کۆمەڵی ئیسلامی بەشداری کارا و بەرچاویان هەبووە لە پرۆسەی سیاسی وحوکمرانی هەریەک لە عێراق و هەرێمی کوردستان. ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە پرۆسەی دیموکراتیزەبوون لە هەرێمی کوردستان سەرەتایەکی دیاریکراوی هەبووە، ئەمەش وا دەکات کە تایبەتمەندییەکانی ئەم ئەزموونە لەم چەند خاڵەی خوارەوەدا دیاری بکەین:

تایبەتمەندی یەکەم: فۆرمی دیموکراتیزەبوون لە هەرێمی کوردستان، سەرەتاکانی پرۆسەی دیموکراتیزە بوون لە هەرێمی کوردستان لە رێگای نارەزایەتی جەماوەری یەوە لە سەرەتای نەوەدەکانی سەدەی رابوردوو دەستی پێکرد، بەڵام ئەم دەستپێکردنە لە قۆناغی پەرچدانەوەی لە ئەزموونی حوکم کردندا شکستی هێنا بە ئەندازەیەک کە بووە هۆی سەرهەڵدانی شەری ناوخۆی نێوان هێزە سیاسییەکان و لەم شەرەشدا هێزە سیاسی یە ئیسلامییەکان بەشداربوون، بەڵام لە دوای لاوازبوونی تەواوی حکومەتی عێراق و هاتنە ناوەوەی هێزەکانی هاوپەیمانان لایەنی دەرەکی بە نوێنەرایەتی وویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا و لە چوارچێوەی فۆرمی نوێی رۆژهەڵاتی ناوەراست جارێکی دیکە دیموکراتیزەبوون هەنگاوی نوێ ی بە خۆیەوە بینی، ئەم جارە ئەم پرۆسەیە لە چوارچێوەی لۆکاڵی هەرێم دەرچوو، بەسترایەوە بە پرۆسەی دیموکراتیزەبوونی تەواوی عێراق و لە چوارچێوەیەکی نێودەوڵەتیدا خۆی بینییەوە،

تـــایبەتمەنـدی دووەم: قەتیســبوونی دیموکراتیزەبوون لە چوارچێوەی رێکارە دیموکراتییەکان، یەکێکی دیکە لە تایبەتمەندییەکانی دیموکراتیزەبوونی سیستەمی سیاسی هەرێمی کوردستان بریتییە لە مانەوەی تەنیا لە چوارچێوەی چەند رێکارێکی تایبەتدا کە زیاتر رووپۆشی دیموکراتین وەک لەوەی جەوهەری دیموکراتی بوون بن، بەشداری سیاسی لە سنورێکی دیاریکراودا چاوەرێکردنی بەدەستهێنانی دەستکەوت لە بەرامبەر بەشداریکردنی سیاسی و مانەوەی ئەم بەشداریکردنە لەسەر توانا و هەژموونی هێزە سیاسییەکان، ئەم تایبەتمەندییەو لەوە هات کە تەواوی کۆمەڵگای کوردەواری دابەشبونێکی ئاسۆی دابەش بوون بەسەر پارت و هێزە سیاسییەکان و لەمەشدا لایەنە ئیسلامییەکان بەشدار بوون، بە ئەندازەیەک کە شوناسی پارت بوون شوناسی کەسەکان بوو وە جیاکارییەکی تەواوەتی دروست کرد لە نێوان پێکهاتەکاندا کە ئەمە تەواو جودایە لەگەڵ مەبەستە گشتییەکانی دیموکراسی کە بریتی یە لە یەکسانی هەمووان.

تایبەتمەندی سێیەم: پاشەکشەکردن لە رێکارە دیموکراسییەکانی دیموکراتیبوونی کۆمەڵگا، ئەزموونی سیاسی هەرێمی کوردستان بە هۆی هۆکارە ناوخۆیی و دەرەکییەکانەوە کە بەشێکی زۆریان ئاشکرا و روونە لای خوێنەر تا ئەم ساتەی ئێستاش لە هەنگاوی پاشەکشێی دیموکراتیزەبووندایە، وە ئەوەی کە تەنها بۆتە راگری مانەوەی پرۆسەی دیموکراتیزەبوون لە هەرێمی کوردستان بریتی یە لە بوونی فرە حیزبی و بەشداری ئەم فرەییە لە پرۆسەکانی هەڵبژاردن و لەم رووەوە سیستەمی هەڵبژاردنی هەرێم کە سیستەمی رێژەییە رۆڵی بەچاوی گێراوە، بە ئەندازەیەک کە هیچ پارتێکی سیاسی لە دوای ئەزموونی دوو ئیدارەیی نەیتوانیوە حکومەت بەشێوەیەکی تاک لایەن پێک بهێنێت، بەڵام لە بوارەکانی دیکەی دیموکراسی وەک یەکسانی ودادپەروەری دیموکراتیزەبوون ئەزموونێکی ناجۆرە بە داخوازییەکانی کۆمەڵگا.



# بانگەوازی ئیسلامی لە هەرێمی کوردستان کارتێکراوە بە بانگەوازی جیهانی ئیسلامی و هەر هەڵکشان یان داکشانی دووەم کاریگەری هاوتای لەسەر هێزە سیاسییە ئیسلامییەکانی هەرێم دەبێت.

**بەشی دووەم**

**ڕۆڵی هێزە ئیسلامییەکان لە پرۆسەی دیموکراتیزەبوونی هەرێمی کوردستان**

لە میانەی کاری سیاسی لایەنە سیاسیی یە ئیسلامییەکانی کوردستان و لەو ماوەیەدا کە ووتارەکە چارەسەری دەکات لە هەرێمی کوردستان ڕۆڵی ئەو لایەنانە لە سێ بواری سەرەکیدا دەرکەتوون کە بریتی بوون لە ڕۆڵی بەشدار و نەیار و فاکتەری هاوسەنگی لە پرۆسەی سیاسی هەرێمی کوردستان و لە خوارەوە تایبەتمەندییەکانی هەرسێ بوارەکە باس دەکەین:

بواری یەکەم: ڕۆڵی بەشدار، لایەنەسیاسییە ئیسلامییەکانی هەرێم لە پرۆسەی سیاسی هەرێمدا ڕۆڵی بەشداریان گێڕاوە بە هەردوو ڕەگەزی بەشدار لە پرۆسەی سیاسی و حوکمڕانی هەرێم، نمونەی بەشدار لە پرۆسەی سیاسی دا بریتی یە لە بەشداریکردنی هەر سێ لایەنی سەرەکی بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ لە پرۆسەکانی هەڵبژاردنی تایبەت بە ئەنجومەنی نوێنەران و ئەنجومەنی پارێزگاکانی هەرێم، چەند مەبەستێکی سەرەکی لەو بەشداریکردنە دەرکەوتوون و لەوە سەلماندنی بوونی هێزی سیاسی ئیسلامی لەناو پرۆسەی سیاسیدا، هەوڵدان بۆ بەدەستهێنان و پارێزگاریکردن لە پێگەی جەماوەری لایەنەکان، لە هەمانکاتدا ئاوێتە بوونی ئەو هێزانە لە ڕێگای کەناڵەکانی پەیوەندی و کلتوری یەوە بە تەواوی جەماوەر وناساندنیان وەک هێزێکی کاریگەر لەسەر گۆڕەپانی سیاسی هەرێم، لە لایەکی دیکەوە هەمان لایەنە سیاسییەکان بەشداربوون لە پرۆسەی حوکمڕانیدا لە ڕێگای بەشدارییان لە دامەزراوە فەرمییەکانی حکومەتی هەرێمی کوردستان و لەم ڕووەشەوە ئەم هێزە سیاسییانە هەمان ئەزموونی لایەنە سیاسییەکانی دیکەی هەرێمیان دووبارە کردۆتەوە، بەمەش دەردەکەوێت کە یەکێک لە مەبەستە سەرەکییەکانی بەشداریکردنی سیاسی لە پاڵ بەرنامەکانی هێزە ئیسلامییەکان بریتی یە لە بەدەست هێنانی دەستکەوتە ماددیەکان.

بواری دووەم: ڕۆڵی نەیار، هەمان ئەو هێزە سیاسییانەی کە بەشدار بوون لە پرۆسەی سیاسی و حوکمڕانی هەرێم لە ماوەیەکی دیاریکراودا ڕۆڵی نەیاریان گێڕاوە، فۆرمی بەشداریکردنی ئەو هێزە سیاسییانە بریتی بووە لە چاودێریکردنی فۆرمی حوکمڕانی هەرێمی کوردستان، لەم بوارەدا تێبینی ئەوە دەکرێت کە ڕۆڵی نەیارییان لە ئەزموونی هەرێمدا ڕۆڵێکی لاواز بووە لەبەر ئەوەی کە لایەنە سیاسی یە ئیسلامییەکانی هەرێم لە نێوان دوو ئەگەردا بوون : یەکەمیان بریتی بووە لە بواری لەدەست دانی پێگە ئیدارییەکان لەبەرامبەر بوون بە نەیار و دووەم بریتی یە لە نەبوونی ووتارێکی دیاریکراو بە هێزە سیاسی یە ئیسلامییەکان جیاواز لە هێزە نەیارەکانی دیکەی وەک بزووتنەوەی گۆڕان، وە لە هەردوو ئەگەرەکەدا هەر هەماهەنگییەک لە

نێوان هێزە سیاسی یە ئیسلامی وهێزەکانی دیکەدا بەهۆی نەبوونی ووتارێکی جودا و ئەجندایەکی دیاریکراو بە هێزە ئیسلامییەکان، پاشکۆیەتی دەخرایە پاڵ ئەو هێزانە، لەڕووی واقیعەوە هێزە ئیسلامییەکان وبەهۆی کاریگەری هەژموونی ململانێی هێزە نێودەوڵەتییەکان لەبەرامبەر هێزە ئیسلامی جیهادییەکان توانای کێبڕکێیان لاوازبووە بە بەراورد بە هێزەکانی دیکە.

بواری سێیەم: ڕۆڵی فاکتەری هاوسەنگی، یەکێک لەو ڕۆڵانەی کە هێزە سیاسییە ئیسلامییەکان هەوڵیان بۆ داوە کە بەدەستی بهێنن بریتی بووە لە ڕۆڵی هاوسەنگە هێز لە نێوان هێزە سیاسییەکانی کوردستان، هێزە ئیسلامییەکان لەماوەی ئەزموونی سیاسی خۆیاندا نەیانتوانیوە وەک پێویست ڕۆڵێکی میانگیر بگێڕن لە ڕووی واقیعی سیاسی هەرێم لە بەشێک لە ئەزموونی ململانێی ناوخۆی هەرێمدا بەشداری کارایان هەبووە، لەم بوارەدا یەکگرتووی ئیسلامی سەرکەوتووتر بووە دواتر کۆمەڵی ئیسلامی، بەڵام بزووتنەوەی ئیسلامی لە سەرەتای کاری سیاسی دا کە هێزێکی سیاسی و سەربازی بووە لەم بوارەدا سەرکەوتوو نەبووە بە ڕەچاوکردنی ئەوەی کە گەلێک هۆکار هەیە بەدەربووە لە توانای سیاسی بزوتنەوەی ئیسلامی دەتوانین بڵێین کە لایەنە سیاسی یە ئیسلامییەکان سەرکەتوو نەبوون لە دەستەبەرکردنی بوون بە هێزی سێیەم لە هەرێمی کوردستان.

**دەرئەنجامەکان:**

**یەکەم**: پرۆسەی دیموکراتیزەبوونی سیستەمی سیاسی لە هەرێمی کوردستان پرۆسەیەکی بەردەوامەو چەندین هۆکاری ناوخۆیی و بابەتی هەن کە کاریان کردۆتە سەر هەڵکشان یان داکشانی ئەو پرۆسەیە.

دووەم: لایەنە سیاسییە ئیسلامییەکانی هەرێم بەشێک بوون لە پرۆسەی دیمکراتیزەبوون و ڕۆڵی بەشدار یان نەیاریان گێڕاوە لەو پرۆسەیەدا.

**سێیەم**: لەگەڵ گەشەسەندنی دیموکراسی دا هێزە سیاسی یە ئیسلامییە نێوەندەکان گەشەدەکەن و چەمکی ئیسلامی جیهادی بە دەستە بەرکردنی ڕێکارە یاساییەکانی دیموکراتیزەبوون لاواز دەبن.

**چوارەم**: نەبوونی توانای خۆ دەرخستن وەک هێزی ئەلتەرناتیڤ دەبێتە هۆی لاواز بوونی هەژموونی هێزە سیاسی یە ئیسلامییەکان لە هەرێمی کوردستان.

پێنجەم: بانگەوازی ئیسلامی لە هەرێمی کوردستان کارتێکراوە بە بانگەوازی جیهانی ئیسلامی و هەر هەڵکشان یان داکشانی دووەم کاریگەری هاوتای لەسەر هێزە سیاسی یە ئیسلامییەکانی هەرێم.

# پێکەوەژیانی عەلمانییەکان و ئیسلامییەکان لە کوردستانیکی دیموکراسیدا



د.عوسمان علی و. عەبدوڵا رەسول

بۆ ئەم ساتانەی ئێستای كورد، بەیەكەوە ژیانی عەلمانییەكان‌و ئیسلامییەكان كارێكی زۆر پێویستە بۆ بەدیهێنانی دەوڵەتی كوردی. دیموكراسی و بەیەكەوەژیان پێویستیەكی مێژووییە، ئاشتی‌و بەیەكەوەگونجان دەبێت لە نێوان عەلمانی‌و ئیسلامیەكاندا بێتەدی. ئەگەر پێوەرەكان هاوكاری یەكتر بن بۆ سەرخستنی پرۆژەی گشتی نیشتیمانی، هەر كامێكیان كار بكات بۆ بە ئامانج گەیشتنی پرۆژەی كوردایەتی، ئەوە خاوەنیەتی. هەر لایەنێكیش هەوڵی پارچە پارچە بوونی ئەو پرۆژەیە بدات ئەوە لەم هاوكێشەیە دەچێتە دەرەوەو گەل سزای دەدات. دەبێ جیاوازی بكرێت لە نێوان عەلمانی توندڕەوو میانڕەو، ئیسلامی توندو میانڕەو. عەلمانیە توندڕەوەكان تەنیا دژی ئیسلامی سیاسی نین، بەڵكو دژی ئیسلامن، ئەمەش گرفتی گەورە دروست دەكات‌و دەبێتە هۆی پەرتەوازیی‌و سەرهەڵدانی جەنگ لەناو كورددا. عەلمانیەتی توندڕەو پێی وایە ئیسلام خۆی گرفتە، بۆیە دەیانەوێ ئەم تێڕوانینەیان گشتگیر بكەن‌و هەرچی سەرچاوەی پەیدا بوونی ئیسلامە وشكی بكەن‌و لە ڕەگ‌و ڕیشەی دەربهێنن «بە بیانووی ریشەكێشكردنی توندڕەوی!!» بەڵام عەلمانی میانەڕەو هیچ گرفتێكی لەگەڵ ئەو كۆمەڵە ئیسلامیانەدا نییە، كە لە ئەزموونی دیموكراتی ڕازین، پێیان وایە ئاین‌و ئیسلامییەكان وەكو واقیع حاڵەتێكن دەتوانرێت لەگەڵیاندا مودارا بكەن. هەروەها بەربەست ناخەنە نێوان ئاین‌و سیاسەت‌و نایانەوێت دەسەڵاتی ئاینی مەرجەعیەتی كۆتایی بێ لە بڕیاری سیاسیدا. پێویستە ڕەوایەتی «شرعیە» تەوژمی عەلمانی میانڕەو دانی پێدا بنرێت، ئەو تەوژمەی خۆپارێزە لەجێبەجێكردنی شەریعەت، نەک لەبەر ئەوەی دژی بێت، بەڵكو پێی وایە ئەوانەی شەریعەت جێبەجێ دەكەن، مەترسین بۆ سەر ئەو بەهایانەی كە ئەوان پارێزگاری لێ دەكەن. وەكو ئازادی‌و دیموكراسی‌و یەكسانی‌و ناسنامەی كوردی. پێیان وایە، پیادەكردنی دژ بە كوردە. پێویستە ئیسلامییەكان: یەكەم: هەڵسوكەوتیان لەگەڵدا بكەن‌و پاساویان بۆ بێننەوە. دووەم: گفتوگۆیان لەگەڵ دا بكەن‌و دڵنیایان بكەن كە پرۆژەی ئیسلامی مەترسی نییە بۆ سەر ئەم بەهایانە. بانگەشە بۆ هەڵسوكەوت لەگەڵ تەوژمی عەلمانی میانڕەودا، ئەوە ناگەیێنێت كە پرۆژەی ئەوان قبوڵ بكرێت. بەڵكو بەرژوەندی هەردوولایە پێكەوە گونجاو بن. دەبێ ئەوانیش ئازادانە گوزارشت لە تێڕوانین‌و بیروباوەڕی خۆیان بكەن، ئەوە دەریدەخات كۆمەڵگا تەندروستەو پاشان هەوڵ دەدرێت بۆ سەرخستنی پرۆژەی نیشتیمانی گشتی، ئەمەیش موڵكی نەتەوەیە بە هەموو پێكهاتەكانییەوە، بە تەنها موڵكی لایەنێكی سیاسی نییە.(١)

زۆربەی بیریارانی عەلمانی غەیری كورد، پەنا دەبەنە بەر ڕێككەوتن لە نێوان بیری عەلمانی‌و بیری ئیسلامی لەو كۆمەڵگایانەی كە ئایین زاڵە، هەوڵ دەدەن سوود لە ئایین وەربگرن بە جیاكردنەوەی ژیانی حیزبی لە بنەما ئایینیەكان. لە هەمان كاتدا سوود لە بنەماكانی ئایین وەردەگرن وەكو پەرژینێك بۆ پاراستنی كۆمەڵگاكانیان لە رووی كۆمەڵایەتی‌و ئاكارەوە. بەهێزترین‌و ناودارترین دیموكراسیەتەكانی جیهان ڕێگرنین لەوە كە حیزب لەسەر بنەمای ئایین بۆ ئەو مەبەستە دروست بكرێت، ئەمەش وا دەكات چینێكی زۆری ئاینی لەگەڵ چینێكی بەرفراوانی عەلمانی یەكتر بگرنەوەو بە یەكەوە بژین، ئەمەش زیاتر پێی دەوترێت عەلمانیەتی بەشەكی.

بەڵام بانگەشە بۆ دارنینی كۆمەڵگای كوردی لە ئیسلام، بە بیانووی كۆمەڵگایەكی نادینی‌و مافی كەمینە ئاینییەكان، ئەمە جۆرێكە لە خەیاڵ، بەمەش كۆمەڵگای كوردی تووشی چەقبوستوویی دەكەنەوە بە بیانووی دەسەڵاتی كەمینەو زۆرینە. (٢) بۆ ئەوەی فێری ئەزموونی رۆژاویی بین، لەپرسی پێكەوەژیانی ئاشتیانە، بۆچوونی (ئەڵفرێد ئەلسێفان) نووسەری ئەمەریكی‌و پسپۆر لە بواری عەلمانیەتدا دەهێنینەوە،

که تێڕوانینی تایبەتی خۆی هەیە، سەبارەت بە سیاسەتی ئایین لە بەهێزکردنی دیموکراسی بە لێبوردەیی ئاڵۆگۆڕ ناوی دەبات، لەسەر بنەمای ئەم بیردۆزەیە نابێت دامەزراوەی ئاینی ئەو هێزو دەسەڵاتەی هەبێت یاساو دەستوری دیموکراسی هەڵبژێراو هەڵبوەشێنێتەوە، بەو مەرجەی پێچەوانەی بنەما چەسپاوەکانی نیشتیمانیو دەستووری نەبێت، بە پێی ئەم بیردۆزەیە ڕێگا بە دامەزراوەی ئایینی دەدرێت وەکو هێزی فشاریو دامەزراوەی سەربەخۆ پارێزگاری لەبەرژەوەندی کۆمەڵگا بکات، بە پێچەوانەی شارەزایانی ڕۆژئاوا پێیان وایە دیموکراسیەت تەنها لە ئەوروپا دێتە دی، چونکە ئەوروپا بە تەواوی توانیویەتی کەنیسەو دەوڵەت لە یەک جیا بکاتەوە، بەڵام (ئەڵفرێد لستیبفان) پێی وایە ئەم بیردۆزەیە لایەنگیری ئەوروپییەو وردبینی تێیدا نییەو پێچەوانەی واقیعە، باوەڕی وایە جیاکردنەوەی ئایینو دەوڵەت بەدی نەهاتووە، تەنیا بە شێوەی لاوەکی نەبێ. تەنانەت لە زۆربەی کۆمەڵگا دیموکراسیەکانیشدا، وەکو یەکێتی ئەوروپا، نووسەری ئەمەریکی دەڵێ: زۆربەی دەوڵەتی ئەوروپا کەنیسەیان هەیە، دەست دەخاتە ناو بڕبڕەی پشتی کاروباری سیاسیو دیموکراسی، بۆ ڕاستی ئەم قسیەش»ئەڵفرێد لستیبفان» نموونە بە هەندێک بەندی دەستووری دەوڵەتانی یەکێتی ئەوروپا دێنێتەوە، هەموو دەوڵەتانی ئەسکەندەناڤیا، کە ئەندامن لە یەکێتی ئەوروپا خاوەنی کەنیسە لۆسەرین، ئەو کەنیسانە کاریگەری ڕاستەوخۆیان بەسەر بڕیارە چارەنووسازەکانی دەوڵەتەوە هەیە لە هەر دوو بواری (یاسادانانو جێبەجێکردن)، نموونەش وەکو دەقی ماددەی (٢)ی دەستووری دەوڵەتی نەرویج کە (تاکە دەوڵەتی یەکێتی ئەوروپایە) لەم ماددەیەدا دەڵێ (ئایینی ئینجیلی لۆسەری ئایینی فەرمی دەوڵەتە)، پێویستە دانیشتوانی وڵات منداڵەکانیان لەسەر ئەم ئایینە پەروەردە بکەن، کۆمەڵێک یاساو دەستوور لە لایەن حکومەتی بەریتانیو ئەنجومەنی گشتی دەرچوو، دەڵێ: پێویستە پاشا لە شوێن کەوتوانی کەنیسەی بەریتانی بێت، هەروەها پاشا (ئافرەت بێ یان پیاو) دەبێتە سەرۆکی کەنیسە ئینجیلی بەریتانیا. دەقی دەستوری یۆنانی لە ماددەی (٣) دا دەڵێ: ئاینی ئەرسۆدکسی ڕۆژهەڵاتی ئایینی فەرمی دەوڵەتە، هەر لەو مادەیەدا هۆشداری داوە کە نابێ گاڵتە بە ئایینی دەوڵەت بکرێتو هەر کەسێک سنووری ئەم مادەیە ببەزێنێت تووشی لێپێچینەوەی یاسایی دەبێتەوە... ماددەی (١٦) ی دەستووری ئیسپانیا دەڵێت: پێویستە دەوڵەتو دامەزراوەکانی چاودێری ئەوە بکەن، کە کەنیسەی کاسۆلیکی ئایینی فەرمی دەوڵەتەو پێویستە ڕێزی ئاینیەکانی تریش لە وڵات بگیرێت(٣).

هەروەها دەستوری وڵاتانی هۆڵەنداو نەمساو ئەڵمانیاو کەندا، حکومەتەکانیان پابەندکردووە بە هاوکارییو چاودێری پەروەردەو فێرکردنی ئایین لە قوتابخانە تایبەتیەکان، دەوڵەتانی ئەوروپی لە هەر یەک لە ئەڵمانیاو نەمساو ئیتالیاو بەلجیکاو هۆڵەندە پشتگیری لە پارتی مەسیحی دەکەن، تاکە دەوڵەتی ئەوروپی کە ڕێگا نادات حیزب لەسەر بنەمای ئایین دابمەزرێت پورتوگالە(٤).

توێژەری ئەمەریکی (جۆناسان فۆکس) توێژینەوەیەکی مەیدانی ئامادەکرد لەسەر ئەو دەوڵەتانەی ئایینو دەوڵەتیان لێک جیاکردۆتەوە، توێژینەوەکەی لەسەر (١٥٣) دەوڵەت ئەنجامداوە، لە نێوان ساڵانی (١٩٩٠ تا ساڵی ٢٠٠٠) لە ئامادەکردنی ئەم توێژینەوەیەدا پشتی بەسەرژمێری کەنیسەو دامەزراوەی دەوڵەتەکان بەستووە، بە پێچەوانەوەی ئەوەی دەوترێ بیروباوەڕی ئایینی لەسەر دامەزراوەی دەوڵەتەکاندا لە زیادبوون دایە بە دوای ساڵی (٢٠٠٠) ئەم کاریگەرییە زیادی کردووە(٥).

لە ڕاستیدا ئەزموون سەلماندوویەتی، هێزی عەلمانیو ئیسلامییەکان دەبێت لە پێناوی هێنانەدی بەرژەوەندی نیشتیمانی هەموو تواناکانیان یەک بخەن، بۆ ئەوەی خزمەت بە پرۆژەی نیشتیمانیان

بکەن. دەرکەوت زۆربەی دەستەبژێری عەلمانی عەرەبیو تورکی وازیان لەو پەیڕەوە هێناوە، کە نەتوانن لەگەڵ ئیسلامییەکاندا بژینو هەڵسوکەوتیان لەگەڵدا بکەن.

بۆم دەرکەوتووە، کە سەرچاوەی توندڕەوی عەلمانی لە کوردستاندا ئەو مارکسیانە بوون، کە جەنگیان لەگەڵ ئیسلامدا ڕاگەیاندووە، کاتی خۆی شیوعی بوونو پاشان چوونەتە ڕیزی حیزبە نەتەوەیەکان (ینک، پدک)و ئەوانەش کە لە ڕۆژئاوا ژیاون بە عەقڵیەتی ڕۆژئاوا بیرکردنەوەو دەیانەوێ شارستانیەتو ڕۆشنبیری ئەوان لە کوردستاندا بروێنن، ئەوەیان لە بیرکردووە، کە کوردستان بەشێکە لەو ڕۆژهەڵاتی ئیسلامییە، ئەو توێژە هەندێک ئافرەتی کوردی یاخی بووی هان داوە، داوای ئازادی بکەنو لە ستەمی کۆمەڵایەتیو سیاسی ڕزگاریان بێت، بەڵام ئەوە جێگای داخە ئەم دەستەبژێرە بە فیتی پەیڕەوکەرانی فیمینزمی ڕۆژئاو (بزوتنەوە ژنانی ڕۆژئاوا) دەجوڵێن، هەوڵ دەدەن ئەو هۆکارو بیردۆزانەی ئافرەتانی ڕۆژئاوا بەکار بێنن بۆ چارەسەرکردنی کێشەی ئافرەتانی کورد، ئەمجۆرە پەیڕەو بەرنامانە هەرەسیان هێناوە، لە کۆمەڵگای ئیسلامیەکانی دراوسێکانی کوردستان. بۆ بەیەکەوە ژیانی ئاشتیانەو باشترکردنی بارودۆخی ئافرەتی کوردی لەسەرمان پێویستە ڕێگای سێیەم هەڵبژێرین، ئەو مافانەش کە ئافرەتانی ڕۆژئاوا بە دەستیان هێناوە، بە هێندی وەربگرین، چونکە لە زۆر بواردا ئافرەت هاوشانی پیاو کار دەکاتو پێشبڕێکی لەگەڵدا دەکات، لە لایەکی ترەوە دەبێ ئافرەتی کورد ئاشنا بکرێت بەو کەلەپوورە ئایینیو کۆمەڵایەتییە، کە (لە قورئانو سوننەتی پێغەمبەر)دا ڕەنگی داوەتەوە، بۆ ئەوەی بزووتنەوەیەکی ئافرەتانی کوردی پێشکەوتووو ڕەسەنی کوردستانی دروست بکرێت.

هیچ گومانی تیایدا نییە، ئافرەتانی عەلمانی «تورکیو فارسیو عەرەبی» پێشکەوتووترن لە عەلمانی کورد، قۆناغی کێشەی خۆیان لەگەڵ ئیسلامو ئیسلامییەکانیان تێپەڕاندووە، هەر دوولا دڵنیایی تەواویان بۆ دروست بووە، کە بەم شێوەیە ناتوانن خزمەت بە بەرژەوەندی نەتەوایەتیان بکەن، بۆیان ئاشکرا بووە باشترین ڕێگا بۆ خزمەت بە یەکەوە ژیانو گفتوگۆ و لە یەکتر گەیشتنە، بۆیە لە کوردستانیش دا هیچ ڕێگایەک لەبەردەم ئیسلامی و عەلمانیەکان دا نییە، تەنها ئەوە نەبێ کە دەبێ چاو لە دەوروبەریان بکەن، کە توانیویانە لە بواری داهێنانو شارستانیەتدا گەشە بکەن، ئەو عەلمانیە کوردەی کە دەیەوێت چاو لە ئەورووپا بکات دەبێ باش بزانێت، ئەورووپا ئایینی مەسیحیو جولەکەی لە ڕەگ و ڕێشە دەرنەهێناوە، بەڵکو خۆی لەگەڵ دا ڕاهێناوە.

مامۆستا(فاروق ڕەفیق) وای دەبینێت کە کێشەی عەلمانیو ئیسلامی سیاسی، کێشەیەکی شکۆمەندانە نییە بەڵکو وێرانەکەرو زیانبەخشە بە ناسنامەی نەتەوایەتی، هەروەکو لە ڕابردوودا ڕوونمان کردەوە، نە عەلمانیەکانو نە ئیسلامیەکان بە تێڕاوانینی فاروق ریشەی قوڵی فەلسەفیو شارستانیان نییە لە کوردستان، تا ئێستا گفتوگۆی شارستانی لە نێوانیاندا نەبووە، تا ئێستا هیچ دامەزراو خولی فیکری نەبووە بۆ بەرێوەبردنی ئەم کێشەیە، دوو پارتی عەلمانی فەرمانڕەوا دامەزراوەکانی حکومەتیان بەکارهێناوە سەپاندنی هێز لەسەر گۆڕەپانەکە، لێرەوە بۆ تۆقاندنی ناحەزەکەیان لە ڕەوتی ئیسلامی، دەشێت ناوی بنێین تیرۆری دەوڵەت، لە بەرانبەردا لایەنی ئیسلامی بە پێی توانا هەستاوە بە ئەنجامدانی تۆقاندنو بەکافرکردنی لایەنی عەلمانی، هەر دوولاش هەڵە بوون، هیچ ڕێگایەک نییە بۆ دەرباز بوون لەو قەیرانە، کە بەرێکاری کەم و کورت بەڕێوە دەچێ، ئەگەر تەوژمی عەلمانی نەتەوایەتی دەیەوێت گەشە بکات پێویستە بە خۆداچوونەوە بکات، بە تایبەت بەو تێڕوانینو هەڵوێستەی، کە هەیەتی بەرانبەر بە ئیسلامو شارستانیەتەکەی، واز لە تراویلەکەی (سراب)ی زەردەشتی بهێنیو دان بە واقیعی ئیسلامدا بنێ وەکو ڕەگەزنامەی

کوردی، هەروەکو پێویستە ئیسلامی سیاسیش چاو بە هەڵسەنگاندنی خۆیدا بگێڕێتەوەو سیاسەتی (دووبارە موسڵمان کردنەوەی کورد) واز لێ بێنێتو واز لە کۆمەڵێک چوارچێوەی چەقبەستوو بهێنێ بە ناوی سەپاندنی یاساکانی شەریعەت. پێویستە ئامادەیی هەبێت بۆ خۆڕاهێنان لەسەر پێکەوەژیانو تازەگەریو دیموکراسی. هەروەها فاروق ڕەفیق دەنووسێ: (عەلمانیەتی کورد هەڵەیە، کە پێی وا بێ تەوژمی ئیسلامی بزووتنەوەیەکی کۆنەپەرستیەو دەیەوێت کورد بەرەو دواوە بباتەوە، ئیسلامی سیاسی حاڵەتێکەو چۆن عەلمانیەتیش حاڵەتەو ئەمەش بەرهەمی تازەگەرییە لە ناو کۆمەڵگای کوردی، تاکیەتی گشتگیری ئیسلامی سیاسی پەیدا بوونی بۆ کاریگەری بزووتنەوەی تازەگەری دەگەڕێتەوە کە لە ناو کۆمەڵگادا سەری هەڵداوە. حیزبە ئیسلامیەکان پەیوەندی خۆیان بە شارستانیەتی ئیسلامی لە دەست داوە، کە ئەم شارستانیەتە بە شارستانیەتێکی کراوە ناسراوە بەرانبەر شارستانیەتەکانی تر خاوەنی فەلسەفەو عیرفان و تەسەوفە(٦)..

سەرۆ قادر پیری یەکەم لە سەرکردەکانی کورد بە سەرکردەی (نەتەوەیی ئاینی) ناو دەبات(٧)، ئەبوبەکر عەلی چەند وتەیەکی مامۆستا مەریوان قانع دەگوازێتەوە، پێی وایە ـ ئیسلام کێڵگەیەکە، کە هەستی نەتەوایەتی کوردی تیایدا ڕواوەو گەشەی کردووە، وەکو چۆن ئیسلام چوارچێوەی ئایدیۆلۆجی و سونبولی مێژووی هەبوون، کە نەتەوەی لە قۆناغی سەرەتایی دا پشتی پێ بەستوون(٨). لەم دوو گەواهی دانە دەردەکەوێت کە ئیسلام ڕوویەکی تری کوردایەتییە، بۆیە هیچ زەحمەتی تیادا نییە، کە ئیسلامی و عەلمانی بەیەکەوە لەسەر ئەو کەلتوورە بژین، هەر دوو لایەنیش ئامادەییان هەیە یەکار قبوڵ بکەن و هیچیان کوردایەتی و ئیسلامەتی لەسەر خۆ تاپۆ نەکات.

ئەبوبەکر کاروانی لە نوسینێکیدا بە ناونیشانی (لە حکومی ئایدۆلۆجیاوە بۆ دەسەلاتی خەڵک)، زۆر پیشنیازی تازە دەخاتەڕوو لەسەر پێکەوەژیانی ئاشتیانە لە نێوان هەردوو تەوژمی عەلمانیو ئیسلامی. کوردستان بە پێچەوانەی دەوڵەتەکانی ناوچەکە، خاوەنی هەلێکی مێژووییە بۆ دروستکردنی بەیەکەوە ژیان لە نێوان ئیسلامیەکان و عەلمانییەکان، لەبەر چەند هۆکارێک:-

**یەکەم:** تەنیا لە هەندێ حاڵەتی دەگمەن دا نەبێ جەنگو پێکدادان ڕووی نەداوە، ئەویش لە لایەن هەندێ گرووپی بچووکی ئیسلامی توندڕەو هێزی عەلمانی کورددیا. بەگشتی تەوژمی ئیسلامی، میانڕەو بە تایبەتی لەگەڵ ئەحزابی عەلمانیدا جۆرێک لە قبوڵی کردنو مونافەسەی سیاسی هەبووە، ئەو ئەزموونەش دەگونجێ بەهێزتر بکرێ، هەر دوولایان هەست بەوە دەکەن، کە دامەزراوەکانی حکومەت دەبێ لە کێشەی ئایدۆلۆجیای کوشندە دووربخرێتەوە، ئەگەر هەر دوولا لەگەڵ پاراستنی دامەزراوەکانی دەوڵەت بوون، تا چەند ئەمانە دامەزراوەی مەدەنین، لە هیچ لەو دوو لایەنە نابێ دامەزراوەکان حکومەت نابێ بکرێنە هۆکارێک بۆ سەپاندنی بیروباوەڕێکی دیاری کراو.

**دووەم:** لە دوای هەرەسهێنانی سەربازگەی شوعیەتو کۆتایی هاتنی چەنگی سارد، هەلی سەپاندنی ئایدۆلۆجیای گشتگیر لە لایەن حیزبەکانەوە کەم بوویەوە، چونکە عەقڵ تیرۆر دەکات. زانراویشە لەسەردەمی جەنگی ساردا ئەحزابی عەلمانیو ئیسلامی بە حیزبی ئایدۆلۆجیا دەناسرانو دەیانەویست قەوارەی هەمە لایەنەی خۆیان بسەپێنن.

**سێیەم:** ئەزموونی عەلمانیەت لە «تورکیاو میسرو عێراقو سوریاو تونس» ئەزمونێکی توندڕەو بوو، سەرکەوتەو نەبوو لە بەدیهێنانی ئامانجو مەبەستەکانیدا، دەگونجێ ئەزموونی ئیسلامییەکان لە «ئێران و ئەفغانستان» بە ئەزمونێکی ئایدۆلۆجیای گشتگیری سەرنەکەوتوو پێناسە بکەین.

لەبەر ئەوەی پێویستمان بە حکومەتی مەدەنی هەیە

ڕێگای سێیەم هەڵدەبژێرین، ئەویش ڕێگای بەخشینی دەسەڵاتە بە گەلو ڕازی بوونە بە دەستووری مەدەنی، کە دەوڵەتی دوور لە ئایدۆلۆژیایی دروست دەکات، دامەزروەی دەوڵەت دوور دەبن لە زاڵبوونی حیزبو سەپاندنی بیروباوەڕێکی دیاری کراو.

**چوارەم**: هەموو لایەنەکانی کوردستان گەیشتوونەتە ئەزموونێکی دەوڵەمەندو پێ گەیشتوو، بۆیان دەرکەوتووە سەپاندنی ئایدۆلۆژیا دیاریکراو دەسەڵاتی تاکە حیزبی هەوڵێکی بێ بەرهەمە. بۆیە هەلێکی مێژوویی دەگمەن لەبەردەم دایە بۆ دروست کردنی کۆمەڵگایەکی مەدەنی لە کوردستان.

**پێنجەم**: دەستووری عێراقیش، لە چوارچێوی گونجاوی داناوە بۆ بەهێزکردنی لایەنی مەدەنی لە حکومەتی هەرێمدا.

ئەم دەستوورە بە پێی ڕێککەوتنو سازانی لایەنەکان بووە، بە عەلمانی و ئیسلامیەکان لە عێراقدا، دوای گفتوگۆی درێژخایەن بەدی هاتووە، گرەنتی مافەکانی بە شێوەیەکی هاوسەنگ داوە، هەروەها ئەم دەستوورە گرەنتی دەوڵەتی مەدەنی ماوە، لەهەمان کاتدا داکۆکی لەوە دەکاتەوە، کە نابێ یاسایەک دەربچێت دژی چەسپاوەکانی ئیسلام بێت(٩).

هەردوو تەوژمی ئیسلامیو عەلمانی کوردی دەتوانن سوود لە دەستوری هەرێمەکان وەربگرن بۆ بنیاتنانی دەستوورێک بەیەکەوە ژیانی ئاشتیانە دەستەبەر بکاتو سوود لە هەڵەی یەکتر وەربگرن.

نوسەری کورد (ڕێبین هەردی) باوەڕی وایە، پەسندنەکردنی بەیەکەوە ژیان لەگەڵ ئیسلامیەکانی کوردستان بە پاساوی ئەوەی تەوژمێکی داخراون، ئەوە قبوڵ نەکردنی فرە لایەنیە، ئەم تێڕوانینە لەسەر بنەمای ژێر بێژی (مەنتیقی) دانەمەزراوە، توندڕەوی لە تەوژمی ئیسلامی دا بەزۆری بۆ کاردانەوەی ستەمکاریو قبوڵ نەکردنی بەرامبەریان دەگەڕێتەوە.

پاشان دەڵێ: (دامەزراوەی عەلمانیەت، کەخۆی بە عەلمانیەتو مافی مرۆڤ لەرۆژهەڵاتی ناوەڕاست هەڵدەکێشێت، گەورەترین ستەمیان لەتەوژمی ئیسلامی کردووە، گرتووخانەکانیان پڕکردوە لە ئەندامو لایەنگیرەکانیان، ئەمەش گەورەترین هۆکار بووە پاڵی بەتەوژمی ئیسلامی ناوە بەرەو توندڕەوی هەنگاو بنێت. ئەگەر تەوژمی ئیسلامی هەلی جموجۆڵی پێ بدرێت لە ناو کۆمەڵگاکەدا، ئەوە ئەم تەوژمە بەرەو کراوەییو پەسندکردنی فرە لایەنی هەنگاو دەنێت(١٠).

لەنێو عەلمانیەکاندا هەیە ناڕازییە، خۆی دەپارێزێ لەوەی دەگونجێت بەیەکەوەژیان لەگەڵ ئیسلامیەکانی کوردستاندا پیادە بکرێت، بەهۆی جیاوازی بیرو باوەڕو هەڵوێستی ئیسلامییە سیاسییەکان لە کوردستانو ناوچەکانی تری جیهانی ئیسلامی دا. بەڵام ئەوەی پەیوەندی بە جیاوازی ئایدۆلۆژیاوە هەیە، بڕبڕەی پشتی دیموکراسیەتە، کە چۆن بتوانین لەگەڵ کەسانی تر دا بژیت. هەوڵبدرێت کەشو هەوایەکی وا دروست بکرێت هەرلایەنێک گوزارشت لەتێڕوانینی خۆی بکات، ئەمەش بەپەیرەوکردنی ڕێگای شارستانیەتو ئاشتیو پاراستنی ڕێژەی مرۆڤایەتیو مافەکانیو گوزارشت کردن لە خۆی دا دێتە دی.

زیاتر لەچەندان جار خوێندومەتەوەو بیستوومە تێڕوانینێکی تر هەیە، دەڵێن ئاین سیاسەتی تێیدا نییە، بە تایبەتی ئاینی ئیسلام. ئەوانە بەیەکەوەژیان نییە. چونکە دەڵێن ئاین بەکار دێنن بۆ هێنانەدی ئامانجی سیاسی. پاشان دەڵێت ئیسلام ئاینی کۆمەڵگایەو مافی لایەنێکی سیاسی نییە، کە بۆخۆی پاوانی بکات بەناوی ئیسلامەوە قسە بکات. یان برەودان بەوەی ئایین بۆ زیندوکردنەوەی لایەنی ڕوحی هاتووەو پەیوەندی بەسیاسەتەوە نییەو سیاسەت پیسەو فێڵو درۆو هەڵخەڵەتاندنە، بۆیە نابێ ئیسلام تێکەڵی سیاسەت بکرێت، ئەم بۆچوونە سەرەتا وا دەرکرێت کە عاقڵانەیە، بەڵام ئەگەر بە قوڵی لە دیموکراسی ورد بینەوە کۆمەڵێک گرفتمان بۆ دروست دەبێت، ڕاستە مافی هیچ لایەنێک نییە

به تەنیا ناوی ئاینەوە قسە بکاتو لەسەر خۆی تاپۆ بکات و بەرانبەرەکەی کافر بکات، چونکە تێروانینی جیاواز هەیە بۆ ئاین، ئەم بیرکردنەوەیە کۆمەڵێک کێشەی سیاسیو کۆمەڵایەتی مەترسیدار دروست دەکات، ئاشتیو ئارامی دەخاتە مەترسیەوەو خەڵکی سادە بە ئاسانی بۆی هەزم ناکرێ.

بەڵام کاتێک عەلمانی مافی ئەوەی هەبێت بەهاکانی رۆژئاوای لیبرالی و مارکسیەت بکات بە مەرجەعو بنەمای دەسەڵاتو فێرکردنو بەرێوەبردن، بۆچی ئەم مافەش بە بە ئیسلامیەکان نەدرێت، کە ئاینی ئیسلام مەرجەعیان بێت؟!!

وەکو زانراوە شەریعەتی ئیسلام سەرەکییە، سەرەکییە لە حوکمو دەسەڵاتدا لە جیاتی ئیسلام دا، لە نێو ئەوانەش دا لە کوردستان بۆ زیاتر لە (١٤٠٠) ساڵ دەگەرێتەوە. لە دیموکراسیەتدا ئەوە رێگای پێ نەدراوە، کە عەلمانی کوردی جیهانبینی رۆژئاوا بسەپێنێت لەسەر ئاینو ئیسلامیەکان، هەروەها ئەوەش هاتووە ئیسلامیەکان مافی ئەوەیان نییە عەلمانیەکان کافر بکەن، یان بە ئاشکرا رای نەگەیەنن، ئەگەر راشیان گەیاند، دووبارە نابێ ئیسلامییەکان بریاری جەنگیان دژ بدەن، بەڵکو پێویستە ئامۆژگاری بکرێنو گفتوگۆیان بکرێت، بۆیە عەلمانیەکانیش باشترە جەنگ دژی ئیسلامیەکان بریار نەدەن، ئیسلامیەکانی ئەمرۆی کوردستان وەکو هی ساڵانی نەوەوەکان نین لە رووی تێروانینو جیهانبینیەوە، بەڵکو زیاتر پێگەیشتوونو تێگەیشتووترن رێز بۆ دیموکراسیەت دادەنێن و ئامادەیان تێدایە بۆ بەیەکەوە ژیان.

پێگەیشتنو تێگەیشتن لە تێراونینی ئیسلامیەکان بۆ دەسەڵاتو بەیەکەوەژیان لەگەڵ عەلمانیەکاندا، دیاردەیەکی جیهانییە، لە نیوەی کۆتایی سەدەی بیستەم هەندێ توێژی ئیسلامی تووشی توندرەوی بوون سەبارەت بە حکومی خیلافەتو قبوڵ نەکردنی کەسانی تر، ئەم تاک رەویەش لە بیرکردنەوەدا هۆکارەکەی دەگەرێتەوە بۆ کاریگەری شۆرشی ئیسلامی لە ئێرانو جیهادی ئەفغانستانو هەوڵی عەلمانیە ئوسولیەکان بۆ لە ناوبردنی ئیسلامیەکان، ئەم گۆرانکارییانەی ئەمرۆ لە ناوچەکەو جیهاندا روویان داوە لە بەرژەوەندی هێزە دیموکراسیەکان دایە لە جیهانی ئیسلامیدا.

وای لێ هاتووە هێزی ئیسلامی جوڵێنەری سەرەکییە، پاڵپشتی رۆژئاواش بۆ بەهاری عەرەبی لە جیهانی ئیسلامیدا، ئەوە دەبینرێت کە تەوژمە توندرەوەکان بەرەو ئاوا بوون دەچن. ئەویش بەهۆی ئەزموونی تاڵی کارەساتەکانی ئەفغانستانو جەزائیرو ئێران، کە سەرکەوتوو نەبوون لە پێشکەشکردنی نموونەیەکی جوانی ئیسلامی بۆ شارستانیەتو مرۆڤایەتی، لە بەرانبەردا ئەوە بە ئاشکرا دەبینرێت بزووتنەوە ئیسلامیە سیاسیەکان گەشەکەیەکی فراوان دەکەنو بەرانبەر دیموکراسی و بەها تازەگەرییەکان کراوەن بە تایبەت ئەو بەهایانەی کە دژایەتی لەگەڵ دەقی راشکاودا نییە.

بیری دەوڵەتی ئیسلامی (خیلافەت) بە شێوەی پراکتیکی بەرەو لاوازی دەچێت لە بەرنامەی ئەو حیزبە ئیسلامیانەدا، قەناعەتیان بە ژیانی هاوبەش هەیە لە چوارچێوەی دەوڵەتی عەلمانیداو باوەریان بە دەستاو دەستکردنی ئاشتیانەی دەسەڵاتو فرە لایەنی حیزبی هەیە. نووسەری ئەمریکی (ئاسیف) ئەم دیارەیەی جیهانی ئیسلامی بە پۆست ئیسلام (Post – Islamism) ناو دەبات(١١). ئەوەی پشکی هەبووە لە بەهێزکردنی ئەم ئەزموونە ئەو سەرکەوتنە سەرسوورهێنەرەیە، کە حیزبی دادوگەشەپێدان لە تورکیا بەدی هێناوە، کە خاوەنی پاشینەیەکی ئیسلامییە لە زۆربەی بوارەکانی ژیاندا. ئابووری، کۆمەڵایەتی، بەهێزکردنی دیموکراسی، ئەمرۆ دادو گەشەپێدان دیاردەو ئەزموونێکە گوێزراوەتەوە بۆ زۆربەی کۆمەڵگا ئیسلامیەکان.

دکتۆر (عادل باخەوان) باوەری وایە، کە حیزبە ئیسلامیەکانی کوردستان قۆناغی ئیسلامی بوونیان تێپەراندووە، کە لە پێشدا پێی ناسرا بوون،

که له‌سه‌ر بنه‌مای بیری شه‌ریعه‌ت‌و شوراو ئه‌میر بنیاتنرابوو، ئه‌مرۆ له قۆناغی (پۆست ئیسلام) دان، پێی ده‌گوترێ (ئیسلامی دیموکراسی) که ده‌توانێ ژیانی هاوبه‌ش له‌گه‌ڵ عه‌لمانیه‌تدا دروست بکات له بواری سیاسیدا، له رابردوودا ئه‌م گۆرانکارییه له ئه‌وروپادا رووی دا بوو، ئه‌مه‌ش له حیزبه دیموکراسیه مه‌سیحیه‌کانی ئه‌ورووپا دا به ئاشکرا ره‌نگی دابۆوه. ئه‌م حیزبانه باوه‌ریان به ده‌ستاوده‌ست کردنی ده‌سه‌ڵات هه‌بوو به‌شێوه‌ی ئاشتیانه‌و به‌یه‌که‌وه‌ژیان له‌گه‌ڵ عه‌لمانیه‌کان له ناو سیستمێکی دیموکراسیدا، ئه‌وه‌ی له تونس‌و میسرو تورکیا روویدا ره‌نگدانه‌وه‌ی ئه‌م ئاراسته ئیسلامیه سیاسیه‌یه، به دڵنیاییه‌وه کاریگه‌ریشی بۆ سه‌ر کوردستان ده‌بێت(١٢). مامۆستا مه‌لا عبدالکریم پسپۆر له بواری - ئیسلامی سیاسی دا له‌گه‌ڵ عادل باخه‌وان دا هاورایه له‌سه‌ر ئه‌وه‌ی، که حیزبی دادو گه‌شه‌پێدان کاریگه‌ری به‌سه‌ر کوردستانه‌وه هه‌یه‌و ئه‌زموونه‌که‌شیان بۆ کوردستانیش ده‌گوازرێته‌وه. وای ده‌بینێ که گۆرانکاری له هه‌ڵوێستی حیزبه ئیسلامیه‌کانی کوردستاندا رووی داوه، به‌ره‌و (ئیسلامی لیبرالی) هه‌نگاو ده‌نێن، ئه‌مه‌ش به شێوه‌ی کرداری له هه‌ڵوێسته‌کانیان دا بینراوه، پشتیوانی خۆپیشاندانه‌کانی (١٧ی شوباتی ٢٠١١) یه‌کێکه له نیشانه‌کانی ئه‌و گۆرانکاریه.

پاشان ده‌ڵێ: (بینمان نوێنه‌ری ته‌وژمی ئیسلامی لیبراڵی شانبه‌شانی نوێنه‌ری عه‌لمانیه‌کان، که مارکسی‌و لیبرالی بوون وه‌ستا بوون، به یه‌ک ده‌نگ دروشمه‌کانیان ده‌ووته‌وه، ئه‌مه‌ش له به‌رژه‌وه‌ندی دیموکراسی‌و مافی مرۆڤ و فره لایه‌نی سیاسی بووه، ئه‌م گۆرانکارییه‌ش له هه‌ڵوێستی ته‌وژمی ئیسلامیدا، هه‌ڵوێستێکی کاتی سیاسی نه‌بووه، به‌ڵکو له پێناوی گۆرانکاری دیموکراسیدا هه‌ڵوێستێکی به‌رجه‌سته‌و هه‌وڵی زۆری له پێناودا دراوه(١٣).

## سه‌رچاوه‌و په‌راوێزه‌کان:


١. م.م طارق عبد الحافظ الزبيدي العلمانية وموقف الفكر السياسي الإسلامي المعاصر العلمانية .http://hamoudi.org/arabic/dialogu -o f-intellenct/ 15/08.htm

2. أوهام العلمانية الزرقاوي ، الجمعة 06 حزيران 2008 ، موقع ولاتيمة http://www.welateme.info/erebi/modules.php?name=News&file=article&sid=3936 #.UEZaDMFlSOktp://www.welateme.info/erebi/modules.php?name=News&file=article&sid=3936#.UEZaDMFlSOk

3. Alfred Stephan ، Argueing Comparative politics ، ( new York: Oxford University press ، 2001) ، p.126

4. Nader Hashemi Islam، Secularism and Liberal Democracy: Toward a Democratic Theory for Muslim Societies (Oxford University Press، forthcoming).2009.p.126

5. Jonathan Fox world separation of religion and state into the twenty-Fisrt century ، Comparative political studies ،(June 2006)39 ،P.561

٦. ماڵێکی لێک ترازاو و ویژدانێکی بیمار ،ل٣٤-٣٦.

٧. کومه‌ڵگا ، دین و توندو تیژی ، ل ٧٥ .

٨. کێشه‌ی کورد له‌نێوان «نه‌ته‌وه‌یی بوون» و «ئیسلامی بوون» دا٩/٧/٢٠١٢ ٠٥:٤٥

٩. ئه‌بوبکر عه‌لی( کاروانی ): له حوکمی ئایدۆلۆژیاوه به‌ره‌و ده‌سه‌ڵاتی خه‌ڵک /سه‌باره‌ت به شوینی ئیسلام له ده‌ستوری هه‌ریمی کوردستاندا ٢٠-٠٩-٠٦www.-kurdistanan.net/print.php?sid=١٤٣٧

١٠. رێبین هه‌ردی: ئیسلامی سیاسی وه‌ک هیزیکی براوه، ئاوێنه نیوز www.awene.com/opinion ئیسلامی سیاسی وه ک-هێزی ی-برا وه ٦ کانون دووم ٢٠١٢ئیسلامی سیاسی وه‌ک هێزیکی براوه. (له‌نزیکه‌وه. له‌گه‌ڵ به‌هاری عه‌ره‌بیداو پاش ئه‌وه‌ی

11. Asef Bayat ، Making Islam Democratic ، Stanford University Press ،2007.p. 4.

١٢. د. عادل باخه‌وان بۆ هاوڵاتی: بزووتنه‌وه ئیسلامییه‌کان هه‌وڵی دامه‌زراندنی سیستمی دیموکراسی موسڵمان ده‌ده‌ن. ٢٠ هاوڵاتی ئاب ٢٠١٢ .

١٣. م.م طارق عبد الحافظ الزبيدي العلمانية وموقف الفكر السياسي الإسلامي المعاصر العلمانية http://hamoudi.org/arabic/dialogu -o f-intellenct/ 15/08.htm

# ديموكراسيەت لە بزاڤی سیاسی کورد لـە نێوان (دروشم)و (مومارەسە)دا



شیلان حاجی شەریف

دیموكراسیەت چەمكێكی جیهانیەو پرۆسەی بە دیموكراتیزەكردن یان كۆمەڵگایەكی هوشیار، پارتە سیاسییەكانی ناچار كردووە بۆ چەسپاندنی ئەو چەمكە، یان خۆیان مومارەسەی ئەو چەمكەیان كردووەو لەوێوە گوازراوەتەوە بۆ كۆمەڵگا. بەڵام هەتا ئێستا بەهیچ لەو دوو رێگایە دیموكراسیەت بەری نەگرتووە.

لە بیستەكانی سەتەی رابردووەوە لەرێگەی حیزبو رێكخراوە سیاسیەكانەوە چەمكەكانی پەیوەست بە دیموكراسیەت هاتۆتە ناو فەرهەنگی سیاسی كوردەوە. زاراوەی دیموكراسیەت زیاتر وەكو دروشم باس كراوە، بۆتە ناونیشان، بۆتە ئامانجو كاری جدی لەناو پەیڕەوی ناوخۆی پارتە سیاسییە كوردییەكان. لە واقیعدا تەواو پێچەوانەو كاری پێ نەكراوە، ئەوەی بوونی نەبووە لە سەركردایەتی كردنو بەرێوەبردنی حیزبە سیاسیەكان دیموكراتیو بنەمایەكانی بووە(١).

لەسەرەتای دامەزراندنی یەكەم پارتی سیاسی، دووبەرەكی نێوان ئەم پارتە (كۆمەڵەی كوردی لە كوردستانی باكوور بەناوی «حیزبی تەعالیو تەرەقی كوردستان ١٩٠٨-١٩١٠») كە لەسەرتاوە كۆك بوونو دوایی ناكۆكی قوڵی سیاسی كەوتۆتە نێوان بنەماڵەی بەدرخانیەكانو نەهریەكان لەسەر چۆنیەتی سەركردایەتی كردنی ئەو پارتەو لێكترازاونو بە دیموكراتیەت ناكۆكیەكانیان یەكلایی نەكردەوە(٢). دوایی (حیزبی هیوا ١٩٣٧-١٩٤٦) لە كوردستانی باشور (كوردستانی عێراق)و شێوازی سەركردایەتی كردنی ویستگەیەكی ترە لە نادیموكراسی پارتی كوردی. رەفیق حیلمی پێش ئەوەی ببێتە سەرۆكی حیزبی هیوا سەرۆكی خێڵ نەبووە،سەركردەی سەربازی نەبووە، بەڵكو بەشداری شۆرشی شێخ مەحمودی كردووەو لە چاوخشاندن بە (یاداشتەكانی) ئەوە دەخوێنینەوە كە دژی بە بنەماڵەیی كردنی شۆڕش بووە. دژی دیكتاتۆریەتو قۆرخكاری بووە، رۆڵی كاریگەری لە بواری پەروەردەو رۆژنامەگەری دیوە. رۆشنگەرەكەی حكومەتی شێخ بووە، كەچی لە ناو حیزبی هیوا خۆی لێبۆتە (ستالین)و دروشمی تەقدیسكردنی سەرۆكی بێ ركەبەری بەرزكردۆتەوە. حیسابی بۆ هاورێكانی لە حیزی هیوا نەكردو پابەند نەبوو بە رێكاری دیموكراسیو ناكۆكیەكانی لەگەڵ هاورێكانی لەسەركردایەتی حیزبی هیوا بە دیالۆگو دیموكراسی یەكلایی نەكردەوە. لە مێژووی حیزبی هیوا نەك كۆنگرەیەكی دیموكراسیانەی تێدا نییە بۆ هەڵبژاردنی سەرۆك، بەڵكو ئەنجومەنێكی سەركردایەتییش نەبووە دیموكراسیانە گفتوگۆ بكەن لەسەر پرسە سیاسییەكان. بەمەش ناكۆكیو دووبەرەكی قوڵ دەكەوێتە ناو حیزبی هیوا. لەگەڵ سەرهەڵدانی شۆرشی بارزان لە ساڵی ١٩٤٤ زۆربەی سەركردەو هەڵسوڕاوەكانی لێی جیادەبنەوەو تەنیا دەمێنێتەوە(٣).

حیزبی شیوعی عێراقی لەگەڵ دروستبوونیدا هیچ كێشەیەكی ناوخۆیی بە دیموكراسیەت یەكلایی نەكردوتەوە، ناكۆكیەكان بە دیموكراسیەت چارەسەر نەكراوە. بەڵكو چارەنووسی لێكترازانو دوایی تاوانباركردنی یەكتر بووە بە خیانەتو كرێگرتەیی لە نێوان خۆیاندا و دواییش لێكترازان. ئایدۆلۆژی وشكو قەناعەتی كۆنكریتی، رای پێچەوانە قبوڵكراو نەبووە، لەگەڵ زنجیرەیەك كۆنگرە بۆ گۆرینی هەندێ دەموچاو بە پلانگیران لە یەكتری، بە بێ گفتوگۆی دیموكراسیانە(٤).

پارتی دیموكراتی كوردستان لەسەرەتاو ناوەراستی پەنجاكان بە دیموكراسیەتێكی بەرتەسكو سنووردار سەركردایەتیو سكرتێری هەڵبژاردووە. بەڵام سەرۆك بە زەبری هێز

هەڵیوەشاندۆتەوەو گۆرانکاری بەبێ گەڕانەوە بۆ ڕای سەرکردایەتیەکەی کردۆتە ئەمری واقیع(٥). ناکۆکییەکانی هەردوو باڵی سەرکردایەتی پارتی دیموکراتی کوردستان لە ١٩٦٤-١٩٧٠ هەموو سیمایەکی سەربازیو تیرۆری جەسەدیو تیرۆری فیکری لەناوخۆیی خۆی مومارەسە کردوە. بۆ یەکلایی کردنەوەی ناکۆکیەکان پەنایان بۆ هەموو شت بردووە دیموکراسی نەبێت. لەکاتێدا ناوی (پارتی دیموکراتی کوردستان) بووە، دروشمی دیموکراسی بۆ ئەو زەمانە لە راگەیاندنەکانی پارتیەوە بریقەی دەدایەوە(٦).

لە دوای دارمانی شۆڕشی کوردی لە ١٩٧٥و سەرەتای سەرهەڵدانی فرەیی لە پارتی سیاسیو ڕێکخراوەیی بۆ ڕێبەرایەتی کردنی شۆڕشی کورد، هەرگیز خەڵکی کوردستان ئەو دەرفەتەیان بۆ نەڕەخسا ئازاد بن کە کام پارتی سیاسی هەڵدەبژێرن، پێشبڕکێ بۆ خەیاڵی (پارتی پێشڕەو)، پاوانخوازی لەبەرانبەر یەکتر، لە واقیعدا دیموکراسیەت زۆر غایب بوو. کەچی لە نووسینو بەیاننامەو بڵاوکراوەکاندا بە بێ جیاوازی ئەوپەڕی زەق دەکرایەوە. خوێناویترین قۆناغی شەڕی ناوخۆ لە هەشتاکانو هێنانی دەستی دەرەکی بۆ پشتگیری ئەم حیزب بەرانبەر بە ئەو حیزب، ئەوەی مومارەسەی نەکرا ئازادی بیروڕاو مافی مرۆڤ و ئازادی بیروڕای سیاسیو یەکتر قبوڵکردن بوو(٧).

### هێزە ئیسلامییەکانو دیموکراسی

هێزە ئیسلامیەکان بە بەراورد لەگەڵ هێزە عەلمانیەکان، ئاڵوگۆری ئاشتیانەی دەسەڵات لە سەرکردایەتی کردنیاندا باشتر بووە. ژمارەی کۆنگرەکانیان لەچاو تەمەنیان زیاتر بووە، کەچی ئەمڕۆ زیاتر ئەوان بەنەیاری دیموکراسیەت ناوزەد دەکرێن(٨). لەگەڵ ئەوەشدا لەبەرانبەردا هێزە عەلمانیەکان خاوەنی بیرۆکەی دیموکراسین کەچی ژمارەی کۆنگرەکانیان کەمترن و شتێک نییە بەناوی گۆڕینی سەرکردە(٩). ئەمە ئەوە ناگەیەنێ بزاڤی ئیسلامی گرفتی هەزمنەکردنی دیموکراسیو ئاڵوگۆڕی دەسەڵاتی نەبێ، بەڵکو گرفتی کەمی مەعریفە بە چەمکەکانی دیموکراسیو دیدی زۆر سەلەفیانە بۆ چەمکە هاوچەرخەکانی هەیە.

کەواتە خۆکردنە نەیاری دیموکراسی لەلایەن رەوتی ئیسلامییەوە بە پارتە سیاسییەکانیەوە، بە ڕێکخراوەکانیەوە، بەرۆشنبیرو بانگەوازخوازەکانیەوە، لە واقیعی مەیدانیو هەنگاوە کردەییەکاندا ناگونجێ، چونکە:

١- یەکەم قوربانی غیابی دیموکراسی لە کوردستان ئیسلامیەکانن، یەکەم سوومەندی نوزەی دیموکراسیش ئیسلامیەکانن، کە ئەگەر لە کوردستان مومارەسەر بکرێ. بۆیە داکۆکیکار بۆ سەرکەوتنو مومارەسەی دیموکراسیەت لە کوردستان دەبێ ئیسلامیەکان بن.

٢- ئەگەر پارتو ڕێکخراوە سیاسییەکان لەناو خۆیاندان دیموکراسی نەبن ناتوانن لە حوکمڕانیو لەگەڵ کۆمەڵگاو لەبەرانبەر مونافیسەکانیان دیموکراسی بن. لەو ڕووەوە پارتە ئیسلامیەکان زیاتر جێی ئومێدن بۆ ئایندەی دیموکراسی لە هەرێمی کوردستان، کەچی لە ڕووپەڕی ڕۆژنامەو راگەیاندنەکاندا ئیسلامیەکان نەیاری دیموکراسیەتو عەلمانیەکان دۆستی دیموکراسیەتن, ئەمە زۆر کورتبینیو تێنەگەیشتنە لە واقیع.

ئەمە لەناو کۆمەڵگا ڕۆژهەڵاتییەکان هەمان پێودانگە، جەنەراڵە عەلمانیەکانی عەرەبی لە میسرو سوریا دیموکراتیەتیان ناشیرن کردووە، کەچی رەوتی ئیسلامی کەوتونەتە گیانی دیموکراسی.

ئەم نەیاریەی رەوتی ئیسلامی بۆ دیموکراسی بەشێکی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە (عەلمانیەت)و (دیموکراسیەت)ی تێکەڵ کردووە، بە یەک ئاست پێوانەیان دەکات.

ئەوەی جێی سەرنجە رۆژانە لە ناو رەوتی ئیسلامی، دیموکراتیەت وەکو نەگبەتیو نەهامەتی بۆ میللەتی کورد ناشیرین دەکرێ, مەبەست لە مەیدانی نوسینو قسە لەسەر کردنە، کەچی پارتە ئیسلامیو رێکخراوە ئیسلامیەکان بە کردەوە کەمترین تەشهیریان بە ماناکانی دیموکراسی کردووە، لەبەرانبەردا پارتە عەلمانیەکان بەکردەوە ماناکانی دیموکراتیەتیان ناشیرین کردووە، کەچی لە ئەدەبیاتیاندا کەمترین رەخنە لە دیموکراتیەت دەگرنو هەتا ئیستاش وەکو دروشمی بریقەدار باسی دەکەن.

**پەراوێزەکان:**

(١) سەرقاڵی نوسینی ماستەرنامەم لەسەر دەرهاویشتەکانی شەڕی ناوخۆی نێوان هێزە سیاسیەکانی کوردستانی باشووری لە ١٩٧٥ بۆ ١٩٩٢ لە نێوەدا خەرمانەیەکی زۆر باشم کۆکردۆتەوە لەسەر غیابی دیموکراسیەت لەناو پارتە کوردییەکانو ئەو بۆشاییە گەورەیەی هەیانە لە نێوان دروشمو کردار لەسەر پرسی دیموکراسیەتو یەکتر قبوڵا کردن.

(٢) بۆ زانیاری زیاتر بروانە د.عوسمان عەلی –چەند لێکۆڵینەوەیەک دەربارەی بزاڤی هاوچەرخی کورد –بەرگی یەکەم – وەرگێرانی کامەران بابانزادە

(٣) –عبدالستار طاهر شريف :الجمعيات والمنظمات والاحزاب الكردية – د.مكرم طالباني :بعض الصفحات من نضال حزب هيوا (٤) – جمال نەبەز :پارتی کۆمۆنیستی عێراق –فاروقی مەلا مستەفا :یاداشتەکانم

(٥) –رەهەندەکانی بیری سیاسیی کورد پاش جەنگی دووەمی جیهانی : فەرید ئەسەسەرد .

(٦) – د.شیرکۆ فتح الله : پارتی دیموکرانی کوردستان و بزوتنەوەی رزگاریخوازی نەتەوەی کورد لە عێراقدا ١٩٤٦–١٩٧٥ .

(٧) –بڕوانە نەوشیروان مستەفا :یەکتری دەشکێنن

(٨) بزوتنەوەی ئیسلامی هەتا ساڵی ٢٠٠٠ لەماوەی ٢٢ ساڵەی تەمەنیدا ٨ کۆنگرەی بەستووە, ٢٠٠٣ بۆ ئێستا ٤ کۆنگرەی بەستووە, کۆمەڵی ئیسلامی لە ٢٠٠١ بۆ ئێستا ٣ کۆنگرەی بەستووە, یەکگرتووی ئیسلامی لە ١٩٩٤ بۆ ئێستا ٧ کۆنگرەی بەستووە, لە میانی ئەو کۆنگرانەدا ٦ جار بەرپرسی یەکەم لەرێگەی کۆنگرەوە گۆڕاوە.

(٩) یەکێتی نیشتیمانی کوردستان لەتەمەنی ٤٣ ساڵەی خۆیدا ٣ کۆنگرەی بەستووەو پارتی دیموکراتی کوردستان لەتەمەنی ٧٢ ساڵەی خۆیدا ١٢ کۆنگرەی بەستووە. لە هیچیان لەڕێگەی کۆنگرەوە سەرۆک نەگۆڕاوە. کۆنگرەکان زیاتر بۆ لەناوبردنی کوتلەکانی نەیار بە سەرۆک بوون, نەک گۆڕینی سەرۆک. ئەمە بۆ پارتو رێکخراوەکانی دیکەی کوردستانی باشوورو باکوریش راستە.

# دیموکراسی لە پەیوەندیدا لەگەڵ پەروەردەو فێرکردن

پرۆسەی بیناکردنی کۆمەڵگەی دیموکراتیك قسەوباسێکی چڕوپڕ لەخۆی دەگرێت، هێندێك بیرمەندو فیکرزان وای بۆدەچن کە هەموو میللەتێك دەبێت لە کایەی ڕامیارییەوە پێبنێیتە نێو پڕۆسەی بیناکردنی ژێرخانی دیموکراسی، هێندێکی تر کە قوڵتر و وردتر لە باسەکە دەنۆڕن، پێیان وایە کە دەبێت ژێرخانی دیموکراسی لە کایەی کولتوری و پەروەردەو فێرکردنەوە بنڕێژبکرێت.




**بوخاری عەبدوڵای قەسری**

لەدایکبووی ١٩٩٠ شاری هەولێر. خاوەنی دوو پەرتوکی وەرگێڕدراوە. مامۆستا لە زانکۆی سەلاحەدین و زانکۆی ئیشق

دیموکراسییەت لەپێشێدا لە پەروەردەو قوتابخانەوە دەستپێدەکات و گەشەدەکات تا لەکۆتاییدا لە سیاسەت و هەڵبژاردن و دامەزراوە حکومییەکان دەگاتە لوتکە. ئەمەش بەو واتایە دێت کە ناگونجێت کۆمەڵگەیەک بە بۆن و ڕەنگی دیموکراسی ڕووپۆش بکرێت ئەگەر لە بنەچەوە بناخەی کولتوری ئەو کۆمەڵگەیە بە ئەقڵییەتی دیموکراسی و لێکگەیشتن و فرەیی و پێکەوەیی دانەمەزرابێت. پۆلی دووەمی بیرمەندان لە (تاک) ەوە بۆ (کۆمەڵ) دەڕۆن و وەهای دەبینن کە ناگونجێت کۆمەڵگەیەکی دیکتاتۆر و تاکڕەو، یان وەپاشکەوتوو و خێڵەکی، ببێتە کۆمەڵگەیەکی فرەڕەنگ و دیموکراتیک مەگەر لە گۆڕینی ڕیشەیی (تاک) ەوە دەستپێنەکرێت. ئەوان ڕۆشنایی دەخەنە سەر (تاک) و بە جەوهەری کایەی دیموکراسیی دەبینن. بەو واتایەی کە ئەگەر بمانەوێ کۆمەڵگەیەک بهێنینە ئاراوە کە هەموو پێکهاتە جیاوازەکان بە پێکەوەیی و تۆلێرانسەوە لە سایەی میرییەکی پڕ لە دادگەریدا بژین، یەکسانی و پێکەوەژیانی کۆمەلایەتی بەرقەرار بێت، دەبێت سەرەتا تاکەکانی ئەم کۆمەڵگەیە بە کولتوری پێکەوەیی هۆشیار بکرێن. دیموکراسیەت بەو واتایە پێش ئەوەی سیاسەت بێت کولتورە. ئەگەر دیموکراسییەت (بە واتای ڕزگاربوون لە تاکڕەویی و تاکپەرستی و داسەپاندن) لەسەر ئاستی تاک قبوڵنەکرێت، ناگونجێت بە هیچ شێوەیەک لەسەر ئاستی کۆمەڵ و چڤات بناخەڕێژ بکرێت و دابمەزرێت. بیرمەندی ئەمەریکی (نۆددینگ) Noddings کە دکتۆرای لە پەروەردەناسیدا هەیە، لەمبارەیەوە دەنوسێت:

“One powerful lesson we have learned in the past few decades is that the form of life we call democratic cannot simply be imposed on cultures unprepared for it”

واتە: یەکێک لەو وانە بەهێزانەی کە لەم چەند دەیەی ڕابردوودا فێری بووینە، ئەوەیە کە نالوێت و ناگونجێت هیچ شێوەو شکڵە ژیانێکی دیموکراتیک بەسەر هیچ کۆمەڵگەیەکدا «بسەپێنرێت» ئەگەر کولتوری ئەو کۆمەڵگەیە پێشوەختە بۆی ئامادەساز نەبوبێت و قبوڵی نەکات.

کەوایە دیموکراسیەت (ئەگەر بە واتای قبوڵکردنی فرەیی بێت) پێش ئەوەی ڕژێم و قاڵبێکی سیاسی بێت، ئەقڵیەتێکی کولتوری و پەروەردەییە، قبوڵکردنێکی کۆمەڵایەتییانەیە، بیرکردنەوەیەکی مرۆییانەی تاکەکەسییە.

ئەم نوسینەم، هەوڵێکە بۆ دووان لەسەر پەروەردەکردنی (تاک) لەسەر بنەما مرۆییەکان، ئەو بنەمایانەی کە لە وڵاتە دیموکراتییەکاندا بوونیان هەیە. لە ڕاستیشدا نوسینەکەم هیچ بیانووگیری و ڕێخۆشکردن و ڕازاندنەوەو بانگەشەیەکیش نییە بۆ (دیموکراسی) وەک ڕژێمی ئایدۆلۆژی یان سیاسی، دیموکراسی بابەتێکی ئاوکێش و ڕاجیاهەڵگرەو، قسەو باس لەسەر ئەم بابەتەش زۆر نوسراوە، بەڵکو هەوڵدانێکە بۆ تێگەیشتن لەو بنەما مرۆییانەی کۆمەڵگەی دیموکراسی کە ئێمەی مسوڵمان و ڕۆژهەڵاتی دەشێت لە بواری پەروەردەی مەدەنییدا کەڵکیان لێ وەربگرین، بۆ پەرەپێدانی تێگەیشتنەکانی خۆمان لەمەڕ پەروەردەو فێرکردن.

**ئازادی**

پەروەردەو فێرکردن دەبێت لە بنەچەوە ڕێبیری (ئازادی) لە ناخ و جەوهەری مرۆڤدا چەکەرە پێبدات. هیچ قوتابخانەو دانیشگاو مەدرەسەو زانکۆیەک بەبێ ئازادی نالوێت و ناشێت هیچ فێرکردنێک لە مرۆڤدا بهێنێتەدی. فەلسەفەی پەروەردە لەوەدا چڕ دەبێتەوە کە مرۆڤ لە هەموو ئەو کۆت و بەندانەی خراونەتە سەری ئازاد بکات، واتە مرۆڤ جارێکی تر ئاشنا بکاتەوە بە هەناسەی ئازادی. مرۆڤ لەو سنورانەی مرۆڤ بۆی کێشاون بهێنێتە دەرەوە، بیکاتەوە بەو مرۆڤەی کە خودا بە ئازادی دروستیکردووە. بە واتایەکی

فەلسەفییتر، پەروەردە بریتییە لە لابردنی سنوورە دەستکردەکان. مرۆڤی ئەم ڕۆژگارە بە چەندین جۆری کۆت و بەندی کۆیلایەتی دەستبەستراو کراوە، کۆت وبەندی بازاڕ، مۆڵ، مارکێت، سیاسەت، حیزب، ڕێکلام و پارە، سەرمایەداری و بزنس، مۆدێلات و فاشن. بۆیە ئەرکی پەروەردە ئەوەیە کە مرۆڤ لەو جەنجاڵییانە بهێنێتە دەرەوە، جارێکی دیکە مرۆڤ بە خودی خۆی بناسێنێتەوە، ئەو «خودناسیی» یەی کە مرۆڤی مۆدێرن زۆر لێی دوورکەوتۆتەوە، وەک ئەلیکسس کاریل لە کتێبی Man the Unknown دەڵێت: «مرۆڤ لەم ڕۆژگارەدا بە هەموو شتێک زانستی پەیداکردووە لە دەوروبەریدا، بەڵام بە ناسینی خودی خۆی دوورکەوتۆتەوە».

خودی ژینگەی پەروەردەو فێرکردن دەبێت ژینگەیەکی ئازادپەروەرانە بێت. ناکرێت مرۆڤێک بە ناچاری فێری وانەی ئازادی و سەربەستی بکەی! بەجۆرێکی دیکە بڵێم، مرۆڤ دەبێت وانەی ئازادی هەستپێبکات نەک بیبیستێت! هەر ئەمەشە وایکردووە کە کوتەکی فێرکردن و دەرسپێدان ، یان زللەو شەقی فێرکار هیچ فایدەیەک نەدەن بە قوتابخانە. لە حاڵێکی وەهادا کە توندوتیژی بوونی هەیە، قوتابخانە نەک ژینگەی فێربوون و وەرگرتن و زانیاریبەخشین و دەرسخوێندن نییە، بەڵکو مەڵبەندێکی چەوساندنەوە oppression و بەکۆیلەکردنیشە. هەر ئەوەیە کە نوسەری بەڕازیلی (پابلۆ فریری) لە پەرتوکی (The Pedagogy of the Oppressed ) باس لەوە دەکات کە هێندێجار دەشێت قوتابخانەو زانکۆ لەبری بەخشینی ماریفەت و پەروەردەی ڕاستەقینە ببنە مەڵبەندی زەبروزەنگ و چەوساندنەوە، چ لەڕووی ئەخلاقی و دەروونییەوە بێت، یان فیکری و سیاسی، یانیش جەستەیی و فسیۆلۆجی.

تۆ دەگونجێت مرۆڤێک ناچاربکەی شتێک (لەبەر بکات) یان (ئەزبەر بکات)، بەڵام ناشێت ئەم ناچارکردنە فێری بکات، بۆیە ناتوانی مرۆڤێک لەژێر چەکوش و گۆچان و شەقدا فێری هیچ ماریفەت و مەعریفەیەک بکەی، چونکە فێربوون پرۆسەیەکی تەواو ئاڵۆزکاو و قووڵە، پابەندە بە دیتن و تێبینیکردن و سەرنجلێدان، هەروەها نمایشکردن و تێفکرین و لێوردبوونەوە، پاشان وەرگرتن و لێحاڵیبوون. بۆیە، ناشێت هیچکام لەم قۆناغانەی فێربوون بێتەئاراوە بەبێ ئازادی ویستن و قبوڵکردن، وە ئەو ئازادییەش دەبێت لە (ناخ) ەوە دەستپێبکات. مرۆڤ دەبێت ئازاد بکرێت لەوەی کە دەیەوێت چی فێر ببێت. ناشێت فێرخواز ناچار بکرێت لە دەرەوەی (ویست و ئارەزوو)ی خۆی پاڵبدرێت بەوەی فێربوون ئەنجامبدات، هەر ئەمەشە کرۆکی فەلسەفەی پەروەردەی دیموکراتیک کە لە کۆی پرۆسەی فێرکردن و پەروەردەی کۆمەڵگەی خۆمان بوونێکی لاوازی هەیەو تائێستا بە هەند وەرنەگیراوە.

**یەکسانی**

ململانێی هەرە گەورەو کۆششی هەرە زەقی هەمو پێغەمبەران (درودی خوایان لەسەر بێ) و فەیلەسوفان و بیرمەند و شۆڕشگێران و سیاسییە مەزنەکان لەوەدا چڕدەبێتەوە کە ویستوویانە کۆمەڵگەی مرۆیی لە کۆمەڵگەی ستوونییەوە بگۆڕن بۆ کۆمەڵگەی ئاسۆیی. بەجۆرێکی تر بلێم، هەموویان لەوەدا کۆششەکانیان خەستکردۆتەوە کە چینایەتی و پلەبەندی و تاقم و پێڕ و کلاس و گرۆهی کۆمەڵایەتی تێکوپێک بروخێنن و بیانتوێننەوە، تەنها یەک کۆمەڵ پێکبهێنن ئەویش کۆمەڵی گەورەی مرۆڤایەتییە، دوور لە چین و تاقمی گەورە و بچوک، یان بەرز و نزم. لە دیدی هەموو گەورە مرۆڤانی مێژووی بەشەریەتدا (بۆیە ناڵێم «گەورەپیاو» چونکە مەرج نییە مرۆڤە گەورەکانی بەشەرییەت تەنها نێر بووبن!) مرۆڤایەتی خێزانێکی گەورەیە و هەمو جیاکارییە ئابووری و نەتەوەیی و ڕەگەزییەکان داهێنراوی دەستی مرۆڤ خۆیەتی، بۆیە دەبێت مرۆڤ لێی

ڕزگار بێت تاوەکو ببێتەوە ئەو مرۆڤەی کە بە گەورەیی دروستکراوە. لەڕاستیدا، مرۆڤ بەو دابەشکارییەی کە کردویەتی لەنێوان (ڕەگەز و ئاین و پۆل و چین و نەتەوەو گروپ و خێڵ و خوێن و ئایدۆلۆجیا) کۆمەڵێک بازنەی بچوکی داهێناوە، مرۆڤی بچووککردۆتەوە، وە ئەسڵەن مرۆڤی لە (مرۆڤبوون) ی خۆی داشۆریوە. بۆیە ئەرکی گەورە مرۆڤەکانی مێژوو ئەوەبووە کە ئەو بازنە بچووکانە تێکبشکێنن و مرۆڤ جارێکی دیکە بگێڕنەوە شکۆی ڕاستەقینەی خۆی کە برتییە بە (مرۆڤبوون) وەک خۆی.

ئەرکی سەرەکی پەروەردەی دیموکراتیک بریتییە لە لابردنی ئەو جیاکارییە ڕەگەزپەرستییانە. لابردن واتە کاڵکردنەوەی ڕەگەزپەرستیی بە هەموو جۆرەکانیەوە. هەڵبەت لێرەدا هەڵە تێگەیشتنێکی گەورە هەیە: هێندێک لە سێکیولارەکان پێیانوایە کە پەروەردە دەبێت لەپێناوی پاراستنی یەکێتی سەرجەم ئایینەکان لە پرۆگرام و پرۆسەی فێرکردندا ئەرزش بۆ هیچ ئایینێک دانەنێت، ئاین لە پەروەردە دابڕنێت، بە چاو نوقاندن لەوەی کە ئاین چ ڕۆڵێکی گەورە دەبینێت لە پەروەردەی فیکر و هۆش و ئەقڵ و ئەخلاق و جەستە و ڕۆحی مرۆڤ. ئەمەش بەو بیانووەی کە ئایینەکان جیاکاری دروستدەکەن لەنێوان مرۆڤەکان! بۆیە سێکیولارەکان (بەتایبەت مولحیدەکان) هەوڵی ئەوە دەدەن کە پەروەردە بە یەکسانی سەرجەم ئایینەکان فەرامۆش بکات! بەڵام لەڕاستیدا ئەوە هەڵە تێگەیشتنە لە پەروەردەی دیموکراتیک و جۆرێکیشە لە خۆهەڵکێشانی چەواشەکارانە، چونکە ئەسڵی پەروەردەی دیموکراتیک ئەوە نییە ئایینەکان لە کایەی پەروەردەدا بسرێنەوە، بەڵکو بریتییە لە هێشتنەوەی شکۆی ئایینەکان بۆ هەر تاقم و پێڕێکی ئایینی بە تایبەتمەندێتی خۆیانەوە، بەبێ ئەوەی پرۆگرام و بیرکردنەوەو بیروڕای هیچ ئاینێک لە پەروەردەدا بەسەر هیچ گروپێکی دیکەی ئایینیدا بسەپێنرێت. دیموکراسیەت بریتی نییە لە دابڕاندنی ئاین لە کۆمەڵگە، بەڵکو دیموکراسی واتە پێدانی مافی خۆدەربڕین و خۆمومارسەکردن بۆ گروپە ئایینییەکانی کۆمەڵگە بە یەکسانی، هەرکەس بە قەبارەی خۆی. واتە هێڵکێشان بۆ گروپە جیاوازەکانی کۆمەڵگە بەجۆرێک کە کەس مافی ئەویتر نەبەزێنێت و هەمووان هەست بە هەبوونی ناسنامەی ئاینی خۆیان بکەن. واتە لێرەدا پەروەردەو فێرکردن هەلی یەکسانی تێگەیشتن و بیرکردنەوەو خوێندن و تاوتوێکردنی ئایینیانە لەنێو ژینگەی خوێندندا دەرەخسێنێت بۆ هەموو گروپ و دەستە ئایینییەکان، بەجۆرێک کە هەر گروپێکی ئایینی مومارەسەی تێگەیشتنی ئایینیانەی خۆی دەکات لە نێو پرۆسەی پەروەردەدا، بەبێ ئەوەی تێگەیشتنی ئایینیانەی هیچ گروپێکی دیکەی ئایینی بەسەردا فەرزبکرێت.

ئەوەی کە لێرەدا جەختی لەسەر دەکەمەوە، ئەوەیە کە پەروەردەی دیموکراتیک دەبێت کۆمەڵگەیەک بهێنێتە ئاراوە کە تاک تێیدا شکۆ و هەیبەت و ڕێزی خۆی پارێزراو بێت، بەدەر لەوەی خاوەنی چ ناسنامەیەکە، چ ئاینێکە، چ بیروڕایەکی سیاسییە، یان چ ڕەگەزێکی نەتەوەییە. ئەگەر سەرنجێکیش لە وڵاتە دیموکراتییەکانی دنیا بدەین (هەڵبەت مەسەلەی دیموکراتی بوون و دیموکراتی نەبوونیش باسێکی موتڵەق نییە و ڕێژەییە، هیچ وڵاتێکی سەر ئەم زەمینە دیموکراتی خاوێن و ئایدیالی نییە)، دەبینین کە لە قوتابخانە ودانیشگا و زانکۆکانیاندا چەندێتی و چۆنێتی مەعریفە و زانیاری و تیۆرە زانستییەکان جەختیان پتر لێ دەکرێتەوە نەک ناسنامەی تاکەکەسی تاکەکان و پلەو ڕێژەی پابەندییان بە ئاین، یان نەتەوایەتی، یان ڕەگەزی نێرومێ. بۆیە پرۆسەی پەروەردەی دیمۆکراتیک دەبێت هەلی یەکسانی فێربوون و زانین بۆ تاک بڕەخسێنێت بەدەر لەو جیاکارییانە. هەر ئەمەشە هۆکاری گەشەی توێژینەوەو تاقیگەو



# دیموکراسییەت لەپێشێدا لە پەروەردە و قوتابخانەوە دەستپێدەکات و گەشەدەکات تا لەکۆتاییدا لە سیاسەت و هەڵبژاردن و دامەزراوە حکومییەکان دەگاتە لوتکە.

زانستگا و تیۆرەکانی وڵاتە دیموکراتییەکان، وە هەر ئەمەشە وایکردووە کە تاک لە وەها کۆمەڵگەیەکدا ئاستی کەسایەتییەکەی لە هەڵکشان و نەشونماکردندایە، نەک مراندن و داپڵۆساندن، وەک وڵاتە دیکتاتۆرییەکان.

لە مێژووی ئیسلامیشدا، ئەگەر سەرنج بدەین، فرەیی ئاینی و ڕەگەزیی و نەتەوەیی بە هیچ شێوەیەک نەبۆتە بیانوێک بۆ ڕێگرتن لە هیچ وێنە و فۆرمێکی پەروەردە و فێرکردن. قوتابخانە زانستیی و هزرییەکان پڕاوپڕبوونە لە فێرخوازی هەمە چەشن کە لەوبەر تا ئەمبەری دنیا بە چەندین نەتەوەو ئاینی جیاوازەوە هاتوون و گردبوونەتەوە بۆ وەرگرتنی زانست. دەشتوانم لێرەدا ئەوە بڵێم کە شارستانیەتی دیموکراتیی ڕۆژئاوا سوودێکی زۆری لەو فرەیی و پێکەوەژیانییە شارستانییەی سەردەمی زێڕینی ئیسلام بینیوە لەوەدا کە (زانست) ببێتە چەتری کۆکردنەوەی سەرجەم ئاین و نەتەوەو ڕەگەزەکان.

بۆ ئەم خاڵە دوو نمونە دەهێنمەوە: ئیبنوسینا (٩٨٠-١٠٣٧)، کە گەورەترین پزیشک و فەیلەسوف و زانای جیهانی ئیسلام بووە لە زەمەنی دێریندا، لە بنەچەدا خەڵکی (ئۆزبەکستانی ئێستا) بووە، بەڵام لە هەمەدان و ئەسفەهانی ئێران ژیاوە، زووتریش لە خەواریزم و ڕەی و جورجاندا کاری پزیشکی کردووە. گرنگتر لەوە ئەوەیە کە لە حەوزەی دانیشگاکەیدا فێرخوازی ئینگلیزو یۆنانی و لاتین بوونیان هەبوە، فێرخوازی فارس و عەرەب و تورک هەبووە، ئەفغان و کورد پێکەوە دانیشتوون. مسوڵمان و کرستیان و جولەکە بە یەکسانی فێرخوازی ئەم کەڵە زانایە بوونە. ئەم کەشوهەوایە یەکسانە لە شارستانێتی ئیسلامیدا وایکردبوو کە خوێندەواری و فێربوون لە گەشەکردندابێت.

فاڕابی (٨٧٤-٩٥٠) گەورە پزیشک و زانا و مۆسیقاژەن و فیزیاناس و فەیلەسوفی ئیسلام لە بنچەدا خەڵکی (تورکمانستان) بوە، لەسەردەستی دوو مامۆستای کرستیان فێری ئەم زانستانە بووە، یەکێکیان ناوی (یوحەننا بن حیلان) بوە، ئەویتریش ناوی (ئەبی بیشر مەتا بن یونس) بووە! بۆیە مەسەلەی کرستیانبونی ئەم دوو مامۆستایە ڕێگر نەبووە لەوەی کە مسوڵمانێک ببێتە فێرخواز و زانست و بیر و فەلسەفە و هونەریان لێوە وەرگرێت.

دەبێ ئەوەش ڕەچاو بکەین کە پرۆسەی پەروەردە ( بە واتا فرەوانیە مرۆڤایەتییەکەی) لە خودی خۆیدا پرۆسەیەکی جیهانییە universal و سنوورە جیۆگرافییەکان دەبەزێنێت، ئاڵای وڵاتان ناناسێت، حیزب و ئایدۆلۆژیا سیاسییەکان فەرامۆش دەکات، بەو واتایەی کە ئەگەر توێژینەوەیەکی زانستی یان تێز و تیۆرێکی پەروەردەیی لە ناوچەیەکی دیاریکراو ئیسپاتببێت، یان داهێنانێکی تەکنەلۆژی بهێنرێتە ئاراوە، هیچ ڕێگرێک لە ئارادا نییە کە هەمان دەرئەنجامی زانستی و پەروەردەیی لە وڵاتێکی تردا یان لە ناوچەیەکی دیکەی جیۆگرافیدا کەڵکی لێ وەربگیرێت و ببێتە موڵکی هەموو مرۆڤ بە ڕەنگ و دەنگە جیاوازەکانەوە.

ئێمە کە ئامێری تەکنەلۆژی وەک تەلەفیزیۆن و مۆبایل و تەلەفۆن و یەخچاڵ و گەسکی کارەبایی و گڵۆپ....هتد، بەکار دەهێنین، لەوە ناپرسین کە ئاخۆ فلان دەوڵەت بۆ هاونیشتیمانیەکانی خۆی دروستیکردووە یان بۆ هەموو جیهان رێگەی داوە، هەر زوو ئەو هەست و بیرکردنەوەیەمان هەیە کە ئەو ئامێرانە سنورەکان دەبەزێنن و دەبنە موڵکی هەموو مرۆڤێک لە هەر پارچەیەکی دنیا. بۆیەش پەروەردەناس و زاناکان بەو چاوە یەکسانییە تەماشای پرۆسەی زانستوەرگرتن و توێژینەوە دەکەن و، هەر ئەمەش وایکردوە بتوانن خزمەت بە هەموو مرۆڤایەتی بکەن، نەک چین و توێژ و رەگەز و نەتەوەیەکی دیاریکراو.

### رێزگرتن لە توانستە جیاوازە مرۆییەکان

کار و ئەرکی هەرە سەرەکی پەروەردە برتییە لە گەشەپێدان بە (مرۆڤ)، وە بەرزکردنەوەی ئاستی رەوشتی و هۆشەکیی و فسیۆلۆژی و رۆحیی مرۆڤ. هەر مرۆڤێک توانستێکی خۆرسکانەی هەبێت، پەروەردە دێت گەشەی پێدەدات، باڵای دەکات، دەریدەخات و وەگەڕیدەخات لە بواری داهێنکاریدا. بۆیە پەروەرشکارە دیموکراتییەکان بەپێچەوانەی تاکڕەو و دیکتاتۆرەکان هەوڵدەدەن لەو ئالۆزییەی مرۆڤ حاڵیببن، حاڵی ببن لەوەی مرۆڤەکان ناچۆنیەکان لە حەز و خولیا و توانایی وگرنگیپێدان. پەروەرشکارە دیموکراتییەکان هەوڵدەدەن مرۆڤ بە قوڵی بناسن و رێز لەو فرەییەی مرۆڤ بگرن و گرنگی بە هەموو دووریە جیاوازەکانی بوونی مرۆڤ بدەن. پەروەردەی دیموکراتیک جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە مرۆڤەکان لە ئاستی تێگەیشتنیان بۆ دیاردە ژیانییەکان لێکجیان، ناچۆنیەکن، بۆ وێنە: ئەو دیمەنەی کە بەلای منی فێرخوازەوە (جوان) بێت، رەنگە بەلای فێرخوازێکی دیکە (دزێو) بێت! ئەمە دەگەڕێتەوە بۆ خوڵق و سەلیقەی ئینسانی جیاوازی ئێمەوە. یاخود، ئەوبۆچوون و ئایدۆلۆژیایەی بەلای منەوە (باش و گونجاو) بێت، ئەگەری ئەوەی هەیە بەلای فێرخوازێکی دیکەوە رەتکراو بێت و جێگەی قبوڵکردن نەبێت. رەنگە هەرکامیشمان ئارگیۆمێنت و بەڵگەکاری خۆشمان هەبێت. بۆیە ژینگەی دیموکراسی لە پەروەردەدا، رێگە دەدات هەرکام لەم دەنگ و را و بۆچوونە جیاوازانە گوزارشت لەو بۆچوونە فرەییانەی خۆیان بکەن.

پەروەردە و فێرکردن لە وەها حاڵەتێکدا رێز لە شێوازە جیاوازەکانی هەر مرۆڤێک دەگرێت لەوەی کە دەیەوێت (چلۆن) فێرببێت. وشەی چۆن How? زۆر بە بایەخە لە پەروەردەی دیموکراتیک دا. ئێمەی مرۆڤ هەرکاممان رێگایەکمان هەیە بۆ فێربوون، دەروازەیەکمان هەیە بۆ روانین، دیدگایەکمان هەیە بۆ سەیرکردن، ئەزموونێکمان هەیە بۆ لێتێگەیشتن و هەرسکردن. بۆیەش دەبینین راستە لە پۆلێکدا رەنگە چەند فێرخوازێکی کەم ئامادە بن، بەڵام چەندین رێوشوێن و میکانیزم و میتۆد و شێوازی جیاوازیان پێویستە بۆ ئەزموونکردن و چەشەکردنی راستەقینەی فێربوون. هەرئەمەشە وایکردوە کە پەروەرشکارە دیموکراتییەکان جەخت لەسەر پرۆسێسی (ئەزموونکردن)ی فێربوون بکەن نەک (گواستنەوە)ی فێربوون. لە پەروەردەی تراديشناڵی دیکتاتۆریدا رەنگە فێرکار بە نائاگایی خۆی چەوساندنەوە بەکاربهێنێت لەوەی کە سەرجەم فێرخوازەکان ناچار دەکات تەنیا بە یەک دیدگا سەیری تاقیکردنەوەیەکی زانستی بکەن، بە یەک شێواز بابەتێک وەربگرن، بە یەک وەڵام شیکاری پرسیارێکی زانستی بکەن. لەبارەی ئەم ئاریشەوە، مایکیل ئولجێنس کە توێژەری زانکۆی (ئابۆ ئەکادیمی) یە لە فنلەندا (ئەو وڵاتەی کە پەروەردەی دیموکراتیک بەرێژەیەکی بەرچاو پیادە دەکات)، لە توێژینەوەیەکدا بەناوی Democracy and normative education دەڵێت:

Education is not about imposing things but about supporting individuals to develop





such kind of self-reflective thinking and such reflexive relation to others

واتە: پەروەردە و فێرکردن بریتی نییە لە سەپاندنی کۆمەڵێک شت، بەڵکو بریتیە لە پاڵپشتیکردن و هاندانی تاکەکان بەوەی کە ئەزموون و بیرکردنەوە تاکەکەسییەکانی خۆیان پەرەپێبدەن بەوەی باشتری لێبکەن، وە لەگەڵ هی ئەوانیدیکەش بەراوردی بکەن.

بۆیە لەوەها سیستمێکی پەروەردەییدا، فێرخواز دەبێتە جەمسەرو چەقی فێربوون نەک فێرکار! بەو واتایەی کە فێرخواز خۆی دەبێت بە چەلەنگی و چالاکانە ئەزموونە تایبەتییەکانی خۆی لەگەڵ هەرسکردنی باسێکی زانستی یان فیکری، یان ئەدەبی، فەلسەفی، ئاینی...هتد، بگەیەنێتە ئاستێک کە زانیاریەکان (تاقیبکاتەوە) نەک (وەربگرێت) وەک خۆی بەبێ پرسیارکردن و گومانکردن.

پوختەی قسە، لە بیناکردنی کۆمەڵگەی دیموکراتیک (کۆمەڵگەیەک کە تێیدا هەرتاکێک رێز لە بوون و بۆچون و شێوەژیانی تاکەکانی دیکە بگرێت)، حەوجێمان بە کۆششی چاکسازکردنی پەروەردە هەیە. پێویستیمان بە رژێم و دەستورێکی پەروەردەیی هەیە، وە حەوجێمان بە بیرکردنەوەو ئەقڵیەتێکی پەروەردەیی هەیە، کە ئەو پانتاییە ئازادییە بە (تاک) ببەخشێت هەست بە ناسنامەی خۆی بکات وەک مرۆڤێکی رێز لێگیراو، بەدوور لە هەر جیاکاری و چەوساندنەوەیەکی رەگەزپەرستی، دەمارگیری، نەژادپەرستی، رەنگسەپاندن.
پێویستیمان بە ژینگەیەکی مەدەنیانەی پەروەردەیی هەیە کە (تاک) ببێتە سەنتەری گرنگی پێدان و پێگەیاندن و پەروەردەکردن، بەجۆرێک کە رێز لە توانستە کەسییەکانی بگیرێت و خولیاکانی لەژێر هیچ ناوێکدا نەچەپێنرێت. لە وەها کۆمەڵگەیەکی پەروەردەییدا کۆمەڵگەی مرۆڤدۆست بەرهەمدێت، کە مرۆڤ هەست بە باڵابوون دەکات نەک رووخاندن، وە داهێنانیش دێتە ئاراوە.

**سەرچاوەکان:**


١- عەبدورەحمان وەهاب. مەلەی دژە رەوت: پەروەردە لە روانگەیەکی رەخنەگرانەوە.

٢- صبحی سلیمان. العلماء العرب، دار العالمیة للنشر والکتاب.

3- Freire, Paulo. .Pedagogy of the Oppressed.

4- Michael Uljens. “Democracy and normative education Invited comments to Nel Noddings plenary lecture. Education and Democracy in the 21st century”. Åbo Akademi University.

5- Democracy, intelligence and (sound) education in the perspective of John Dewey

6- Pedro, José et al. Democracy, intelligence and (sound) education in the perspective of John Dewey.

7- Kurth-Schai, Ruthanne. “Re-envisioning Education and Democracy”. Information Age Press, 2006.

# پرسی دیموکراسی لای ڕاشد غەنوشی






**د.ئاراس محمد صالح**

لەدایکبووی ١٩٧٠

دکتۆرا لە شەریعە. مامۆستا لە زانکۆی سلێمانی

چەند کتێب و وتاری بڵاوکراوەی هەیە.

ڕاشد غەنوشی یەکێکە لە بیریارە ناسراوەکانی ڕابوونی ئیسلامی لە سەدەی بیستەمدا، لەسەر ئاستی جیهانی ئیسلامی و ئەوروپی کەسێکی چالاکەو خاوەنی دیدوبۆچوونی تایبەت و ڕاشکاوانەی خۆیەتی. ئەم بیریارە لە ساڵی ١٩٤١ لە تونس لەدایک بووە، سەرەتای خوێندنی لە مزگەوتی زەیتونەوە دەست پێکردووە. خوێندنی زانکۆی لە دیمەشق تەواوکردووە. بۆ تەواوکردنی خوێندنی باڵا ڕووی کردوەتە فەرەنسا و لە زانکۆی (سۆربۆن) تێزی دکتۆرای لەسەر ئازادیە گشتییەکان ئامادە کردووە، بەڵام نەیتوانیوە گفتوگۆی تێزەکەی بکات، بەهۆی بارودۆخی تایبەتی خۆیەوە ناچار بووە واز لەخوێندنەکەی بهێنێت. یەکێکە لە ڕابەرانی ڕابوونی ئیسلامی تونسە. لە ساڵی (١٩٨١)دا لەگەڵ هاوکارەکانیدا ئاراستەی ئیسلامی لە تونس دادەمەزرێنن و بە بەرپرسی یەکەم هەڵبژێراوە، لە پاشاندا ئەو ئاراستە ئیسلامییە دەکاتە حیزبی نەهزەی (النهضة) تونسی و لە ساڵی (١٩٨٩)وە سەرۆکایەتی ئەو حیزبە دەکات.

وەک مامۆستا و ڕۆژنامەنووس کاری کردووە. غەنوشی چانسی ئەوەی هەبووە لە وڵاتی تونسدا لەدایک بووە. قوتابخانە ئیسلامیەکانی تونس لەژێر هەژمونی بیری مەبەستداری (المقاصدی) ئیمامی (الشاطبي) و پاشان (ابن عاشور)دان. ئەم دوو زانا گەورەیە تەفسیری مەبەستداری (المقاصدی) بۆ دەقەکان دەکەن و لە بازنەیەکی فراواندا لێکدانەوەو مەبەستەکانی هەموو حوکمە شەرعییەکان لە دەقەکانەوە وەردەگرن. بە پێچەوانەی قوتابخانەی ڕوکەش بینی (الظاهرية) کە کەمتر لە ڕووکەشی دەق دەردەچن و زیاتر تەفسیری ڕووکەشی بۆ دەقەکان دەکەن و توانای قوڵبونەوەو تێگەیشتنی مەبەستە قوڵەکانی شەریعەتیان نییە. هەروەها ئەم بیریارە چانسی ئەوەی هەبووە بچێتە وڵاتێکی وەک فەرەنسا و زانکۆی (سۆربۆن) و فێربوونی زمانی فەرەنسی ببێت، هەموو ئەمانە کاریگەری گەورەیان هەبووە لەسەر فراوانبوونی ئاسۆی بیری غەنوشی و جیهانبینیەکانی.

هەرچەندە ڕاشد غەنوشی زۆر ئازایانەو ڕاشکاوانە بۆچوونەکانی خۆی لەبارەی پرسە زیندوو هەنوکیەکانی گۆڕەپانی کاری ئیسلامیەوە دەڵێت، وەک (چەمکی هاوڵاتی بوون و مافەکانی مرۆڤ(١)، ئازادیەکان(٢)، دیموکراسی و کاری حیزبی و پەرلەمانی(٣)، پرسی ژنان(٤)، مافی ناموسڵمانەکان...هتد) (٥) بەڵام لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا ئەم بیریارە کەمتر لەلایەن ناوەندە ئیسلامییە تەقلیدیەکانەوە کەوتووەتە بەر ڕەخنەو بریندار کردن و ناوزڕاندن. نهێنی ئەمەش ئەو بیرە فراوان و تەفسیرە مەقاصیدیەیە کە لای غەنوشی و هاوکارەکانی پەیڕەو دەکرێت. چونکە ناوەندە تەقلیدیە داخراوەکان زۆر لەو شێوازە تێناگەن، هەرکەسێک وەک خۆیان بە زمانێکی سادە نەدوێ ناتوانن قسە لەسەر تێزو بۆچوونەکانی بکەن.

یەکێک لەو بابەتانەی غەنوشی ڕای ڕاشکاوانەی خۆی لەبارەوە دەربڕیوە پرسی دیموکراسییە. ئەم بابەتەی لە چەندین دیدار و گوتاری ڕۆژنامەنووسیدا ئاماژە پێداوە. هەروەها لە کتێبی (الديمقراطية وحقوق الانسان في الاسلام) (٦) بە تەواوی بۆچوونی خۆی لەو بارەیەوە ڕوون کردوەتەوە.

دیموکراسی وەک بنەمای کاری سیاسی هەتا ئێستا باشترین میکانیزمە داهێنراوەکانی کاری سیاسییە. لە گرنگترین بنەماکانی وەک بەشداری هەمووان لە بڕیاری سیاسی و ئازادیە گشتییەکان و چەمکی هاووڵاتی بوون و ئاڵوگۆڕی ئاشتیانەی دەسەڵات، هەموو ئەمانەش پێویستی هەموو کۆمەڵێکی مرۆیین پێشکەوتووبێت یاخود دواکەوتوو. خواستی ئازادی لای هەموو مرۆڤێک شتێکی فیترییە. بێگومان تاکڕەوی و سەرکوتکردنی سیاسی و بیروباوەڕ، وڵاتە دواکەوتووەکانی تووشی ئەم هەموو قەیرانی شەڕوماڵوێرانی و

بەریەکەوتنی چەکداری و داڕوخانی ئابووری و بێکاری و کۆچی توانا مرۆییەکان بۆ وڵاتە پێشکەوتووە ناموسڵمانەکان کردوەتەوە. بە پێچەوانەوە ئاشتی و ئارامی سیاسی و کۆمەڵایەتی و گەشەکردنی وڵات و بەرقەرار بوونی هێمنی لە وڵاتە پێشکەوتووەکاندا هەمووی بەرمەبنای دیموکراسی و ئازادی و چەمکی هاوڵاتی بوونن. تەنانەت ئیسلامییە تەقلیدیەکانیش کە دژی بنەماکانی دیموکراسی فتوای تەکفیرو تەفسیق دەدەن، ئەوانیش کۆچ دەکەن بۆ ئەو وڵاتانەی بەهۆی بەرقەرار بوونی بنەماکانی دیموکراسیەوە لە هەموو ڕووەکانی سیاسی و زانستی و کۆمەڵایەتیەوە گەشەیان کردووە. لەوێ بەوپەڕی ئازادیەوە دینداری خۆیان دەکەن و کەرامەتی مرۆییان پارێزراوە.

یەکێک لە تایبەتمەندیەکانی سیستمی دیموکراسی دابەشکردنی دەسەڵاتەکان و کۆنەکردنەوەیانە لە ناوەندێکدا یان تاکە کەسێکدا. لە سیستمی دیموکراسیدا دەسەڵاتەکان دابەش دەکرێن و شۆڕ دەبنەوە بۆ ئاستی هەرێم و پارێزگاو یەکە ئیداریەکان. ئەمەش بە تایبەت لە سیستمە فیدراڵیەکاندا ڕێگەیەکی گونجاوە بۆ بەشداری بەرفراوانی هەموو توێژەکانی کۆمەڵ لە بڕیارو چارەنووسی گشتیدا و کۆنەکردنەوەی دەسەڵات لە یەک کەسدا و ڕێگەگرتن لە تاکڕەوی لە بڕیارو سیاسەتی گشتی دەوڵەتدا. لە هەمان کاتدا بچووککردنەوەی ڕووبەری نەیار و دەنگی نارەزایەتی کە هەموو کات ئارامی سیاسی لە وڵاتە دواکەوتوەکاندا دەخاتە بەرمەترسی.

هەموو ئەمانە بەڵگەی ئەوە نین کە سیستمی دیموکراسی بێ خەوش و کەموکوڕیە. یەکێک لە لایەنە خراپەکانی دیموکراسی دەستێوەردانی دەوڵەمەند و خاوەن دەسەڵاتەکان و کاریگەریانە لەسەر پرۆسەکە. دەوڵەمەند و خاوەن کۆمپانیا زەبەلاحەکان لەڕێگەی بەخشینەوەی پارەو پشتگیری کەناڵەکانی ڕاگەیاندنەوە دەتوانن کاریگەری زۆریان هەبێت لەسەر پرسەکانی هەڵبژاردن و یەکلاکردنەوەی لە بەرژەوەندی ئەو کەس و لایەنانەی خۆیان مەبەستیانە، لە پێناوی سودی تایبەتی خۆیان و بۆ دەستگرتن بەسەر داهات و پرۆژە گشتیەکانی دەوڵەتدا لە داهاتوودا. هەروەها یەکێک لە تایبەتمەندیەکانی سیستمی سیاسی بەردەوام لە گەشەکردن و بەرەو پێشچووندایە، وەک سروشتی هەموو داهێنراوێکی مرۆیی. بێگومان سیستمی دیموکراسیش گەشە دەکات و بەرەو گۆڕانی بەردەوام دەڕوات. لە هەمان کاتدا لە وڵاتە دواکەوتووەکاندا دەستێوەردانی هەرێمی و نێودەوڵەتی دەکرێت لە ئاراستەکردنی هەڵبژاردن و یەکلایی کردنەوەی لە بەرژەوەندی ئەو کەس و لایەنانەی خۆیان مەبەستیانە هەتا دەگاتە ڕێگەی ناشەرعی و تەزویر و گزیکاری. لەگەڵ هەموو کەموکورپەکانیدا هەتا ئێستا سیستمی دیموکراسی باشترین سیستمی سیاسییە بەبەراورد بە هەموو سیستمەکانی تری سیاسی و دەسەڵاتداری.

لە وڵاتە دواکەوتووەکاندا یەکەم قوربانی دەستی سەرکوتی سیاسی و تاکڕەویی، ئیسلامیەکانن. لە وڵاتە عەرەبی و ئیسلامییەکانی ڕۆژهەڵاتدا بەهۆی نەبوونی ئازادی و ئاڵوگۆڕنەکردنی دەسەڵاتەوە، هەموو ئازادیخوازەکان تووشی زیندان و ئەشکەنجەو کۆچکردن بوونەتەوە. زیندانەکانی میسری ڕۆژگاری سادات و موبارەک و تونسی بنعەلی و لیبیای قەزافی، نمونەی ئەو هەموو ئازارو ئەشکەنجەی دەسەڵاتە تۆتالیتارە سەرکوتکەرەکانی ئەو وڵاتانەیە لە دژی ئیسلامییەکان و ئەوانە بوونەتە هۆی پەرچەکرداری هەندێک ئیسلامی. لەگەڵ ئەوەشدا ئیسلامییە ناوەندگیرو هاوسەنگەکە زۆرینەن لە هەموو ئەو وڵاتانەدا. کاتێکیش لە پرۆسەی هەڵبژاردندا ئیسلامییەکان سەرکەوتن، بە کودەتای سەربازی دەنگی ئازادی خەڵکیان لێ زەوتکراوە لەلایەن عەلمانیەکانەوە. لە وڵاتەکانی

تریشەوە ئەو حیزبە عەلمانیانەی بانگەشەی ئازادی دەکەن پیرۆزبایی کودەتا سەربازیەکانیان لێکردوون و شەرعیەتیان داوە بە پەلامار و کوشتوبڕەکانی وەک گۆڕەپانی تەحریری میسرو هاوشێوەکانیان، بەڵام هێشتا پەرچەکرداری نەخوازراویان نەبووە.

وەرگرتنی ڕای گشتی خەڵکی لەم ڕۆژگارەدا بۆ وەرگرتنی شەرعیەتی دەسەلات تەنها ڕێگەیە. لە فیقهی ئیسلامیدا بۆ شەرعیەتی دەسەلات، دوو ڕێگە ئاماژەی پێدراوە، یەکەم بڕیاری ئەنجومەنی (الحل والعقد) کە خودی ئەو ئەنجومەنەش هەڵبژێراوی خەڵکییە، ئاشکرایە بە ئایەت و فەرموده دیاری نەکراون. ئەنجومەنی (الحل والعقد) هەمان ڕۆڵی پەرلەمان دەبینن لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا. کەواتە ڕێگەی هەڵبژاردنی گشتی یان زۆرینەی خەڵکی، شەرعیەت دەدات بە دەسەلات. ڕێگەی دووەم کودەتاو خۆسەپاندنە لە ڕیگەی هێزەوە (القهر) و ئەم شێوازەی حوکمڕانی زیاتر ولات بەرەو هەڵدێر و نارەزایی زۆرو بەریەککەوتنی چەکداری دەبات. لە هەمان کاتدا خەڵکی وەلائیان بۆ دەسەلاتە نابێت و زۆرترین کێشەی بۆ دروست دەکەن.

سیستمی دیموکراسی بێلایەنە. هەرچەند لایەنە علمانیەکان بانگەشەی ئەوە دەکەن کە دیموکراسی هی ئەوانەو هەر ئەوانن خەمخۆری دیموکراسی و مافی کەمینەکان. لەهەمان کاتدا تۆمەتی ئەوە دەبەخشنەوە کە ئیسلامیەکان مەترسین بۆ سەر پرۆسەی دیموکراسی و مافی کەمینەو ئاینە جیاوازەکان. بەڵام لە واقیعدا هەر عەلمانیەکان بوونەتە هۆی سەرکوتی سیاسی و نەهێشتنی ئازادی و زیندانی کردنی هەموو دەنگێکی جیاواز لە خۆیان. نمونەی جەزائیر و میسرو فەلەستین و زۆر شوێنی تر بەڵگەی ڕوون و ئاشکران. بەڵام لە هەمان کاتدا لە مەغریب و تورکیا و ئوردن و مالیزیاو زۆر شوێنی تر ئیسلامییەکان توانیویانە مامەڵە لەگەڵ بڕیاری میللەتدا بکەن. هەرچەندە لە فەڵەستین و میسر عەلمانیەکان کودەتایان کرد بەسەریاندا، لەگەڵ ئەوەشدا زۆر سیاسیانەو بە هەستکردن بە بەرپرسیاریەتیەوە مامەڵەیان کرد.

لە هەموو ئەو وڵاتانەی تارادەیەک ئازادی هەبووەو بنەماکانی دیموکراسی پەیڕەو کراوە، ئیسلامیەکان بە هەموو ئاراستەو قوتابخانەکانیانەوە گەشەیان کردووە، وەک لە تورکیا و ئوردن و مەغریبدا. لە هەمان کاتدا لەو وڵاتانەدا ئاستی هێمنی و بەرقەراری ئاشتی زیاتر بووە. کەواتە بوونی ئازادی و پەیڕەوی سیستمی دیموکراسی و ئاڵوگۆڕی دەسەلات هەمووان لێ سودمەند دەبن. لە هەمان کاتدا هەموو تاکێک تەعبیر لە بۆچوون و بوونی خۆی دەکات. بێگومان پاشخانی ڕۆشنبیری و هۆشیاری سیاسی لە وڵاتانەدا گەشەکردووترەو کاریگەری هەیە لەسەر هەڵوێستی لایەنە سیاسیەکان. کاتێک دەسەلات ناتوانێت سنوری خۆی ببەزێنێ و سەرکەوتی هاوڵاتیان بکات، لە ترسی لێپرسینەوەی ڕای گشتی خەڵکیە، چونکە دەزانێت خەڵکی هۆشیارەو سزای دەدات لەسەر سندوقەکانی هەڵبژاردن.

بێگومان ئیسلامی هاوسەنگ و ناوەندگیر قوربانی نێوان عەلمانی و چەپەکان لەلایەک و لەلایەکی ترەو ناوەندە دینیە تەقلیدیە بێفکرەکانن. ئیسلامییە ناوەندگیرەکان کە زۆرینەی ئاراستەی ئیسلامی لە هەموو جیهاندا لەخۆدەگرێت، مامەڵەیەکی زۆر واقیعی و دووربینانە لەگەڵ پێشهات و پرسە سیاسی و نیشتمانیەکاندا دەکەن. هەوڵی ورژاندنی سۆز پەرچەکرداری کاتی نادەن، توانیویانە لەگەڵ بارودۆخە سیاسیەکەدا زۆر هۆشیارانە هەنگاو بنێن و لەخزمەتی ئیسلام و بانگەوازدا بەکاری بهێنن. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بەردەوام دەکەونە بەر نەشتەری عەلمانیەکان و تۆمەتی ئەوەیان بۆ دروست دەکەن دژی دیموکراسی و مافی مرۆڤ و کەمینە ئاینیەکانن.

لەهەمان کاتدا لەلایەن ناوەندە دینیە تەقلیدیە داخراوو رووکەش بینەکەوە بە (مبتدع)ی سیاسی و دەیان تۆمەتی نەزانانە بریندار دەکرێن. کەواتە لە یەک کاتدا قوربانی دەستی عەلمانی توندرەو دینداری بێ مەعریفەن.

لێرەدا با گریمانەی ئەوە دابنێین سیستمی دیموکراسی رەتبکەینەوە، ئەی ئەگەر دیموکراسی رەتبکرێتەوە بەدیلەکەی چیە؟ هەرچەندە ناوەندە دینیە تەقلیدیەکە و ئاراستەی توندرەوی دینی هەموو پرسە نوێکان رەتدەکەنەوە، یەکێک لەو بابەتانە مەسەلەی دیموکراسیە. بەڵام لە ئێستادا لە وڵاتە ئیسلامیەکاندا عەلمانیەکان دەنگی خەڵکی دەهێنن و شەرعیەتی هەڵبژادنیان هەیە، چ رێگەیەک بگیرێتەبەرو چۆن مامەڵە لەگەڵ ئەو واقیعەدا بکرێت؟ بێگومان یان دەبێت پرۆسەی دیموکراسی قبوڵ بکرێت لەلایەن کەمینەوەو زۆرینە حوکمڕان بێت، یان دەبێت پەنا بۆ چەک و رووبەڕوو بوونەوەی سەربازی ببرێت. تۆ کە میللەت دەنگی پێ نەداوی بە چ شەرعیەتێک پەنا بۆ هێز دەبەیت؟ بێگومان هیچ چارەسەرێک نییە جگە لە قبوڵکردنی پرۆسەی سیاسی زۆرینە. هەرچەندە هەندێ لە ئاراستە ئیسلامیەکان پرۆسەی دیموکراسی و هەڵبژاردن رەتدەکەنەوە بە دەم، بەڵام لە واقیعدا هەمووان قبوڵیان کردووە، هەموویان وتاری ئاینی و گۆڤارو چالاکی رۆژنامەنووسی و کەناڵی تیڤی و هەموو چالاکیەکی تریان هەیەو مامەڵە لەگەڵ دەسەڵاتدا دەکەن.

یەکەم کۆبوونەوەی هاوەڵان لە کاتی کۆچی دوایی پێغەمبەردا (درودی خوای لەسەر) لە سەقیفەی بەنی ساعیدەدا و راوێژ و رێکەوتنیان لەسەر پرۆسەی دەوڵەتداری، ئاماژەی ئەوەیە کە دەوڵەت نەبەستراوەتەوە بە کەسێکەوە بە کۆچی دوایی ئەو کۆتایی بێت. هەروەها دەوڵەت پێویستیەکانی ژیانی گشتی و دینداریيە، نابێت وڵات تووشی بۆشایی دەسەڵات بێتەوە. هەروەها میللەت بووەتە سەرچاوەی شەرعیەت، سەرەتا لە سەقیفەو پاشان لە مزگەوتی پێغەمبەردا لە رێگەی بەیعەتی گشتیەوە شەرعیەت دراوە بە ئەبوبەکری صدیق وەک خەلیفەو دەسەڵاتەکەی. خەلیفەش لە یەکەم ساتی وەرگرتنی شەرعیتەوە دەسەڵاتەکانی خۆی پراکتیزە کردووە.

لە وڵاتە دواکەوتوەکاندا عەلمانیەکان بۆ مانەوەی خۆیان بانگەشەی ناڕاست دەکەن لە دژی ئیسلامیەکان و بەوە تۆمەتباریان دەکەن کە بڕوایان بە ئاڵوگۆڕی ئاشتیانەی دەسەڵات نییە و تەنها یەکجار بڕوایان بە هەڵبژاردن هەیە بۆ ئەوەی بچنە دەسەڵاتەوە. بەڵام ئەوە تۆمەتێکی بێ بنەمایەو لە تورکیا و یەمەن و مەغریب و تونس، ئیسلامییەکان بەشداری هەڵبژاردنیان کردووەو سەرکەوتن و شکستیان قبوڵکردووە. ئیسلامییەکانی تونس هەرچەندە لەکاتی بەهاری عەرەبیدا وەک تاکە هێزی تونس دەردەکەوتن، لە هەڵبژاردنی یەکەمدا شکستیان هێناو قبوڵیشیان کرد، بەڵام توانیان لە هەڵبژاردنی دووەمدا سەرکەوتن مسۆگەر بکەن.

تەنها رێگە بۆ بەرگرتن لە دەسەڵاتی دیکاتۆری و تاکڕەوی لە وڵاتدا لە رۆژگاری ئەمڕۆدا تەنها سیستمی هەڵبژاردن و پەرلەمانی و دیموکراسیە. گرەنتی چیە ئەو کەسەی دەسەڵات وەردەگرێت ئەو دەسەڵاتە بەلاڕێدا نابات و وڵات تووشی سەدان قەیران ناکات بەهۆی سەرەڕۆیی و بڕیاری تاکڕەوی خۆیەوە؟ زۆر کەس وابیر دەکاتەوە مادەم موسڵمانەو ئیسلامیە ئیتر هەموو شت تەواو بووە، دادگەری و خۆشگوزەرانی بەرقەرار دەبێت، بەڵام ئەو بیرکردنەوە ڕاست نیە. ڕاستە ئیسلام دینی دادگەریە، بەڵام هەموو موسڵمانێک مەرج نیە دادگەربێت و لە سیاسەت و حوکمڕانیدا سەرکەوتووبێت. قورئان دەفەرموێت: **(وَمَا كَانَ رَبُّكَ لِيُهْلِكَ الْقُرَى بِظُلْمٍ وَأَهْلُهَا مُصْلِحُونَ)** هود:(١١٧). خوای گەورە هیچ وڵاتێک لەناو نابات بەهۆی شیرکەوە کە



# یەکێك لە لایەنە خراپەکانی دیموکراسی دەستێوەردانی دەوڵەمەند و خاوەن دەسەڵاتەکان و کاریگەریانە لەسەر پرۆسەکە.

خەڵکەکەی دادگەربن. کەواتە بە مەفهومی قورئانیی دەکرێت موشریک دادگەر بێت، واتە سونەتی خوای گەورەیە بەردەوامی دەدات بە دەسەڵاتی دادگەر نەک ئیماندار. شێخی ئیسلام ئیبنوتەیمیە دەفەرموێت: خوای گەورە بەردەوامی دەدات بە دەسەڵاتی ناموسڵمانی دادگەر، بەڵام بەردەوامی نادات بەدەسەڵاتی موسڵمانی نادادگەر.

لێرەدا دەتوانین بڵێین دیموکراسی کۆمەڵێک ئامادەسازی و رێکخستنی باشە کە لایەنە ناکۆکەکان لەسەری رێکدەکەون بۆ ئیدارەکردنی ئیشوکاری گشتی بەشێوەیەکی هاوسەنگ دوور لە هێزو خۆسەپاندن، لەسەر بنەمای لە هاوڵاتی بوون و یەکسانی لە ماف و ئەرکەکاندا. لەسەر بنچینەی ئەوەی نیشتمان هی هەمووانە بەبێ جیاوازی، لەگەڵ ملکەچ بوون بۆ دەسەڵاتی هەڵبژێراوی زۆرینە کە سەرچاوەی شەرعیەتی دەسەڵاتە، بێ گوێدانە بیروباوەڕی باوە.

ئەگەر چاوێک بە مێژووی ئیسلامی سەردەمی پێغەمبەر (دورودی خوای لەسەر) و خەلیفەکانی راشدیندا بگێڕین، هیچ رێگریەک نییە لەو رێکخستنەی دەسەڵات لە سیستمی دیموکراسیدا هەیە بۆ رێگەگرتن لە دەردی دیکاتۆری، کە بەهۆیەوە زۆربەی مێژووی ئیسلام و گەلانی سەرزەوی بوونەتە قوربانی دەستی ئەو رژێمە دیکاتۆرانە. بێ گوێدانە هەر ئایدۆلۆژیایەک کە هەردوو لایەنی توندڕەوی عەلمانی (کە بانگەشەی ئەوە دەکەن هەرچی لە رۆژئاواوە هات بەشێوەیەکی گشتی وەربگیرێت)، هەروەها لایەنی دینی تەقلیدی توندرەو (کە هەموو شتێکی رۆژئاوا رەتدەکەنەوەو دژایەتی توندی دیموکراسی دەکەن)، لەبری ئەوەی بەرهەڵستی سیستەمە دیکاتۆرو گەندەڵەکانی وڵاتەکانیان بکەن کە خۆشیان بەشێکن لە قوربانی دەستی ئەو رژێمانە.

شارستانیەتی ئیسلام لەسەر بنەمای رێزگرتنی (تکریم) مرۆڤ دروستبووە، هەموو مرۆڤەکانی بە برای یەکتری داناوە. چونکە لە یەک باوک و دایکەوە هاتوون یەک پەروەردگاریان هەیە، بانگیان دەکات بۆ هاوکاری یەک و پەیوەندی لەسەر بنچینەی دادگەری و چاکەخوازی و راوێژ و پشتگیری یەکتری لەسەر کاری چاک و رەتکردنەوەی ستەم. ئیسلام ستەمی بە نزیک لە شیرک داناوە، هەموو نوسەرانی گەورەی ئیسلام لە دوای دژایەتی زۆری شیرک دژایەتی ستەم و ستەمکارانیان کردووە. قورئانی پیرۆزیش فەرمان دەکات هاوبەش بۆ خوا دامەنێن و لە ستەم و ستەمکاران دوور بکەونەوە.

ئەزموونی حوکمڕانی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر) نمونەی حوکمڕانی دادگەرو شوراو قبوڵکردنی کەسانی جیاواز بووە، هەروەکو لە دەستوری مەدینەدا (صحيفة المدينة)دا بەرجەستە کراوە. پەیوەندی لایەنە جیاوازەکانی مەدینە بەهەموو جیاوازیە ئایینی و کۆمەڵایەتیەکانەوە لەسەر بنەمای هاوڵاتی بوونی یەکسان، هەروەها لەگەڵ هەموو تێبینیەک لە سەر مێژووی ئیسلامی

لە قۆناغە جیاوازەکاندا بەڵام پاراستنی بنەمای ئازادی ئاینی (**لَا إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ**) بە درێژایی مێژووی ئیسلامی پەیڕەو کراوە. وەک دەبینرێت لە زۆربەی شارو شارۆچکەو گوندێکی موسڵماناندا ئاینی جیاواز هەبووە، بەڵام نە کەس بە زۆر کراوە بە موسڵمان و نە ئازادی ئاینی لەکەس زەوتکراوە.

کۆتایی: لەم کتێبەدا ڕاشد غەنوشی ڕاوبۆچوونی خۆی لەسەر پرسی دیموکراسی زۆر ڕاشکاوانە ڕوونەدکاتەوە. ئەو بۆچوونی وایە کە سیستمی دیموکراسی وەک داهێنراوێکی مرۆیی بۆ ڕێکخستنی کاروباری سیاسی وڵات و لایەنە جیاوازەکانی کۆمەڵ، یەکێکە لە میکانیزمە گونجاوەکان بۆ بەڕێوەبردنی وڵات و کاروباری نیشتمان لەنێوان لایەنە جیاوازەکاندا. هەروەها بەباشترین میکانیزمی داناوە بۆ دوورخستنەوەی وڵات لە دەردی کوشندەی دیکاتۆری و تاکڕەوی، کە وڵاتە دواکەوتووەکان هەتا ئێستا ژینگەیەکی لەبارە بۆ دروستبوون و گەشەکردنی سیستمی تاکڕەو ستەمکار.

هەروەها لەگەڵ ئەوەشدا میکانیزێکی گونجاوە بۆ دوورخستنەوەی وڵات لە دەسەڵاتی خۆسەپێن. لە هەمان کاتدا سیستمێکی بێ کەموکوڕی نییە، چونکە کاریگەری و دەستوەردان لەلایەن دەوڵەمەند و خاوەن کۆمپانیا زەبەلاحەکانەوە لە پرۆسەی هەڵبژاردن دەکرێت. ئەوان دەتوانن لە ڕێگەی بەخشینەوەی پارەو کەناڵی ڕاگەیاندنەوە کاریگەری زۆریان هەبێت لەسەر ئەنجامەکانی هەڵبژاردن. هەروەها دەستوەردانی دەوڵەتانی هەرێمی و نێودەوڵەتی لە کاروباری وڵاتە دواکەوتووەکان و تەزویرو گزیکاری زۆر لەو وڵاتانەدا کە زۆربەی کات هەڵبژاردنی پاک ئەنجام نادرێت، ئەمانە بەشێکن لە لایەنە لاوازەکانی ئەو پرۆسەیە. بەڵام لە کاتی ئێستادا میکانیزمێکی تر نیە بۆ ڕێکەوتنی لایەن و ئاراستە جیاوازەکانی هەر وڵاتێک هەتا بتوانن ئیدارەی وڵات بکەن لەسەر بنەمای هاوڵاتی بوونی یەکسان.



**سەرچاوەکان**


١ - راشد الغنوشي، حقوق المواطنة، حقوق غير المسلم في المجتمع الاسلامي، الطبعة الثانية ١٤١٣هـ ١٩٩٣م، المعهد العالمي للفكر الاسلامي، ص ٥٩ وما بعدها.

٢- راشد الغنوشي، الحريات العامة في الدولة الاسلامية، الطبعة الاولى ١٩٩٣م، مركز دراسات الوحدة العربية، بيروت، ص٣١ وما بعدها.

٣- راشد الغنوشي، الديمقراطية وحقوق الانسان في الاسلام، الطبعة الأولى ، الدار العربية للعلوم ناشرون، ومركز الجزيرة للدراسات، ص ٥٩ وما بعدها.

٤- المرأة بين القرآن وواقع المسلمين، الطبعة الثالثة ١٤٢١هـ ٢٠٠٠م، المركز المغاربي للبحوث والترجمة، ص٦٥ وما بعدها.

٥- راشد الغنوشي، حقوق المواطنة، حقوق غير المسلم في المجتمع الاسلامي، ص٤٧ وما بعدها.

٦- راشدا الغنوشي، الديمقراطية وحقوق الانسان في الاسلام، الفصل الثالث، ص ٥٩-٨٢.

# دیموکراسی

## دەردە یان دەرمان






**عوسمان عەبدوڵڵائەمین . نورسی**

بەکالریۆس لە ئاداب بەشی زانستی قورئان. دبلۆم لە ووتاربێژی و بڕوانامەی زانستی لە زانستەکانی شەریعەت لای زانایانی باوەڕپێکراو

بۆ هەر یەکێک لە چەمکەکان خوێندنەوەیەکی سەلەفی یانە هەیە، کۆی جوانی و پێکەوەیی و ئازادی و نیعمەتەکان حەرام دەکات، هەمیشە کاری بەریەک کەوتن و دابەشکاری و دروست کردنی رۆحی شەڕەنگێزی یە. قسە کردن لەسەر چەمکی دیموکراسی بەخوێندنەوەیەکی تازە لێرەدا کار دەکات بۆ دۆزینەوەی ووشەی هاوبەش و کاری پێکەوەیی و پاراستنی شکۆی ئینسان و ژیانی ئاشتیانەو بنەبڕکردنی بیری توندڕەوی و دروست کردنی گیانی لێبوردەیی.

-دیموکراسی وەک باشترین لە میکانیزمەکانی ئاڵو گۆڕی دەسەڵات و بیرو ڕا لە پێگەیشتن و داهێنانەکانی مرۆڤایەتییە و بۆ باش بەڕێوە بردن و ئیدارەکردنی ژیان و دانانی ڕێسای گونجاوە لە گەڵ تێگەیشتن و پێش کەوتنی مرۆڤ، هەڵبەت ناتوانرێ هەموو بەش و لایەن و ووردەکاری یەکانی دیموکراسی لە چەند لاپەڕەیەک بنوسرێ و شیکار بکرێ، وەلێ دەکرێ وەک بەرچاو ڕوونی و سەرەتایەک بۆ تێگەیشتن و مامەڵە کردن بێت لەگەڵی.

**پێناسەیەک**

دیموکراسی: بریتی یە لە سیستەمێکی چاودێری کردنی بەردەوامی دەسەڵات بەهەموو شێوازەکانی یەوە لەلایەن خەڵکیەوە، لەڕێی ئەو ڕێکخراوو دەزگا ڕاگەیاندنە سەربەخۆیانەوە کە گروپە جیاوازەکانی کۆمەڵگا پێکی دێنن، ئەم زاراوە لە بنەچە سیاسییەکەی لەسەردەمی کۆندا بەواتای دەسەڵات و حوکمی گەل سەریهەڵداوە، واتە لەگەڵەوە بۆ گەل.

مەبەست لە فەرمانڕەوایە، گەڕانەوەی دەسەڵاتی سیاسی و شارستانی بۆ ژێر چەتری گەل، گەل چاودێرێکی کارا و ئەکتیڤ بێت بەسەر تەواوی پێکهاتەکانی حوکمەتەوە لە ڕێی ئەنجومەنی نوێنەرانەوە، لەکاتی پیادەنەکردنی بنەماکانی ئازادی و یەکسانی لە وڵاتدا، ئەو کاتە نوێنەرانی هەڵبژێردراوی گەل بەشێکی گرنگی دەسەڵاتن و لەوێوە یاساکان دەردەچن بە پێی دەنگی زۆرینەی ئەندامانی ئەنجومەنی نوێنەران.

بە واتایەکی تر دیموکراتییەت مانای فرە حیزبی و ڕێکخستنەوەی دەسەڵاتە بەهەڵبژاردن و جیاکردنەوەی نێوانیانە، وێڕای ئەمەش چاودێریکردنی ڕای گشتی و وەرگرتنی گرەنتی ماف و ئازادی یە گشتی یەکانی لە خۆگرتووە.

دیموکراسی لە چەمکی خۆیدا نیشاندەری ئەم ئامانجەیە کە ئەو بڕیارانەی وەک کۆ کار دەکەنە سەر کۆمەڵگا، دەبێ بەبیر و ڕای تەواوی ئەو کۆمەڵگایە بێت، هەروەها تەواوی ئەندامان بۆ بەشداری لە بڕیارەکاندا مافی بەرانبەریان هەبێ.

**دیموکراسی پێویستی بە دوو ئەسڵێ گشتی هەیە**

١. چاودێری گشتی بەسەر بڕیارەکانی تێکڕایی.

٢. هەبوونی مافی بەرانبەر بۆ بەکارهێنانی ئەم چاودێرییە.

چەند ئەم دوو ئەسڵە لە بڕیاردانی کۆمەڵگایەکدا زیاتر بەڕێوە بچن ئەو کۆمەڵگایە دیموکراتی تر دەبێت. ڕۆشنتر دەتوانین بۆ تێگەیشتن بڵێین پێکهێنەرەکانی دیموکراسی چوار توخمی سەرەکییە:

١- هەڵبژاردنی ئازادانە و دادپەروەرانە.

٢- حکومەتی کراوەو بەرپرس و وەڵامدەرەوە.

٣. لەبەرچاو گرتنی مافە مەدەنی و سیاسییەکان.

٤- هەبوونی کۆمەڵگایەکی شارستانی.

**ئەزموونی دیموکراسی و دەسپێکی تەمەنی**

بیرۆکەی دیموکراتیەت و ئەزمونکردنی سەرچاوەکان بۆ سەردەمی یۆنانی دەگەڕێتەوە ، بەڵام بە پێی ئاماژەی قورئانی پیرۆز هزری ڕاوێژکاری و گەڕانەوە و پرس کردن بەخەڵکی زۆر کۆنترە لەو مێژووە، داستانی مەلیکەی سەبەء ئەم بابەتی حوکمڕانی یەکی ڕاوێژکاری و گەڕانەوەیە بۆ بەرژەوەندی خەڵک **(قَالَتْ يَا أَيُّهَا الْمَلَأُ أَفْتُونِي فِي أَمْرِي مَا كُنتُ قَاطِعَةً أَمْرًا حَتَّى تَشْهَدُونِ )**

لەم ئایەتە باس لەو حوکمە ڕەشید و ڕاوێژکارییە دەکات کە مەلیکەی سەبەء بە حوکمەت و وەزیر

و ڕاوێژکارەکانی کردویەتی. بێگومان بەم چەمکە نوێیەی ئێستای لە کۆندا بەم گشتگیر و ئازادی و مافانەوە واتا ئەرێنیەی لەنێو دامەزراوە سیاسی و ڕۆشنبیری و ئیداری یەکان وەرنەگرتووە، تا ئەو کاتەی میتۆدی هاوچەرخ لە لێکۆڵینەوەی چەمکی دیموکراتی و یەکسانی و دادپەروەری کۆمەڵایەتی و مافی مرۆڤ و کۆمەڵی شارستانی هاتە نێو کایە سیاسییەکان، پاشان لەو هەموو گەشەسەندنانەی لە ڕۆژئاوا پێی گەیشتووە و هاتنە ئارای شارستانیەتی نوێ ئێستا بۆتە مایەی شانازی گەل و نەتەوەکان.

**فۆرمەکانی دیموکراتی**

١. دیموکراتی گەلی ڕاستەوخۆ. ٢. دیموکراتی ناڕاستەوخۆ. ٣. دیموکراتی نیمچە ڕاستەوخۆ.

**شێوازی یەکەم:** بریتییە لەو شێوەی گەل ڕاستەوخۆ پیادەی دەکات، بەبێ دەستێوەردانی لایەنێکی دیکە، چ پەرلەمان و چ هەرلایەنێکی تر بێت، ئەمجۆرە کۆنترینی جۆری دیموکراسی یە لە ڕووی مێژووییەوە.

**شێوازی دووهەم:** بریتییە لەدیموکراسی ناڕاستەوخۆ، ئەویش گەل نوێنەری خۆی هەڵدەبژێرێت تاکو بەناوی گەلەوە دەسەڵات بەڕێوە بەبات، ئەم شێوازە پێی دەوترێ دیموکراسی نوێنەرایەتی.

**شێوازی سێ یەم:** دیموکاسی نیمچەڕاستەوخۆ، گەل لەگەڵ نوێنەرەکانیدا لەهەندێک لە کایەکانی دەسەڵاتدا بەشداری بکات، بەتایبەت کایەی یاسادانان، پەرلەمان پرۆژەیاساکانی خۆی دەخاتە بەردەم گەل و تاکو دەنگی لەسەر بدەن، چونکە پەرلەمان بەشێوەیەکی ڕەها سەرپشک نەکراوە.

هەروەها دیموکراسی تەوافوقی کە دیموکراسییەکە لەسەر بنەمای تەوافوق و پێکهاتن، سازان، گونجان وەک ئایدیایەکی چارەساز گیراوەتە بەر و شێوازێکە لە شێوازەکانی مومارەسەکردنی دەسەڵات بە دیموکراسی و دوور لە دیکتاتۆری کەوەک دەستەواژە و (لایەنی تیۆری) وەک مومارەسە (پراکتیک) دەبێت هەڵگری تایبەتمەندی یەکانی دیموکراسی بێت وەک سیستەمێک بۆ فەرمانڕەوایی،

ئەم شێوازە لەدیموکراسی شێوازێکی داتاشراوەو لە دیموکراسی و فۆرمێکی جیاوازە لە مومارەسەی دیموکراسی. بۆ گەیشتن بە دیموکراسی و یەکسانی و دادگەری پێویستمان بە:

- فیکری ئینسانی یە کە ئامانجی سەرەکی و گەورەی شکۆ و خزمەتی ئینسان بێت.
- تێپەڕانی بیری ئایدیۆلۆژی و بەسەنتەر کردنی مرۆڤ.
- خوێندنەوەی تازە بۆ دەق و تێکست و سەرجاوەکانی شەریعەت.

**کۆمەڵگا ڕۆژهەڵاتییەکان و دیموکراسی**

١. لەبەر سەرنەکەوتنیان لە گەشەی سروشتیانەی خۆیاندا نەیانتوانیوە بگەنە ئاستی ڕاستەقینەی دەوڵەت.

٢. بەهۆی پێکەوە لکانی زیاد لەنەتەوەیەک لەگەڵ یەک و کۆکردنەوەیان لە چوارچێوەی دەوڵەتێکدا.

٣. مومارەسەکردنی سیاسەت و دەوڵەتداری وەک مەزاج و ویست نەک تیۆر و زانست .

٤. دواکەوتویی واقیعی کۆمەڵگاکان لە چاو پێشکەوتویی تیۆر و تێکستەکان و گەشە نەکردنی مرۆیی تاکەکانی کۆمەڵگا.

٥. کاراکتەرەکانی کۆمەڵگای نێو دەوڵەتی و نێوخۆیی لە پیادەکردنی دیموکراسی و جۆرێکە لە گاڵتە جاڕی و دووڕویی و جیاوازی لە مومارەسەدا، لە شۆڕشی بەهاری عەرەبیدا میسر وەک نمونە و سەرۆکی شەرعی و هەڵبژێردراو لە کونجی زیندانەکان.

واتە دیموکراسی لەڕۆهەڵاتی ناوەڕاست نەیتوانیوە لە دروشم و شیعارەوە ببێتە واقیع، ئەوەی هەیە زاخاوی دیموکراسییە بۆ داپۆشینی زوڵم و دیکتاتۆری و ناعەداڵەتی یەکان، هەر دوو گروپی عەلمانی و ئیسلامیش لە حوکمرانی و پارێزگاری مافی مرۆڤ و بەرز ڕاگرتنی شکۆی ئینسان شکستیان هێناوە.

ئەو وڵاتانەی چەندین ساڵە حوکمی عەلمانی مومارەسە دەکەن و ئەو حوکمە بەناو ئیسلامی

یەش كە لە ئێران و سعودی یە و ناوچەكە هەیە، تەنانەت گروپە جیهادی یەكانیش كاتێك بانگەشەی جێ بەجێكردنی حوكمی ئیسلامی یان كردووە، لە سنوورێكی دیاریكراو ئەوەی نرخی نەبوبێ لایان ئینسان بووە و مومارەسەی تێگەیشتنێكی حەرفی و توراسی یان كردووە بێ ڕەچاو كردنی واقیعی دونیا و پێشكەوتن و گۆڕانكاری یەكان و شكستی ئەمان بەسوێتر بووە و بۆتە نەنگی نمونەیەكی بێزراو.

لە كوردستانیش، هێز و كاراكتەرەكان ئەوەندە ناشیرین مومارەسەی دیموكراسی یان كرد و دەكەن، بەشێوەیەك ئەوەی دیموكراتی بەناوەكەیەوە لكاندوە بەس دیموكرات نییە، ئەوەی باسی مەدەنییەت و پێشكەوتن دەكات لە دواكەوتوترین گروپەكانی كۆمەڵگان، بەشێوەیەك بوونەتە هۆی ناشیرین كردنی چەمك و جوانی یەكان ئیدی هیچ ئومێدێكیان نەهێشتووە.

بۆیە دەتوانین بڵێین دیموكراسی دەردە هەم دەرمان، بۆ كۆمەڵگایەكی ڕۆشنبیر و داهێنەر و پارێزەری مافی هاوڵاتی دەرمانە و بۆ كۆمەڵگا دواكەوتووەكانیش وەك جۆرێكی تر لە ئیسغلال چەواشەكاری و قۆرخ كردنی دەسەڵات و دزینی داهات و ژیانی هاوڵاتی بۆتە دەردی بێ دەرمان و زۆر جار هاوڵاتی لە نائومێدی بۆ گەڕانەوەی دادگەری دەچێتەوە سەر باسی شۆڕش و ڕاپەڕین بۆ ڕزگار بوون لەوانەی بەناوی دیموكراسی یەوە هەموو شتێكیان برد و تالانیان كرد.

یموكراسی وەك ئەزموون و داهێنانی مرۆڤ قابیلی ڕەخنە و ناتەواوییە و خاڵی نییە لە كەم كوڕی. ئەمرۆ دیموكراسی بەتەنها ئایدیایەك نییە بۆ حوكم، بەڵكوو ئایدیایە بۆ سەرجەم كایە جیاوازەكان، بەڵام ئەمە مانای تەواویەتی ئەم ئایدیایە ناگەیەنێ لە چاو گەورەیی و ئاڵۆزی ئەم بوونەوەرەدا كە بەردەوام دەبێ بە دوای باشترین و جوانترینەوە بین بۆ مرۆڤایەتی و ئەمەش وامان لێ دەكات بەردەوام لەڕەخنەگرتن بین لێی و هەر ئەم ڕێگەدانەی دیموكراسی بەڕەخنە گرتن لە خودی دیموكراسی نهێنی مانەوەو بەردەوامی و گەشەیەتی.

**بەدیلی دیموكراسی چییە؟**

حوكم كردنە بە شەریعەتی خودا یان دیكتاتۆرییەت و تاكڕەوی؟

ـ بەدڵنیاییەوە حوكم و بەرنامە و شەریعەتی خودا تەواوترین و كامڵترین و جوانترینە بۆ مرۆڤایەتی **(الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ الْإِسْلَامَ دِينًا ) المائدة/٣**

بەڵام لە ئێستادا و بۆ ئەم سەردەمە شەریعەتی خودا ناكرێ بە بەدیلی دیموكراسی، لەبەر ئەوەی:

ـ ئینسانی یەت لەحاڵەتێكی ناهۆشیاریدایە بەرامبەر حوكم و شەریعەت.

موسڵمانان لەڕابردوودا نەیانتوانیوە بەرجەستەی حوكم و شەریعەتی خودا بكەن وەك خۆی و ڕەحمەتێتی یەكەی و بەڵكو نمونەیەكی تورەی توندڕەو ڕوكەش و دوور لە ڕەچاو كردنی كەرامەت و مافی مرۆڤ و پێكەوەیی پیادەكراوە.

ئەمە پرسیارێكی جددی یە بۆ؟!!

هەڵبەت من باسم لە نموونە و حوكمی گشتیر و دەوڵەتی و كاتەكەیەتی ئەگینا نمونەی عەداڵەتی كەسی و كاتی و شتی جوان هەیە بەڵام بەردەوامی نەبووە.

ـ لە ئێستاشدا جەوهەری دین فەرامۆش كراوە و پێویستە سەرلەنوێ حوكم و شەریعەتی خودا پێناسە بكرێ و بناسێنرێتەوە و چەمكەكان خوێندنەوەی تازەیان بۆ بكرێ، چەند زوڵمە لەخودا و دینەكەی كاتێك باسی حوكم و شەریعەت دەكرێ یەكسەر دەست برین و جەڵد لێدان و قانونەكانی ئەحوالی شەخصی دێتە زیهنتەوە و بەس، لە كاتێكدا خودا ڕێز و كەرامەتی مۆرڤی بە چەشنێك داناوە كە ئەگەر ببێتە هۆی ژیان بەخشینەوە بەمرۆڤێك وەك ئەوەی هەموو مرۆڤایەتیت ژیاندبێتەوە، ئەگەر بكوژی مرۆڤێكی بێتاوان بیت وەك ئەوەی مرۆڤایەتیت لەناو بردبێت، لە فەرمودەدا هاتوە

کەعبە بڕوخێنی بەرد بە بەرد سانا ترە لای خودا وەک لە کوشتنی مرۆڤێکی بێتاوان، بە گەڕانەوە بۆ ئەم مەفاهیمانە لە حوکم و شەریعەتی خودا تێدەگەین حوکمی خودا واتە بەخشینی ئازادی لە بەندایەتی کردن بۆ خودا و خۆدوور گرتن و لەستەمکاری و ستەمکاران و چەسئاندنی دادگەری لە نێو کۆمەڵگادا ( ان الله یأمر بالعدل )، (ولقد بعثنا فی کل امە رسولا ان اعبدوالله واجتبوا التاغوت).

- خەیاڵ پڵاوی موسڵمان و ناواقیع بوونی، ڕەتکردنەوەی دەوڵەتی دیموکراتی بە بیانووی کار کردن بۆ دەوڵەتی ئیسلامی، ئایا شتێک بووە لەمێژوودا بە ناوی دەوڵەتی ئیسلامی؟

لەڕاستیدا لەهاتنی پەیامبەرەوە بۆ کۆی مێژووی ئیسلامی تا ئێستا شتێک نەبووە بەناوی دەوڵەتی ئیسلامی و بەرجەستەی جیاکاری بکات و ئەوەی هەبووە حوکمڕانی موسڵمانان بووە بە پێی تێگەیشتن و پێویستی بۆ ئەو سەردەمە و بەشدار بوونی خاوەن دینەکانی تر لە پۆست و شوێنە کاریگەرەکان و نووسینی ڕێسای تایبەت بووە بۆ پارێزگاری لە جیاوازی و دینەکانی تر و نمونەی نوسینەوەی وەسیقەی مەدینە لە حوکمڕانی پێغەمبەری ئازیزدا، کەواتە بۆ ئەم سەردەمەش شتێک دروست نابێت بەناوی دەوڵەتی ئیسلامی و وەک نوێنەری خودا حوکم بکات، هەرکات دروست بوو بێت بەو ناوەوە و حوکمی کردبێ زیانەکانی بۆ دین زۆر زیاترە لە قازانجەکانی و بۆتە بکوژی ڕۆحی دین و پەیمای خوایی.

## حوکمی وڵاتانی ئیسلامی و گروپە جیهادی یەکان وەک نمونە

بەخوێندنەوەیەکی تر لە هەزار ساڵی ڕابردوودا تەنها سەد ساڵی حوکمڕانییەکی ڕەشید و دادگەر بونیات نەنراوە مایەی شانازی و نمونە بێت و بتوانی هۆشیاری گشتی پێ دروست بکەی و لە ئەرزی واقیع ئەوە حاڵی موسڵمانانە لەگەڵ یەک، هەر حیزب و فیرقە و خۆی پێ ڕاست و بەهەشتی و ئەوانی تر هەڵە و دۆزەخی، لە ئێستامان بۆ ژیان و پێکەوەیی و مافی مرۆڤ و جێ بەجێ کردنی دین مێژووی ڕابردووش ببینە.

سەرنجی ئوممەتی ئیسلامی و موسڵمانان بدە هەمیشە لەبێ دەسەڵاتی و پەرتەوازەیی و بێ توانایی خۆیدا چاوەڕێی مەهدی و عیسایە بێت و بە عەسایەکی سیحری شتەکان ڕاست کاتەوە کە هەزار ساڵە ڕاست نەبۆتەوە، دوژمنەکان لەناوبەرێ و حوکمڕانی یەکی ڕەشید و ئیسلامی دروست بکات، ئیدی کۆتایی بە بیرکردنەوە و عەقڵ و داهێنان هێناوەو تەنانەت ناتوانێ خوێندنەوەی تازەش قەبوڵ بکات بۆ دەقەکان و هەر بەو خەو و خەیاڵەوەیە کەی بێت و کێ بێت (خەلیفە و ئەهلی حل و عقد) ی بۆ دروست بکاتەوە، کاتێکیش گرووپێک (داعش وەک نمونە) دێت و بانگەشەی خەلیفەبون و ئەو توراث و فیقهەی دەیان ساڵە دەخوێنرێ و دیراسەدەکرێ تەتبیق و جێ بەجێ دەکات، ئنجا لەبەینی وەرگرتن و ڕەتکردنەوەیدا دەسەوسان دەبێت، نمونەی دڕندایەتی و نامرۆڤایەتی و لەهەمان کاتدا بۆ هەمووی بەڵگە و بورهانێکی پێ یە بەدەر لەوەی کێ دروستیان دەکا و ئەجێندای کێ جێ بەجێ دەکەن و ئەمە باسەکەی من نییە، گرنگ بەدەر نی یە لە بەڵگە و فیقهو قسە و فەتوای زانایان.

- ئێستا موسڵمانان بەگشتی لەئاستێکی ناهۆشیارین بەرامبەر شەریعەتی خوا، هەڵبەت بەهۆی ڕاڤە و تێگەیشتنە حەرفی و بێ جەوهەریەکانی بانگخوازان و گەیەنەرانی دینەوە، هەر بۆیە سەرنج بدە ئیسلامییەکان لەناو وڵاتە ئیسلامی یەکان کەمینەن و دەنگی زۆرینە ناهێنن، بەدڵنیاییەوە دەڵێم ئەو جۆرە لە فەهمی دین و مومارەسە و حوکم، شەریعەتی خودا نییە، بەڵکو خوێندنەوەیەکی کۆنی زانایانە لێمان بووە بەدین و ناتوانین تەجاوزی بکەین.

### ئیسلام و دیموکراسی
### ئایا هیچ دژیەک بوونێک هەیە؟

لەڕاستیدا وەڵامی ئەم پرسیارە بەساکاری نادرێتەوە و بۆیە دەبیستین بەشێک لە موسڵمانان بە چاوی گومان و ناتەندروستەوە دەڕوانێتە دیموکراسی و بە بەرنامە و یاسای ناشەرعی دەناسێنێ و بە کوفر و شیرک هەژماری دەکات و دیموکراسی ڕەتدەکاتەوە بە ئایەت مەحکومی دەکەن، یان پێی وایە دیموکراسی بەواتای ئازادی دێت و لەوێشەوە تاوان و فەساد و حەرام و سنوور بەزاندن دروست دەبێ و خۆی ئەمە هەڵە حاڵی بونە لە مانای ئازادی و پێناسەکەی، ئازادی بە مانای فەوزا و هەرکەس هەرچی ویست بیکات نایەت.

ڕوونتر بڵێم: ڕاستە دیموکراتی یەت لەکەش و هەوایەکی ئەورووپیدا نەشونمای کردووە و هەڵکەوتووە و بەم چەمکە نوێیەش هەر زادەی وڵاتانی ئەورووپایە، بەڵام کاتێک بەراوردکاری دەکەی لەنێوان بنەماکانی دیموکراتی و ئیسلامدا هیچ دژیەکبونێک دروست نابێ مادام کۆک بین لەسەر سەنتەر بوونی مرۆڤ لەم گەردونەدا.

- کاتێک مەبەست لە دیموکراتی یەت ئەوە بێت کە هەڵگری پرەنسیپی سیاسی یان کۆمەڵایەتی تایبەتی و دیاریکراو بێت وەک یەکسانی لەبەردەم یاسا و ئازادی هزر و بیرو باوەڕ و بەرجەستەکردنی دادپەروەری کۆمەڵایەتی، یان مافی ژیان و ئازادی و کار کردن و هتد، ئەوا گومانی تێدا نییە کە ئەم پرەنسیپانە هەمووی لە ئیسلامدا بەرجەستەن.

- کاتێک مەبەست لە دیموکراسیی جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکانە (یاسادانا و جێبەجێکردن و دەسەڵاتی دادوەری) ئەمەش لە سیستمی ئیسلام ئاشکرا و ڕوونە، لێرەدا پرسیارێک سەرهەڵدەدات:

### ئایا دروستە پیادەکردنی سیستەمی دیموکراسی لە وڵاتی مۆسڵمان نشین لەکاتێکدا خاوەنی ئیسلامین؟

وتمان دیموکراسی داهێنان و ئەزمونێکی بەشەری یە بۆ حوکمڕانی و دەسەڵات کە پێی گەیشتوە بۆ ڕزگار بوون لە دیکتاتۆری یەت و پاراستنی مافی مرۆڤ و بەشداری هاوڵاتی لە بەڕێوەبردنی وڵات بۆیە هەر داهێنانێک کە خزمەت بە بە مرۆڤایەتی بکات و شکۆی بۆ بگێڕێتەوە ئەوە دەبێتە مۆڵکی مرۆڤایەتی و لە ئامانجەکانی ئیماندارە و کرۆکی داخوازی شەرعی خوایە، (الحكمه ضالة المؤمن..) مامەڵەی لەگەڵ دەکەین و هیچ پێچەوانەی شەرع و بەرنامەی خوا نییە، هاوکات ژیان و ژیار و کۆمەڵگاکان گۆڕاون و زەمەنی دابەشکاری بە ( دار الاسلام و دار الكفر) کۆتایی هاتووەو ئێستا سەردەمی ژیاری ئینسانی یە، هەر شوێنێک تەنراوە بە مافی مرۆڤ و کۆی ئایدیا و بیرکردنەوە و ئازادی کەسی یەکان و بێ ئاگا لەوەی بەدیلی دیموکراسی دیکتاتۆری و خۆسەپاندنە نەک حوکم کردن بە شەرعی خودا، بۆیە مومکین نییە تۆ بتوانی سیستەمێکی حوکمڕانی پێش هەزار ساڵ بەسەر مرۆڤایەتی ئێستادا بە زۆر بسەپێنی، بەڵکو دەبێ سیستەمێک پیادە بکرێت کۆدەنگی و هەڵبژاردەی کۆی مرۆڤایەتی بێت (دیموکراسی وەک نمونە)

### ئیسلام و دیموکراسی و وەستانێک
### بنەما و پایەکانی دیموکراسی

١- گەل سەرچاوەی دەسەڵاتە واتە شەرعیەتی حوکمەت و دەسەڵات لەگەلەوە بێت و بەشێوەی گرێبەست حوکمەت لە هەڵبژاردنی ئازاد و بێ خەوشەوە دادەمەزرێت و بۆ خزمەت کردن و بەڕێوەبردن گەلیش لە سەر بنەمای هەڵبژاردنی نوێنەرەکانی خۆی لە ئەنجومەنی پەرلەمانیدا فەرمانڕەوا سەرپشک دەکا بۆ پیادەکردنی دەسەڵات.

٢- دەسەڵات بەدەستی زۆرینەوە بێت، بەمەرجێ مافی کەمینەکان پارێزراو بێت.

٣- هاوڵاتی بوون سەرچاوەی ماف و یەکسان بوونە لەبەردەم یاسادا.

٤ـ گەڕانەوە بۆ شەرعیەتی دەستوری.
٥ـ مافی مرۆڤ.

ئەم فۆرمە (دیموکراسی) فۆرمێکی مرۆڤایەتیانەیەو لەگەڵ یاسا ئاسمانییەکان دژ نابێتەوە و بەواتای ئەوە نییە گەل هاوتای خودا کرابێ، هاوکات لە ئیسلامدا بەڵگە گەلێکی زۆر هەیە کە پشتگیری ئەم فۆرمە دەکا و لەگەڵ بنەمای ڕاوێژ کردن لە ئیسلامدا یەکدێتەوە، ( **وَأَمْرُهُمْ شُورَى بَيْنَهُمْ**) (**وَشَاوِرْهُمْ فِي الْأَمْرِ فَإِذَا عَزَمْتَ فَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ**) پێغەمبەری ئازیزمان ئەم مەبدەئی ڕاوێژکاری یەی لەزۆر کات و جێگەدا جێ بەجێ کردووە و ڕاوێژی بە هاوەڵان کردووە و بۆچونەکانیشیانی وەرگرتووە.

لە ئیسلامدا (اهل الحل والعقد) هەیە و لێچونی زۆر هەیە لەنێوان ئەنجومەنی ڕاوێژکاری ئیسلامی و پەرلەمان لەسیستەمی دیموکراتیدا، حوکمەت چ ئیسلامی بێت یان دیموکراتی دەبێ ئازادی و مافەکان بۆ گەل دابین بکات، لە ئیسلامدا بەرپرسیارێتی تاک هەیە و کەس تاوانی کەس هەڵناگرێ و لەسەری لێپێچینەوەی لەگەڵ بکرێ (**وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَى**)، مافی تاک و گشتی و یەکسانی لەنێوانیاندا، قورئان بانگی مرۆڤایەتی دەکات بۆ یەکسانی و هەموان وەک یەکن و ڕەنگ و زمان و نەتەوە جیاکاری دروست ناکات و کەس ناکات بە هەڵبژێردراو و گەورەیی پێ ببەخشێ بەسەر ئەوانی تردا (**يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَى وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ** )

ـ سەنتەر بوونی مرۆڤ لە قورئاندا (ولقد كرمنا بني ادم) و هەروەها دروست بوونی کۆی شتەکان بۆ خزمەتی مرۆڤ ( وسخر لكم مافي السماوات والارض)، لێرەوەیە بیرمەندانی ئیسلامی دەڵێن: شەریعەتی ئیسلام دانی ناوە بە بوونی دیموکراتی ئینسانیدا لە بنەماکان لەگەڵیدا وێک دێتەوە.

ـ ئازدی مرۆڤ و سەرەکی ترینیان لە هەڵبژاردنی بیرو باوەڕ ( **فَمَن شَاءَ فَلْيُؤْمِن وَمَن شَاءَ فَلْيَكْفُرْ** ).

ـ لە ئیسلامدا ووتنی ووشەی هەق و ڕاستی ڕەخنە، ماف و ئەرکی هەر تاکێکە بەتایبەت بەرامبەر دەسەڵاتداران ( ان من افضل الجهاد كلمة عدل عند سلطان جائر).

ـ حوکم و یاسادانان

هەندێک لەو بەڵگانەی دەیهێننەوە لەسەر نادروستی دیموکراسی و مومارەسەکردنی (**إِنِ الْحُكْمُ إِلَّا لِلَّهِ أَمَرَ أَلَّا تَعْبُدُوا إِلَّا إِيَّاهُ ذَلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ**)، (**ثُمَّ جَعَلْنَاكَ عَلَى شَرِيعَةٍ مِّنَ الْأَمْرِ فَاتَّبِعْهَا وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَاءَ الَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ** )، (**أَلَا لَهُ الْخَلْقُ وَالْأَمْرُ تَبَارَكَ اللَّهُ رَبُّ الْعَالَمِينَ**)، پێ یان وایە دیموکراسی حوکم کردن و مافی تەشریع لە خودا دەسەنێتەوە و دەیبەخشێتە مرۆڤ، لە ڕاستیدا وانییە و ئەم بابەتە پەیوەستە بەو تێگەیشتن و تەفسیرەی دەکرێت بۆ دەقەکان کە بۆ کۆی شتەکان تەفسیر و تێگەیشتنی جیاواز هەیە تەنانەت لە خودی حەڵاڵ و حەرام ، دروست و نادروست، ووردتر بڵێین حەرام کردن و حەڵاڵ کردن، سەرەنجی فوقەهاکان بدە (ڕەحمەتی خوایان لێبێ) لە تێگەیشتنیان بۆ دەقەکان زۆر جیاوازن، بۆ نمونە ئەوەی بەلای شافعی یەوە حەرامە و نادروستە بەلای حەنەفی یەوە حەڵاڵ و دروستە، ئێ کاری پەرلەمان و و نوێنەرانی هەڵبژێردراو هەرئەوەیە، دەکرێ بڵێی ئاخر فوقەها لە دەقە شەرعیەکانەوە یاساکان و حەرام و حەڵاڵیان هەڵهێنجاوە، دەمەوێ ئەوە بڵێم ئەو کەسانەی ئاوا بیرکردنەوەیەکیان هەیە نایانەوێ قەناعەت بکەن و دان بنێن بەو گۆڕانکاری یە بنەڕەتی یەی لەدونیادا ڕوویداوە و مامەڵەی لەگەڵ بکەن و هەمیشە دابڕاوی کۆمەڵگان و ناتوانن لە ڕوداو و گۆڕانکاری یەکان بەشداری یان هەبێت و لە خەیاڵی ڕابردوودان، هاوکات ئەندامانی پەرلەمان و ئەنجومەنی نوێنەران هەر وا سانا بۆیان نییە بە هەواو ئارەزوی خۆیان بڕیار

لەشتەکان بدەن بەڵکو بەرەچاو کردنی ئاین و مافی مرۆڤ کلتوری نەتەوە و ئەو یاسایانە دەردەچێت و بڕیاری لەسەر دەدرێت کە هەر یەک لەمانە لە قورئان و سوننەتدا باسی جددی و بەگرنگی یەوە قسەی لەسەر کراوە،

دەکرێ بڵێی کەواتە بۆت نییە کەسێک هەڵبژێری کە موخالیف بێت بەدین و کلتور و ئادابی نەتەوەکەی بێت، دەڵێم ئەوەش پەیوستە بە ئاستی رۆشنبیر و هۆشیاری خەڵک و مومارەسەکردنی ئایندارەکانەوە هەیە بۆ ئاینەکەیان، خەڵک تاوانی چی یە بەهۆی مومارەسەی ناتەندروستی موسڵمان و گەیاندنی دین بەدوور لەرەحمەت و میهرەبانی یەکەی، تێگەیشتنەکانی گۆڕاوە و متمانەی بە ئایندارەکان نەماوە.

ـ بەڵام کاتێک دیموکراسی پشت بە ئەو بیرۆکەو فەلسەفیە ببەستێت کە مرۆڤ تاکە شتی هەقیقەتانە و بۆخۆی سەرچاوەی یەکەم و کۆتایی یاسایە و کەس بڕیارەکانی ناگۆڕێ ئەوە ئەم بنەما هزریەی دیموکراتییەت لەگەڵ ئیسلام یەکناگرێتەوە و ڕەتکراوەیە و لای موسڵمان پەسەند نییە و لەئێستادا خۆرئاوا ئەم جۆرە لە دیموکراسی پیادە دەکات، بەڵام گرنگە بزانین دیموکراتییەت یەک جۆر نییە تا ئێمە ئەوەی خۆرئاوا کۆپی پەیست کەین و هەرشوێنەو بەتایبەتمەندی خۆی مومارەسەی دەکات.

لە کۆتایی ئەم نوسین و شیکارییە دەتوانم بڵێم: دژایەتی و بەریەک کەوتن لە نێوان ئیسلام و دیموکراسی دا نییە و پیادەکردنی دیموکراسی بەمانای دژایەتی دین و کەنارخستنی نییە و

لە حوکمی دیموکراسیدا هەموان ڕێز لێگیراون و لە کۆمەڵگەیەکی زۆرینە موسڵماننشین سەوابتی دین پارێزراو و سەرچاوە سەرەکی یەکانی شەریعەت سەرچاوەی گرنگی یاساو ڕێساکان دەبێت،

دەتوانین دیموکراسی بکەینە ئەو کەلیمە سەوائەی هەمومان کۆبکاتەوە و ژیانی پێکەوەیی و ڕێزدارانە لەسەر بنچینەی پاراستنی ئازادی یەکان و مافی مرۆڤ و شکۆی پیرۆزی یەکانی ئاین و باوەڕی کەسی سەنگی مەحەک بێت.



**ئەو سەرچاوانەی بۆ نوسینی ئەم بابەتە سوودم لێ وەرگرتوون:**

ـ قورئانی پیرۆز.
ـ دیموکراسی چی یە لە نوسینی دێڤیدبیتهام و کێڤین بوێل.
ـ **اساسيات فى نظام الحكم في الاسلام ، من تألیف .د.عبدالكريم بكار.**
ـ ڕێسای دیمۆکراسی لەهزری سیاسی ئیسلامدا لەنوسینی د.احمد بەرزنجی.
ـ دیموکراسی و یەکسانی، نوسینی ئێریک کیسلاسی، وەرگێڕانی ستار باقی کریم .
ـ لەدیکتاتۆری یەوە بۆ دیموکراسی ، نوسینی جین شارب ، وەرگێڕانی ئیسماعیل هەورامی.
ـ چەند مەسەلەیەکی باوی سەردەم نوسینی م.علی باپیر.
ـ سیستمی سیاسی و دارمانی سیاسی لەشۆڕشی شارستانی یەوە بۆ بەجیهانیکردنی دیموکراسی لەنوسینی فرانسیس فۆکۆمایا، وەرگێڕ ئاوات ئەحمەد سوڵتان.
ـ دیموکراسی تەوافوقی لێکۆڵینەوەیەکی سیاسی ـ شیکاری یە ، هۆشەنگ دارا.




# رانانێك بۆ پەرتووكی

# «زۆرلێكردن لە ئاییندا نییە»

## ئا: سەنتەری زەهاوی بۆ لێكۆڵینەوەی فیكریی

ئەم بابەتە تایبەتە بە رانانی نووسینێكی شاكارئاسای دكتۆر (تەها جابر ئەلعەلوانی) كە لە بنچینەدا بەزمانی عەرەبی بەناوونیشانی (لا إكراه فی الدین: إشكالیة الردة والمرتدین من صدر الإسلام إلى الیوم = زۆرلێكردن لە ئاییندا نییە: ئاریشەی هەڵگەڕانەوە و هەڵگەڕاوەكان لە سەرەتایی ئیسلام تا ئەمڕۆ) رێنووسكراوە. گەڕی یەكەمی چاپی لە ساڵی ٢٠٠٣ لەلایەن (مكتبة الشروق الدولیة)لە دووتوێی پەرتووكێكی ٢٠٠ لاپەرەی چاپ و بڵاوكراوەتەوە، هەروەها گەڕی دووەمی چاپ لە ساڵی ٢٠٠٦ بەهاوبەشی لەنێوان پەیمانگای جیهانی فیكریی ئیسلامی و (مكتبة الشروق الدولیة) چاپ و بڵاوكراوەتەوە. ئەم پەرتووكە جیا لە پێشەكی و كۆتایی لە حەوت بەشی سەرەكی و پاشكۆییەكی شێخ (عبدالله بن بەییەی موریتانی) پێكهاتووە، كە لە خوارەوە رانانێكی لەسەر دەخەینە روو.

لە پێشەكی پەرتووكەكە نووسەر ئاماژە بۆ ئەوە دەكات كە هیچ دەقێكی راشكاو لە قورئان و هیچ دەقێكی راشكاوی دروست لە فەرمووده سەبارەت بە كوشتنی هەڵگەڕاوە لە ئایین نەهاتووە، هەر لەوێدا ئاماژە بەوە دەدات كە هیچ رووداوێكی بۆ ساغ نەبۆتەوە، كە پەیامهێن (د.خ) هەڵگەڕاوەی لە ئایین، تەنیا لەسەر خودی هەڵگەڕانەوەكە كوشتبێت، لەكاتێكدا چەندین حاڵەتی هەڵگەڕانەوە بە ئاگاداری پەیامهێن (د.خ) لە سەردەمی ئەودا روویانداوە. هەروەها دوای لێكۆڵینەوەیەكی ورد نووسەر دەنوسێت كە نەگەیشتووە بەهیچ بەڵگەیەك لە فەرمووده كە سزایەكی دیاریكراوی شەرعی دونیایی بۆ هەڵگەڕاوەی لە ئایین دیاركردبێت.

سەبارەت بە هەڵوێستی مەزهەب و فەقیهەکان، باس لەوە دەکات، کە فەقیهە بەرێزەکان حوکمی ئەو هەڵگەڕاوەیان بە کوشتن دیاریکردووە، کە تاوانێکی فرە رەهەندی ئەنجامداوە، کە تاوانەکە خاوەن رەهەندی سیاسی و یاسایی و کۆمەڵایەتی بووە، بەهۆی ئایین گۆڕینەکەی کابرای هەڵگەڕاوە هەڵوێستەکانی خۆی لە بەرامبەر ئومەت، کۆمەڵ، کۆمەڵگە، فەرمانڕەوا سیاسییەکان، کۆی سیستەمی وڵات، ئینتیما و وەلائیشی بەتەواوی گۆڕیووە.

سەبارەت بە هەبوونی کۆڕا (ئیجماع) لەسەر سزادانی هەڵگەڕاوە، نووسەر ئاماژەدەکات کە دوای لێکۆڵینەوە بۆی دەرکەوتووە کە هیچ جۆرە حەد و سزایەکی شەرعی جێگیر لە قورئان و فەرموودە بۆ کەسی هەڵگەڕاوە لە ئارادا نییە. هەروەک بۆی یەکلابۆتەوە کە مرۆڤ خاوەنی ئازادی هەڵبژاردنی ئایین و ئایینداریییە، ئەمەش لەچوارچێوەی ئەو ئازادییە خودییەیە کە خودا بە مرۆڤی بەخشیووە، هەر ئەم ئازادییەش بریتییە لە چەقی بەرپرسیارییەت لە مرۆڤدا، زۆرلێکراویش لە دەرەوەی بازنەی بەرپرسیارییەتییە و هیچ جۆرە بەرپرسیارییەتێکی دونیایی و دوارۆژی ناکەوێتە ئەستۆ سەبارەت بەو کارەی بەزۆر پێیکراوە، مرۆڤ بە ئەندازەی کەمکردنەوەی ئازادییەکەی بەرپرسیارییەتەکەشی کەمدەبێتەوە، چونکە سەرجەم ئەو ئەرک و فرمانانەی خراونەتە گەردنی وابەستەی توانا و وزەکانییەتی. پەروەرێن ویستی رەها و ئازادی و کاراییەکی تەواوی بەمرۆڤ بەخشییووە و سەرپشکی کردووە کە ئازادانە چی بوێت ئەو هەڵبژێرێت.

بنەما لەسەر ئەمە، پەروەرێن جیاکاری کردووە لە نێوان بەرپرسیارییەتی لەهەمبەر روودانی شتێکی نەخوازراو بە هەڵە لەگەڵ ئەنجامدانی تاوانێک بە ئەنقەست، هەروەک چۆن جیاکاری کردووە لە نێوان لێکەوتەیەکی هەڵە بەهۆی گوێپێنەدان هەروەها لێکەوتەیەکی هەڵەی بە ئەنقەست، هەروەها جیاکاری کردووە لە نێوان بەردەوام بوون لە سەر هەڵە و پەشیمانی و تەوبەکردن، هەموو ئەمانە بەڵگەی راشکاون لەسەر ئازادی مرۆڤ لە ویست و مەبەست و هزر و بۆچوون و کرداردا.

ئەم پەرتووکەش وەک پێداچوونەوەیەکی زۆر جدی سەبارەت بە پرسێکی ئاڵۆز و کێشەدار هەژماردەکات و فەقیە و زانا و قوتابییانی زانستە شەرعییەکان رادەسپێرێت سڵنەکەنەوە لە پاڵفتەکردنی کەلەپووری ئیسلامی.

هەروەها ئاماژە بە دوو تێبینی زۆر گرنگ دەدات، یەکەمیان سەبارەت بەم پەرتووکە کە لە بنەڕەتدا رەشنووسەکەی تەنیا ١٠٠ لاپەڕە بووە و لە ساڵی ١٩٩٢ ئامادەی کردووە، بەهۆی ئەوەی ئەو کات سەرۆکی پەیمانگای جیهانی فیکریی ئیسلامی بووە، لەسەر پێشنیازی بەشێک لە هاورێکانی لە ترسی ئەوەی لەسەر ناوبانگی پەیمانگا نەکەوێت بڵاوی نەکردۆتەوە. دوابەدوای دەستلەکارهەڵگرتنی لە سەرۆکایەتی پەیمانگا لە ساڵی ١٩٩٦ دیسان بەهۆی ئەوەی سەرۆکی زانکۆی قورتوبە بووە، بڵاوکردنەوەکەی دواخستووە لەترسی ئەوەی لەسەر ناوبانگی زانکۆکە بکەوێت. دوای شەش ساڵ خۆی گوتەنی: «تەمەن هەڵکشا و نەخۆشی زیاد بوون، ناشمەوێت ئەو زانستەی خودا پێیبەخشیوم بیشارمەوە، چونکە هەر کەس خودا زانستێکی پێبدات و بیشارێتەوە خودا بە لغاوێکی ئاگرین لە رۆژی دوایدا زاربەستی دەکات». بۆیە لە ساڵی ٢٠٠٢ پاکنووسی کردووە و لە ساڵی ٢٠٠٣ چاپ و بڵاوکراوەتەوە.

سەبارەت بە میتۆدی توێژینەوە، جەختدەکاتەوە لەسەر ئەوەی، کە دەرەنجامەکانی ئەم پەرتووکە، بەرهەمی بیرۆکەیەکی پێشەکی یان قەناعەتێکی کۆن نەبووە، بەڵکو بێلایەنانە لێکۆڵینەوەی ئەنجامداوە و لە پرۆسەی لێکۆڵینەوەکە خۆی داشۆرییووە لە هەر دیدوبۆچوون و هەڵوێستێکی پێشوەختە، ئەمەش لە پێناو گەیشتن بە دەرەنجامێکی زانستی بێ لایەن و دوور لە تەرەفگیری، ئاشکرایە کە بەشێکی زۆری توێژینەوەکان تەنیا لە پێناو سەلماندنی قەناعەتی پێشوەختەیە، کە عەلوانی بانگەشەی ئەوە دەکات کە خۆی لە ئاکارێکی لەم چەشنە بەدور گرتووە.

هەروەها سەبارەت بە سەرچاوەکانی شەریعەت، عەلوانی قورئان بە سەرچاوەی دارێژەر و ئاشکراکاری

حوكمەكان هەژمار دەكات و قەناعەتی تەواوی بە باڵادەستی قورئان (حاكمية الكتاب) هەبووە، هەروەها فەرموودەی بە سەرچاوەی روونكەرەوەی قورئان هەژماركردووە كە پابەندبوون پێوەی كارێكی حەتمییە و فەرامۆشكردنی رێپێنەدراوە، هیچ بانگەشەیەكی كۆڕای وەرنەگرتووە كە راجیایی هاوەڵانی لەسەر بوبێت، بەها باڵاكان و مەبەستەكانی شەریعەی وەك بەڵگە گشتییەكان و مەشخەڵی روناك كەرەوە لە دەلالەتی بەڵگە ناسەرەكییەكان هەژماركردووە.

سەبارەت بە پرسی سەرەكی پەرتووكە، ئاماژە بۆ ئەوە دەكات كە چۆن ئوسوڵییەكان هەوڵیانداوە، بەر لەهەمووشتێك (چەقی حوكمدان = تحقيق المنطاق) بدۆزنەوە و پاڵفتەی بكەن و بیسەلمێنن لە هەر پرسێكدا و دواتر شوێنی راجیاییان شیكاركردووە، ئەویش لەسەر هەمان رێچكە پرسەكەی شیكار كردووە، بۆ ئەوەی هیچ تۆمەتێكی بۆ هەڵنەبەسترێت، هەر لە دەستپێكەوە چوار خاڵی روونكردونەتەوە، كە ئەمانەن:

یەكەم: هەركەس دوای ئاشنابوون بە ئیسلام و ئیمان پێهێنان بەراستەقینەیی لە ئیسلام هەڵگەڕایەوە، ئەوە كافری ئاشكرایە، چ جای ئەوەی ئایینەكەی بۆ ئایینێكی تر بگۆڕێت، یان بەبێ ئایین بمێنێتەوە، ئەم توێژینەوەیە خۆی لە قەرەی ئەم جۆرە كوفرە نادات، چونكە حوكمەكەی ئاشكرایە و پێویست بە روونكردنەوە ناكات.

دووەم: هەر تاوانێك كەسی هەڵگەڕاوە بیكات، لە دژی خەڵك، یان سیستەم و نەریتە گشتییەكان، یان دەرچوون لەسەر حاكمی ئومەت ..هتد پێویستە بەپێی یاسا بەركارەكان مامەڵەی لەگەڵ بكرێت، ئەگەر هەڵگەڕانەوەكەی جێبەجێكردنی حوكمەكانی لەسەر توند تر نەكات نابێت سوكتری بكات.

سێیەم: توێژەر بۆچوونی وایە، كە نابێت رێگە بە كەسی هەڵگەڕاوە بدرێت، بانگەشە بە نهێنی یان ئاشكرا، بۆ هزرەكەی بكات و خەڵك لە دەوری خۆی كۆبكاتەوە و بەرەو دژایەتی بیروباور و تەصەورات و نەریتەكانی كۆمەڵگە هەنگاوبنێت، بەڵكو دەبێت رێگری لێبكرێت و بە ئەندازەی ترسناكی چالاكییە نارەواكانی سزابدرێت.

چوارەم: پرسی سەرەكی بابەتەكە بریتییە لە هەڵگەڕانەوەی تاكەكەس، بەو واتایەی كە بیروباوەڕی بگۆڕێت هاوڕێ لەگەڵ هزر و تەصەور و ئاكارە بونیادنراوەكان لەسەر بیروباوەڕەكەی، بەمەرجێك كە هەڵگەڕانەوەكەی نەبوبێتە هۆكاری دەرچوون لە كۆمەڵ و رژێمی حوكمڕان و سەرۆك و دەسەڵات، چەكی هەڵنەگرتبێت و رێگری نەكات، نەچێتە پاڵ دوژمن و خیانەت لە گەل و نیشتیمان نەكات، ئینجا ئەگەر حاڵەتێكی لەم چەشنە روویدا، ئایا حوكمەكەی بنەما لەسەر شەرعی خودا بریتییە لە كوشتن دوای داوای تەوبە لێكردن یاخود نا؟، ئایا تەنیا لەسەر بیروباوەر گۆڕین دەكوژرێت؟، ئایا لەسەر ئومەت پێویستە بە زەبری هێز بیگێڕنەوە ناو بازنەی ئیسلام؟ ئایا پرسێكی لەم چەشنە ناچێتە خانەی (زۆرلێكردن لە ئایین) كە قورئان رێگری لێكردووە؟ ئایا تەنیا كوفر بەسە بۆ ئەوەی ببێتە هۆكاری بەكوشتچوونی خاوەنەكەی لە رووی شەرعەوە؟ ئایا حوكمی كوشتنی كەسی هەڵگەڕاوە كۆڕای لەسەرە؟ یاخود راجیایی لەسەرە و بەتەواوی روون نەكراوەتەوە؟ ئایا سزای هەڵگەڕانەوە لەلای زۆرینەی ئەو كەسانەی بڕوایان پێهەیە لە سەر تاوانێكی سیاسییە یان تاوانێكە دەچێتە خانەی تاوانكاری؟ ئەگەر بڕیاربێت بە (الحد) سزای شەرعی هەژماربكرێت، ئەم سزایە بۆ بەكافرناسندنیەتی یان بۆ پاكبونەوە، لەكاتێك كە دەق هەیە سزاكان بۆ خاوێنكردنەوەی كەسی تاوانكارن؟، ئایا هەڵگەڕانەوە بە لە ئیسلام دەرچوون یان لەسەر ئیسلام دەرچوون هەژمار دەكرێت؟.

بەمشێوەیە پێشەكییەكی تۆكمە و دەستپێكێكی نایاب بۆ پەرتووكەكە دادەڕێژێت، ئینجا بۆ شیكاری تەواوی پرسەكە دەستپێدەكات.

**لەبەشی یەكەمدا،** بانگەشەی هەبوونی كۆڕا لەسەر واجبوونی كوشتنی هەڵگەڕاوە تاوتوێ دەكات، ئینجا قۆرخكردنی سیاسی (سزای هەڵگەڕانەوە) لەسەر ئەو كەسانەی تۆمەتباربوون بە هەڵگەڕانەوە و پاكتاوكردنیان، مەترسییەكانی بەردەوامی رەوایەتییدان بە سزای هەڵگەڕانەوە، قسەیەك بۆ وتن، نەگۆڕ و

گۆڕاوەکان، مەفهومی (الحد) لە نێوان قورئانی پیرۆز و فیقهی ئیسلامییدا، فەقیهەکان و چەمکەکانییان سەبارەت بە (الحدود) شیکار دەکات، هەر یەکێک لەم پرسانە لە بڕگەیەکی تایبەت گەنگەشە دەکات.

**لە بەشی دووەمدا:** پێشەکییەکانی سەرکێش بۆ رەوایەتییدان بە (سزای هەڵگەڕانەوە)، هەر لە ناونیشانەکە دیارە کە ئەم بەشە بریتییە لە شیکاری ئەو پێشەکییانە (المقدمات) کە ئەنجامگیرییەکانی تایبەت بە کوشتنی هەڵگەڕاوەی لەسەر بیناکراوە، ئەمەش لە میانەی چەند بڕگەیەک بەپایان دەگەیەنێت، گرنگترینیان ئەمانەن: رێبازی نوێگەری قورئان و ناوەڕۆک و پێکهاتەی نوێگەرییەکە، نوێگەری بە میتۆدی زانستی دێتە ئاراوە نەوەک بە تەئویل و پاساوهێنانەوەی پچڕپچڕ، پێویستی ئومەت بۆ تێپەڕاندنی قەیرانی هزری، لەنێوان رەهاگەری و رێژەگەری و سەرچاوەکانی یاسادانان، سەرچاوەی مەترسی بۆ سەر تێگەیشتنی مرۆڤ لە کوێیە؟

بەمەش کۆتایی بەم بەشە دەهێنێت.

**بەشی سێیەم:** سامناکی تێکەڵکاری مەعریفی بەر لە بونیادنانی میتۆد و نموونە، لەم بەشەشدا تیشک دەخاتە سەر گرنگی میتۆدی توێژینەوە، تایبەت لە پرسە مەعریفییەکان و مەترسیداری بێ میتۆدی لە توێژینەوەدا. ئەم بەشەش وەک بەشەکانی رابردوو بەسەر چەند بڕگەیەک دابەش دەکات، دیارترینیان: تایبەتمەندییەکانی کۆتا پەیام، چۆن تێکهەڵکاری لە نێوان هەردوو کەلەپووری ئیسلامی و جولەکە هاتۆتە ئاراوە، ئامانجەکانی جولەکە لە تێکهەڵکێشی رۆشنبیری، دارشتەی جوولەکە و دەروازەکانی بەئەنجامگەیاندنی ساختەکاری لە کەلەپووری ئیسلامی، دەستتێخستن (اختراق) و ساختەکاری و هەڵبەستن لە فەرموودەدا، لافلێدانی رۆشنهزری و دەستتێخستنی مەعریفی، بوونی فیکریی جوولەکە لە نیمچە دوورگەی عەرەبی.

**بەشی چوارەم:** هەقیقەتی هەڵگەڕانەوە لە قورئانی پیرۆزدا، ئەم بەشەش لە چوار تەوەری سەرەکی پێکهاتووە، کە ئەمانەن: مەفهومی هەڵگەڕانەوە لە قورئانی پیرۆزدا، ئازادی بیروباوەڕ مەبەستێکی گرنگە لە مەبەستەکانی شەریعە، هۆکاری دابەزینی ئایەتی: (لا إكراه فی الدين) مەبەست و ئامانجەکانی، بێبڕوایی بنچینەیی و بێبڕوایی دوای مسوڵمان بوون.

**بەشی پێنجەم:** فەرموودەی پەیامهێن و کوشتنی هەڵگەڕاوە، ئەم بەشە وەک روپێوێکی مەیدانی تایبەت کراوە، بۆ شیکارکردنی سەرجەم ئەو پرسانەی لە کەلەپووری ئیسلامییدا وەک کوشتنی هەڵگەڕاوە ناسێنراون، لە پێناو بەپایان گەیاندنی روپێو و بەدواداچوونەکەشی ئەم بەشەشی وەک بەشەکانی تر بڕگە بڕگە ریئنووس کردووە، بەمشێوەیەی خوارەوە:

روودانی هەڵگەڕانەوە بەهۆی چەند شتێک لەسەردەمی پەیامهێن (د.خ) وەک هەڵگەڕانەوە دوای ئیسرا و میعراج، هەڵگەڕانەوەی چەند کەسێک دوای کۆچ بۆ حەبەشە، هەڵگەڕانەوەی نووسەری سرووش (وەحی)، ئەو کەسانەی پەیامهێن (د.خ) خوێنی حەلاڵکردن بەهۆی ئازاردان و تاوانکارییەکانیان وهەڵگەڕانەوەیان، هەڵگەڕاوەکانی هۆزی عوکل، دیاردەی دووڕوویی، ئایا پەیامهێن (د.خ) هیچ هەڵگەڕاوەیەکی کوشتووە؟. دوای وەڵامی ئەم پرسیارە درێژە بە بابەتەکان دەدات، زیاتر لەسەر پرسی فەرموودە و سزای هەڵگەڕاوە و هەڵگەڕانەوە دەوەستێت، چەند بڕگەیەکی بۆ تەرخان دەکات، وەک: فەرموودەی گوفتاری و وتەکانی هاوەڵان، وتەکانی عومەری کوری خەتاب، فەرموودەی (هەرکەس ئاینی خۆی گۆڕی بیکوژن) و هەندێ لە لێکەوتە پرکێشمەکێشمە پەیوەستەکان پێوەی، بەلای پێشخستنی فەرموودە لەسەر قورئانی پیرۆز، فەرموودە و رێگاکانی، وتە گوازراوەکان لە ئەبوبەکری صدیق، وتەگوازراوەکان لە عەلی کوری ئەبو تالیب، وتەکانی عوسمانی کوری عەففان.

**بەشی شەشەم:** مەزهەبی فەقیهەکان لە سزادانی هەڵگەڕاوە، لەم بەشەدا لەسەر بۆچوونی پێشەوایانی مەزهەبە جۆراوجۆرەکانی مسوڵمانان دەوەستێت، لە هەر چوار مەزهەبەکەی ئەهلی سوننە دەستپێدەکات و تا ئیمامییەکان و زەیدی و ئیبازییەکانیش شیکاردەکات، ئەمەش لە میانەی چەند بڕگەیەکدا، دیارترینیان: چۆن تێکهەڵی لەنێوان پرسە ئایینی و سیاسییەکان

رووی‌داوە؟، مەزهەبەکانی ئەبو حەنیفە، مالیک، شافیعی، حەنبەلی لە کوشتنی هەڵگەڕاوە، هەڵوێستی شیعە ئیمامییەکان، مەزهەبی دەقگەراکان (الظاهریة)، مەزهەبی زەیدی و ئیبازییەکان.

بەشی حەوتەم: نموونەی چەند زانایەکی تۆمەتبارکراو بە هەڵگەڕانەوە، لەم بەشەدا شانزە پرس شیکار دەکات، کە لەلایەن دەسەڵاتداران بە تۆمەتی هەڵگەڕانەوە لە ئایین تۆمەتبارکراون و دواتر لە سێدارەدراون، دیارترینی ئەم کەسانەش: ئەحمەدی کوری نەسری خوزاعی، ئەبو حەییانی تەوحیدی، محەممەدی کوری عەبدولکەریم، المیانجی، الکیاهراسی، الجعدی، ئیبراهیم ئەلبقاعی، ئیبن و لئاباڕی ئەندەلوسی، ئەبو فەرەج، ئیبن زەرقونی مالیکی، حافزی ئەلموززی...هتد.

لە کۆتاییدا ئاماژە بۆ ئەوە دەکات، کە بۆچوونی فەقیهەکانی پێشین سەبارەت بە کوشتنی هەڵگەڕاوە، بنەما لەسەر زۆرینەی پرسەکانی ئەو کات بونیادنراوە، کە زۆربەیان تەنیا بەهۆکاری هەڵگەڕانەوە و ئایین گۆڕین نەکوژراون، بەڵکو لە پاڵ هەڵگەڕانەوە کەوتوونەتە سەنگەرگرتن لە شەرع، ئایین، ئایینداری، خاک، سیستەم و دەسەڵات، فەرمانڕەوا و گەل، هەر بۆیە ئەوانیش بڕیاری سزای ملپەڕاندنیان بۆ داون، بەڵام ئەگەر کەسێک تەنیا ئایین و بیروباوەڕی بگۆڕێت، سەنگەر لە هیچ یەک لە ئایین و حوکمڕانیەت و گەل و نەریت و بەها باڵاکان نەگرێت، حوکمەکەی ملپەڕاندن نییە.

**پاشکۆ:** وتەی شێخ عەبدوڵا ی کوری شێخ مەحفوزی کوری بەییەی موریتانی.

ئەم پاشکۆیە بریتییە لە هەڵسەنگاندنێکی وردی ناوبراو سەبارەت بە پەرتووکەکە، لە دەستپێکی هەڵسەنگاندنەکە، ئاماژە بۆ ئەوەدەکات، کە لەبەر سێ هۆکار ئەم پاشکۆ و هەڵسەنگاندنەی نووسیووە، کە ئەمانەن:

یەکەم: دکتۆر تەها جابر داوای لە (شێخ بن بەیە) کردووە کە بۆچوونی خۆی لەسەر پەرتووکەکە دەربڕێت، بەهۆی دڵسۆزییەکەی شێخ ئەو داوایەی قبوڵکردووە.

دووەم: دکتور تەها عەلمانی نییە تا سەنگەر لە ئایین بگرێت و هەوڵی روخاندنی ئایین بدات لە رێگەی گومان دروستکردن، بەڵکو پیاوێکی پارێزکاری ئایینە بە گوفتار و کردار هەر لەسەرەتای تەمەنی لاویەتییەوە، لەپێناو ئەمەشدا تووشی چەندین چەرمەسەری هاتووە.

سێیەم: دکتۆر تەها لە جۆری ئەم بیرمەند و رۆشنبیرانە نییە کە هەوڵی چارەسەری پرسەکانی تایبەت بە مسوڵمانان بدەن لە دەرەوەی میتۆدی زانستە ئیسلامییەکان، بەڵکو زانایەکی ئوسوڵی رۆچووە، کە مامەڵە لەگەڵ پرسەکان دەکات لە رێگەی ئامرازە ناسراوەکانی زانستە ئیسلامییەکان، هەروەها دکتۆر تەها زانایەکە لە زاناکانی شەریعە، کە ئەمەش وادەخوازێت رێزی بۆ چوونەکانی بگیردرێت و بەبێ خەوش و هەڵەش هەژمارنەکرێت.

ئینجا سەبارەت بە پەرتووکەکە ئاماژە بۆ ئەوە دەکات، کە هاوڕایە لەگەڵ دکتۆر تەها لە زۆربەی نووسینەکە، تایبەت لە پرسی زێدەڕۆییکردن لە تەکفیرکردنی خەڵک، هەروەها لە هەڵقۆستنەوەی دەسەڵات و بەکارهێنانی حوکم و سزای هەڵگەڕانەوە لە ئایین و پاکتاوکردنی نەیارەکانییان.

هەروەها شێخ لە چەند خاڵێک لەگەڵ دکتۆر تەها هاوڕانیە، بۆ نموونە لە مەفهومی (الحد) لە قورئاندا، هەروەها پرسی پەیوەندی نێوان قورئان و فەرمووده، ئایا تەنیا قورئان داڕێژەر و سەرچاوەی حوکمە یاخود سونەتیش؟، هەروەها سەبارەت بە سزای مورتەد ئایا جێبەجێکراوە لە سەردەمی هاوەڵان یان نا؟ دواتر حەوت خاڵ وەک پوختەی بۆچوونەکانی لەهەمبەر پرسەکانی ناو پەرتووکەکە رێنووس دەکات.

ماوەتەوە بڵێین، کە ئەم پەرتووکەکە یەکێکە لە نایابترین ئەو پەرتووکانەی لەسەر پرسەکە نوسراون، بە حوکمی ئەوەی کە دکتۆر تەها هەم رۆشنهزر و بیرمەند بووە و هەمیش گەورە ئوسوڵی و زانایەکی گەورەی هاوچەرخ بوو، تایبەت لە برەودان بە پرسە ئاڵۆز و کێشەلەسەرە هاوچەرخەکان و پاڵفتەکردنی کەلەپووری ئیسلامی.

# ئاوڕدانەوەیەك

# لە بەها باڵاكانی شارستانیەتی ئیسلامی



**د . عەدنان هەورامانی**

لەدایكبووی ١٩٧٧. پڕۆفیسۆری یاریدەدەرە لە زانكۆی سلێمانی و زانكۆی گەشەپێدانی مرۆیی ، خاوەنی ٤ كتێب و ١٢ توێژینەوە و چەندین بابەتە لە گۆڤارەكاندا.

خوێندنی شارستانیەتی ئیسلامی لە پەیمانگاو زانکۆکانماندا گرفتارە بەدەست چەندین کەمو کورتیەوە، دیارترینیان پێشکەشکردنی ئەم شارستانیەتەیە بە پچڕ پچڕی، ئەمەش وەک لەتکردنی جەستەی ئەم شارستانیەتەیەو مایەی لەدەستدانی کەسایەتی و تایبەتمەندیەتی لە نێو شارستانیەتەکاندا، دواجار وەک چەند چالاکیەکی رۆشنبیری و زانیاری و مەدەنیانەی لێدێت لەم بوارەدا، بەچەند تایبەتمەندیکەوە، ئیتر نابێتە دیدگاو بۆچوونی کۆتایی هەڵگرانی ئەم شارستانیەتە بۆ ژیان.

خوێندکارانمان قۆناغەکانی خوێندن تێدەپەڕێنن، بەڵام زانیاریەکی وردی تایبەتمەدیەکانی شارستانیەتی ئیسلامی نازانن، نازانن چی ئەم شارستانیەتە لەوانی تر جیا دەکاتەوە، بەڵکو توانای ئەوەیان نییە کە شانازی بەم شارستانیەتەوە بکەن، چونکە خوێندنی شارستانیەت دەبێت هەڵگری دیدێکی پەروەردەییانە بێت، بەڵام بەم جۆرە هەڵە مامەڵە کردنە ئەم لایەنە پەروەردەییە ون دەبێت و خوێندکار ناتوانێت پەنا بۆ ئەم شارستانیەتەی ببات لەبەرامبەر کایە گرنگەکانی ئەم جیهانە، بەڵکو هەدێکجار ئەنجامەکە پێچەوانە دەبێتەوە و پۆلێکی بێ شومار لە دەرچوان دژایەتی شارستانیەتەکەیان دەکەن و سەرسامی شارستانیەتەکانی تر دەبن، بەهۆی ئەو دیمەنە بریقەدارەی شارستانیەتی رۆژئاوا هەیەتی، بەمەش خوێندنی شارستانیەتی ئیسلامی دەبێتە چەکێک دژ بەخۆمان و متمانەی پێ لەدەست دەدەین و پێمان وادەبێت کە توانای مانەوەو کاردانەوەی نابێت لەم سەردەمەدا، وە ناتوانێت جارێتر داڕێژەرەوەی پاشەڕۆژی مرۆڤایەتی بێت.

گومانی تێدا نیە لە لێکۆڵینەوەی شارستانیەتی ئیسلامیدا رۆژئاوا پێش ئێمە کەوتوون، هەوڵە لەبەرچاوەکانی مێژوونووسی بەریتانی (ئەرنۆڵد تۆیبینی) لە دانراوە ناسراوەکەیدا بە ناوی (دراسة للتأريخ)، مامەڵەیەکی وردی لەگەڵ شارستانیەتەکاندا کردووە بۆ ماوەی بیست نۆ ساڵ، بەدواداچوونی وردی بۆ مێژوو کردووە، دیارە هەموو شارستانیەتێکیش خاوەنی خەسڵەتگیری تایبەتمەندی خۆی بووەو رێخۆشکەر بووە بۆ شارستانیەتی دوای خۆی.

بەهەرحاڵ، ئێمە لەمڕۆدا کە هەوڵی ئەوە دەدەین لە شارستانی ئیسلامی بکۆڵینەوە، زیاد لە هەموو کاتێک پێویستمان بە میتۆدێکی نزیک لەو میتۆدەی(ئەرنۆڵد تۆیبینی)یە، کە بە جۆرێک مامەڵە لەگەڵ شارستانیەتی ئیسلامی بکات، کە خاوەنی تایبەتمەندی خۆی بێت لە سەرجەم بوارەکاندا، کاتێ زانیمان کە ئەم شارستانیەتە لە نەبوونەوە یەکسەر هەڵنەتۆقیوە، وە لە شارستانیەتەکانی تر بەشێوەیەکی میکانیکی تایبەتمەندی وەرنەگرتووە تا قەرزارباریان بێت.

لەمڕۆدا زیاتر لە جاران پێویستیمان بە لێکۆڵینەوەی شارستانیەتی ئیسلامیە، چونکە ئێمە لەبەرامبەر بانگەشەی پێشکەشکردنی بەدیلێکی نوێ و پرۆژەیەکی شارستانی تازەداین، بەهۆی دروستبوونی ئەو بۆشایی فەراغە رۆحیەی کە زۆرێک لە سیستەم و بۆچوون و ئەزموونە دەستکردەکان هێناویانەتە کایە.

یەکەم وشەیەک کەلە ئەشکەوتی حیرا دابەزی بۆ پێغەمبەری خودا (درودی خوای لەسەر)، بە رستەی نەفی دەستی پێنەکرد، نەیفەرموو: ( لا تقتل، لا تسرق، لا تزن... هتد ) بەڵکو بە رستەی ئیجاب و ئەرێنی دەستی پێکرد، وە جەختکردنەوە بوو لە ئەنجامدانی کردایکی مەعریفی کە خوێندنە: [ اقرأ

باسم ربک الذي خلق * خلق الإنسان من علق * اقرأ وربک الأكرم * الذي علم بالقلم * علم الإنسان ما لم يعلم ] ( سوره تى العلق: ١ ـ ٥ )، خوێندنەوەو زانست و قەڵەم، ئەمانە وشە پێکهێنەرەکانی یەکەم سورەتێکن کە بۆ یەکەمجار دادەبەزێت.

هەر تەنها بەوەوە نەوەستاوە، بەڵکو واتای ئەم کایە مەعریفیە درێژ بوەتەوە بۆ زەمەنێکی دوورتر، تا ساتەوەختی دروست بوونی پێغەمبەر ئادەم (درودی خوای لەسەر) کە خودا فێری هەموو ناوەکانی کرد و دواتر بەخشیە نەوەکانی، تا جەستەو ژیریان ئامادەی ئاوەدانکردنەوەی جیهان بێت: ﴿**وَعَلَّمَ آدَمَ الأَسْمَاءَ كُلَّهَا ثُمَّ عَرَضَهُمْ عَلَى الْمَلاَئِكَةِ فَقَالَ أَنبِئُونِي بِأَسْمَاءِ هَؤُلاءِ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ (٣١) قَالُواْ سُبْحَانَكَ لاَ عِلْمَ لَنَا إِلاَّ مَا عَلَّمْتَنَا إِنَّكَ أَنتَ الْعَلِيمُ الْحَكِيمُ (٣٢) قَالَ يَا آدَمُ أَنبِئْهُم بِأَسْمَآئِهِمْ فَلَمَّا أَنبَأَهُم بِأَسْمَآئِهِمْ قَالَ أَلَمْ أَقُل لَّكُمْ إِنِّي أَعْلَمُ غَيْبَ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ وَأَعْلَمُ مَا تُبْدُونَ وَمَا كُنتُمْ تَكْتُمُونَ**﴾ (سوره تى البقرة: ٣١ ـ ٣٣ ).

قورئانی پیرۆز جەخت دەکاتەوە لەوەی کە ئێمە ڕووەو پێش بڕوانین و لا نەکەینەوە بۆ دواوە، جگە لە چەند حاڵەتێکی پێویستدا نەبێت، ئەویش لە باب و باپیرانەوە کەلەپورێکی زانستی و مەعریفی وەرگرین و بیکەینە ڕێنیشاندەر بۆ ئاگادار بوون لە ڕاست و هەڵەی پێگەی ئێستەمان، چونکە ئەگەر تەنها بۆ چاولێکردنێکی کوێرانە بێت، ئەوا بە عەیبە و نەنگی ئەژمار دەکرێت و پێچەوانەی ویستی ئەو ئیرادەیەیە کە قورئان بانگەشەی بۆ کرد: ﴿**قَالُواْ أَجِئْتَنَا لِتَلْفِتَنَا عَمَّا وَجَدْنَا عَلَيْهِ آبَاءنَا**﴾ (ونس: ٧٨ )، ﴿ **إِنَّا وَجَدْنَا آبَاءنَا عَلَى أُمَّةٍ وَإِنَّا عَلَى آثَارِهِم مُّقْتَدُونَ** ﴾ (الزخرف: ٣٣)، ئەم جۆرە تەقلیدو شوێنکەوتنە ئیسلام بە توندی بەربەرچی دەداتەوە.

توینبی: کە مێژوو نوسێکی بەریتانی ناسراوە، ئاماژە بە دوو مامەڵە دەدات لەگەڵ کەلتوری باب و باپیراندا، مامەڵەیەکیان: تەقلیدێکی کوێرانەیە، ئەمەش لەقۆناغی شکستی شارستانیەتدا بوو، مامەڵەیەک کە دواکەوتنی شارەزایان و داهێنەرانە، ئەمەش بە قۆناغی گەشەسەندنی شارستانی ئەژمار دەکرێت، قورئانی پیرۆز یەکەمیان ڕەفز دەکات، چونکە مایەی نشوستی و دواکەوتنە.

لە کوتایدا: قورئانی پیرۆز پانتاییەکی زۆری مێژوو بۆ ئێمە باس دەکات، تا بەدوای پەندو عیبرەتەکانیدا بگەڕێین و بۆ داهاتووشمان کەڵکی لێوەربگرین: ﴿ **لَقَدْ كَانَ فِي قَصَصِهِمْ عِبْرَةٌ لِّأُوْلِي الأَلْبَابِ مَا كَانَ حَدِيثاً يُفْتَرَى وَلَكِن تَصْدِيقَ الَّذِي بَيْنَ يَدَيْهِ وَتَفْصِيلَ كُلَّ شَيْءٍ وَهُدىً وَرَحْمَةً لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ** ﴾ (**يوسف: ١١١**﴾.

**سەرچاوەکان**


- مدخل الي الحضارة الاسلامية: نوسینی: پ.د.المتمرس.عمادالدين خليل، چاپی یەکەم، الدار العربية للعلوم / لبنان ١٤٢٦ ک ـ ٢٠٠٥ ز
- كتاب الأصنام: هیشام موحەمەد سائیبی کەلەبی، لێکۆڵینەوە: ئەحمەد زەکی، دار الكتب المصرية / القاهرة، چاپی دووەم، ١٩٢٤ ز.
- ماذا خسر العالم بانحطاط المسلمين: أبو الحسن الندوي، چاپی پێنجەم، مكتبة دار العروبة / القاهرة، ١٩٦٤ ز.





# دیموکراسیەت هەم دەردە و هەم دەرمان

توفیق کەریم

لەو رۆژەوە مرۆڤ سەرزەوی ئاوەدانکردوەتەوە، بەدیهێنەرەکەی ئاوەزی ئەوەشی پێبەخشیوە کە چۆن کاروباری خۆی و دەوروبەرەکەی بەڕێوەببات.

لە هەر قۆناغێکی مێژوویشدا بەپێی گۆڕانکاری و پەرەسەندنە ژیارییەکان شێوازی بەڕێوەبردن و دەسەڵاتدارییەکە گۆڕاوە. هەر بە نموونە ئەو ئاوەز و شێوازەی کە (زولقەرنەین) ئەسکەندەری مەقدۆنی وڵاتی پێ بەڕێوەبردوە، بەپێی ئاماژە قورئانییەکان، تەواو جیاوازە لەوەی فەرمانڕەوا ئافرەتەکە (بەڵقیس)ی (سەبەء) دەسەڵاتداریتی کردوە. لە دوای ئەوانیشەوە پاشا و فیرعەون و سەرکردەی جۆراو جۆر و سیستەمی جیاواز هاتونەتە سەر دەسەڵات بۆ بەڕێوەبردنی وڵاتان.

تا لەم چەند سەدەیەی دواییدا چەندین تیۆر و بیرۆکەی جیاواز و هەشیانە دژبەیەک پەیدا بوون، بەسوودوەرگرتن لەوانەی رابردو و پشتبەستن بە پەرەسەندن و گۆڕانکارییەکان. کە لەئێستادا درێژترین و بەرفراوانترینیان سیستەمی دیموکراسییە، ئەمیش بیرۆکەیەکی کۆنی نوێیە، بەپێی هەلومەرج و گۆڕانکارییەکان گەشەی سەندوە. ئەم سیستەمە ئەمرۆ بەربڵاوترین سیستەمە کە باسی لێوە بکرێت و لافی جێبەجێکردنی لێ بدرێت. هەرچەندە زێدی ئەم نەوزادە رۆژئاوایە و هەرلەوێش بوەتە کۆرپەلە و قۆناغەکانی دیکەی تەمەنی بڕیوە، بەڵام لە وڵاتێکی ئەوێشەوە بۆ وڵاتێکی دیکە لە جێبەجێکردندا جیاوازی هەیە.

ئەم سیستەمە دوا بەرهەم و دەرئەنجامی ئاوەزی مرۆڤەکانە کە تا ئێستا پێی گەیشتون و لە قەوارەیەکی جوگرافیای دیاریکراوی یاساییدا پیادەیان کردبێت و وڵاتیان پێ بەڕێوەبردبێت، بێگومان ئەمیش وەک زۆر بیردۆز و بیرۆکەی پێش خۆی خاڵی نییە لە خەوش و کەلێن، بەڵام لە هەموو ئەوانەی کە مرۆڤ بە ئاوەزی خۆی پێی گەیشتبو باشتر و پێشکەوتووترە.

ئایدۆلۆجیا و ئاستی هۆشیاری و شێوازی بیرکردنەوەی مرۆڤەکان رۆڵی گەورەیان هەیە لە شێوەی جێبەجێ کردنیدا، هەرگیز شێوەیەکی جێگیری نەبوە. بۆیە ئەو وڵاتانەی ئایدۆلۆژیا تیایاندا کاڵە، ئابووریيان بەرزە، کۆمەڵگەکەیان هۆشیارە، نوخبەی سیاسی لە ئاستی بەرپرسیارێتی دەسەڵات بەڕێوەبردندان، دەبینین دیموکراسیەت لەو وڵاتانەدا زیاتر بەرجەستە دەبێت و بوەتە چارەسەرێکی حەوت دەرمانەی گرفت و کێشەکان. هەر وڵاتێکیش پێوەر تەنها ئایدۆلۆجیایە و کۆمەڵگە ناهۆشیارە و نوخبە لە ئاستی بەرپرسیارێتیدا نین، ئەگەر لافی دیموکراسیەتیش لێبدەن، ئەو دیموکراسیەتە دەبینین چەقۆی دەسەڵاتدارانی هێندەی تر تیژکردووە و برینی کۆمەڵگەی قوڵتر کردوەتەوە، ئەو بابەتە ئاراستەو دید جیاوازانەشی لەمیانی تەوەری ئەم ژمارەیەدا خراووەتە ڕوو، خوێندنەوەی جیاوازە لەدیدگای جوداوە بۆ لایەنە ئەرێنی و نەرێنییەکانی دیموکراسی و پەنجە دانانە لەسەر ئەو برینانەی ئەم دەرمانەیان کردۆتە دەرد لەهەندێ شوێن و لەهەندێکی دیکەش بووتە دەرمان، بۆیە دەکرێت بڵێین دیموکراسیەت هەم دەردە و هەم دەرمان.